# مێژوو

گۆڤارێکی مێژوویی وەرزییە،
کۆمەڵەی رۆشنبیریی مێژوویی
کوردستان دەریدەکات





ژمارە 21
ساڵی شەشەم
زستانی 2012



# مێژوو

گۆڤارێکی مێژوویی وەرزییە، کۆمەڵەی ڕۆشنبیریی مێژوویی کوردستان دەریدەکات




ژمارە (٢١) سالی شەشەم زستانی ٢٠١٢






هەموو ئەو بابەتانەی لە گۆڤاری مێژوو بڵاودەبنەوە نوسەرەکانیان لێیان بەرپرسیارن تەنیا سەروتار نەبێت کە گۆڤاری مێژوو لێی بەرپرسیارە

♠ گۆڤار : مــێژوو

♠ ژمارە : (٢١)

♠ تیراژ : (٥٠٠) دانە

♠ چاپخانە : ڕۆژهەڵات

کوردستان / هەولێر - کۆڵانی بەرامبەر بەڕێوەبەرایەتی گشتی پەروەردەی هەولێر

g.mezhu@yahoo.com

g.mezhu@hotmail.com

# پێرست

## ◀ کەشکۆڵی گۆڤار

# دوای بیست و پێنج ساڵ

سەرنووسەر

ساڵی ۲۰۱۱ بیست و پێنج ساڵ بەسەر دامەزراندنی بەشی مێژووی کۆلێژی ئەدەبیاتی زانکۆی سەلاحەددین تێپەڕی. ئەو بەشەی کۆنترین بەشە لە نێو بەشەکانی مێژوو لە زانکۆکانی کوردستان دا. لە هەموو بەشەکانی مێژوو لە هەموو زانکۆکانی جیهاندا لەم بەشەدا لقی مێژووی کورد هەیە کە لە پۆلی سێیەمەوە دابەش دەبێتە سەر دوو لقی مێژووی گشتی و مێژووی کورد. زیاترین ژمارەی پسپۆڕی مێژوو بە مێژووی ئیسلامی و مێژووی نوێ و هاوچەرخ و تەنانەت مێژووی کۆنیش لە بەشێکی مێژوودا لە کوردستان دیسان لە کۆلێژی ئەدەبیاتی زانکۆی سەلاحەددینە هەروەها ئەم بەشە قوتابی ماستەر و دکتۆرای بۆ هەموو بەشەکانی تری مێژوو لە زانکۆکانی تری کوردستان پێگەیاندووە.

تاکو ئێستا بەشی مێژووی ئێواران لە سەرەتادا لقێك بوو لە بەیانیان ساڵانە قوتابی دەردەچوێنێت ژمارەیەکی باش پرۆفیسۆر و پرۆفیسۆری یاریدەدەر و پلەی زانستی مامۆستا و مامۆستای یاریدەدەر تیایدا خزمەت دەکەن.

پرۆفیسۆر دکتۆر ئەرسن موسی رشید سەرۆکی بەشە کۆنترین مامۆستای ئەم بەشەیەو جێگای ڕێزو خۆشەویستی هەموانە چونکە زیاترین خزمەتی پێشکەش بەم بەشە کردووە و ڕۆڵی سەرەکی هەبووە لە کردنەوەی خوێندنی باڵا ماستەر و دکتۆرا لەم بەشە و کردنەوەی لقی ئێواران کە دواتر بوو بە بەشی ئێواران.

هەروەها لێرەدا نابێ ڕۆڵی هەریەکە لە د.سلام حسن خۆشناو دکتۆر موسی محمد خدر لە یاد بکەین کە یەکەمیان عەمیدی کۆلێژ بووەو دووەمیان تاکو

ئێستا یاریدەدەری عەمیدی کۆلیژی ئێوارانە کە ئەوەندەی بۆیان کرابێت پێویستیەکانی بەشەکەیان دابین کردووە.

بەشی مێژووی زانکۆی سەلاحەددین کتێبخانەیەکی دەولەمەندی هەیە کە ژمارەیەکی باش سەرچاوەی مێژوویی دەربارەی مێژووی گشتی و مێژووی کورد تیادایە کە پسپۆرانی بواری مێژوو دەتوانن سوودی لێ وەربگرن.

لەگەڵ پتربوونی ژمارەی قوتابیان ساڵ لە دوای ساڵ گرفتی کەمی هۆڵی خوێندن و دروست دەبێت، هەروەها مامۆستایانی بەشەکەش لەگەڵ زۆربوونی ژمارەیان گرفتیان هەیە لە شوێنی دانیشتنیان بۆیە هیواداریین لە چوارچێوەی ئەنجامدانی پرۆسەی کەمپی زانکۆی سەلاحەددین لە ئایندەدا ئەم کەموکوڕیانەش چارەسەر بکرێن.

لێرەدا بە پێویستی دەزانین دەست خۆشی لە یەکە یەکەی مامۆستایانی ئەو بەشە بکەین و پیرۆزبایی لە ئەوان و دەرچووانی بەشەکەو قوتابیانی ئێستای ئەو بەشە بکەین.

لە هەمان کاتیش داواکارین هاوکاری نێوان بەشەکانی مێژوو لە زانکۆکانی کوردستان بەردەوام بێت و برەوبسەنێت.

# دزەکردنی دەسەڵاتی زلهێزەکان بۆ کوردستانی عوسمانی لەنیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەم

شاکر رضا

## پێشەکی

زۆر گرنگە کاتێك مرۆڤ کارێك دەکات بزانێ بۆ ئەم کارەی کرد؟ وە لەوەش گرنگتر ئەوەیە کە بەرهەمی کارەکەی چیەو بە چ گەیشت؟ چونکە مرۆڤ هەر لەسەرەتای دروست بوونیەوە تا دەگاتە ڕۆژگارەکانی ئەمڕۆ و لە هەموو قۆناغە جۆراوجۆرەکانی ژیانی مرۆڤایەتی بەبەردەوامی لە هەوڵدان و تێکۆشاندا بووە، بۆ گەیشتن بە ئامانجێکی دیاری کراو. بێگومان هەوڵدان و تێکۆشانیش ماندوو بوونی گەرەکە، هەموو ماندوبوونێکیش بەرهەمێکی دیاری کراوی دەبێت بەگوێرەی عەقڵ و توانای کارکەر.

ڕووداوە مێژوویەکان ولێکۆڵینەوە تیایاندا، بەردەوام بوونەتە سەرچاوەی پەند وەرگرتن و دووبارە نەکردنەوەی هەڵەکانی ڕابردوو و گەیاندنی ڕاست و دروستی گشت ڕووداوە مرۆیی و سروشتیەکان بەنەوەکانی دواتر، تا سودی لێوەربگرن. بەلآم بە داخەوە کۆمەڵگەی مرۆڤی وایە، زۆرجار پەند وەرناگرێ لەرابردوو. ئەگینا ئەم هەموو ڕووداوە هاوشێوەیە لەسەردەمە جیاجیاکاندا دووبارە نەدەبۆوە.

ئەو سەردەمەی کە ئەم توێژینەوەیە دەیگرێتەوە، قۆناغێکی یەکجار گرنگ و هەستیارە لەمێژووی کوردستان؛ چونکە دەکەوێتە سەردەمێك کە قۆناغێکی نوێی مێژوویی دەست پێدەکات، ئەویش قۆناغی دوای رووخانی میرنشینە کوردیەکانە. هەروەها دەوڵەتی عوسمانی لەسەردەمی بێهێزیدایە. ئیتر ئەو سەردەمە دەبێتە سەردەمی دزە کردنی دەسەلاتی زلهێزەکانی وەکو روسیا و فەرەنسا و بەریتانیا و ئەڵمانیا، وە دواتریش ئەمریکا بۆ تەواوی دەوڵەتی عوسمانی و کوردستانیش وەك بەشێکی گرنگی پڕ داهاتی ئابووری و شوێنی ستراتیژی ئەم ئیمپراتۆریەتە. لەرێگای جۆراو جۆری سیاسی، ئابووری، ئایینی، سەربازی، ئەمەش بۆ پاراستنی بەرژەوەندیەکانیان. چونکە ئیمپراتۆریەتی عوسمانی، بۆ ئەو زلهێزانە بووبووە پارویەکی چەور و رێگاکانی بەردەمیان بۆ گەیشتن بەم پاروە کراوە بوو. بەتایبەتی ئەو کاتە رۆژئاوا پێشکەوتنێکی زۆر خێرا بەخۆیەوە دەبینێ لەبواری پیشەسازی و پێویستی بە بازاڕ دەبێت. بۆیە زلهێزەکانیش لەناو خۆیان دەکەونە ململانێ، بەمەبەستی بەدەست هێنانی هەرچی زیاتری نفوس و دەسەلات و بەرژەوەندی لەناوچەکە. لەم ناوەشدا ئەم زلهێزانە بیروباوەڕو پرەنسیپەکانی ئازادی، دادپەروەری، یەکسانی و سەربەخۆیی لەگەڵ خۆیان هەڵدەگرن و کاریگەریان دەبێت لەسەر گەشەسەندنی هەستی نەتەوایەتی کورد و نەتەوەکانی تر. مەودای بیرو ئەندێشەش قوڵ دەبێتەوە و خەڵك شارەزا دەبن لە هەواڵەکانی دەرەوە. ئیتر ئەم بارودۆخە ناوەخۆییە قبوڵ ناکات.

هەر لەبەر ئەوەیە، زۆر لەمێژوونووسان ئەم سەردەمە دادەنێن بەسەردەمی گەشەکردنی بیری نەتەوەیی لای گەلی کورد. بەتایبەتی لەلایەن شێخ عوبەیدوڵلای نەهری و شۆڕشەکەی بەیەکەم بزووتنەوەی نەتەوەیی کورد

دادەنرێت. جگە لەمانە، چەندین شۆڕش و راپەڕینی تر لەم قۆناغەدا روویانداوە، کە نیشانەی خۆبەدەستەوەنەدانی کوردە. هەروەها هەڵوێستی نێودەوڵەتی بەرامبەر بە شۆڕش و راپەڕین و روداوە ناوەخۆییەکانی کوردستان، لەماوەی ئەو پەنجا ساڵە دەخەینە روو. هەروەها ئەو رێککەوتننامانەی کە لەم ماوەیەدا بەستراون، کە بەدڵنیاییەوە کورد و کوردستان تیایاندا قوربانی یەکەم بووە. لەلایەکی تردا پێکهێنانی سوارەی حەمیدیە، لەلایەن سوڵتان عەبدولحەمیدی عوسمانی لەکوردەکان و بەشداریان لە رووداوەکان و هەڵوێستی زلهێزەکان بەرامبەریان.

بەکورتی، هەوڵمانداوە کەباسەکەمان دابەش بکەین بۆ پێنج تەوەرەی سەرەکی. لەتەوەرەی یەکەمدا، ئەو هۆکارانە باس دەکەین، کە بوونەتە هۆکاری ئەوەی زلهێزەکان چاو ببڕنە کوردستان. دواتر لەتەوەرەی دووەمدا، باس لەو رێگایانە دەکەین کە زلهێزەکان کردیانە بیانوو، تا بتوانن لەوێوە بێنە خاکی کوردان. لەتەوەرەی سێیەمدا، هەوڵمانداوە کە هەڵوێستی زلهێزەکان بخەینە روو، لەبارەی شۆڕش و راپەڕینە کوردیەکان و رووداوەکانی ناوەخۆی کوردستان. وە لەتەوەرەی چوارەمدا، باسمان لەو رێککەوتننامە و پەیمانە نێودەوڵەتیانە کردووە، کە پەیوەندیدارن بە کوردەوە لە نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەم و کاریگەری و دەرەنجامەکانی لەسەر کورد. لەتەوەرەی پێنجەم و کۆتاییدا، باسمان لە کاریگەری و رۆڵی زلهێزەکان کردووە، لەسەر پێگەیاندنی هەستی نەتەوایەتی لای کورد و بەرزکردنەوەی ئاستی رۆشنبیری و ووشیاری کورد و پێشخستنی ئاستی زانستی لەکوردستان.

بۆ ئەم مەبەستەش سوودمان لە چەند سەرچاوەیەك وەرگرتووە، بە زمانەکانی کوردی و عەرەبی و ئینگلیزی و تورکی. لەگەڵ چەند نامەیەکی زانکۆیی

بڵاونەکراوە و چەندین وتارو توێژینەوە لە گۆڤار و ڕۆژنامەکان، تاوەکو بیانکەینە هەوێنی لێکۆڵینەوەکەمان، تا بگەین بە ئامانجێکی دیاریکراو. لەوانەش چەندین نامەی زانکۆیی بڵاو نەکراوەی وەك (دلشاد عمر عبدالعزیز)، (نەوتی کەرکوك و ململانێی زلهێزەکان). هەورووەها چەندین کتێبی وەك کتێبەکەی (د. کەمال مەزهەر)، بەناوی (کردستان فی سنوات الحرب العالمیە الاولی). وە (کورد و کوردستان)ی (کەمال بورکای). هەروەها کتێبەکەی (حەسەن ئەرفەع) بەناوی (کوردەکان). کتێبەکەی (ارشاك سافراستیان)، بەناوی (الکرد و الکردستان). وە (محمد امین زەکی بەگ)، (خولاصەیەکی تاریخی کورد و کوردستان لەزۆر قەدیمەوە تا دەوری ئەمرۆ). وە سوودێکی زۆرمان بینی لەکێبەکەی (د. عەبدوڵڵا عەلیاوەیی) لەژێر ناوی (کوردستان لەسەردەمی دەوڵەتی عوسمانیدا). و کتێبەکەی (د. کامەران مەنتك) بەناوی (کوردستان لە ململانێی نێودەوڵەتی و ناوچەییدا). هەروەها (کامەران محمد حاجی)، کتێبەکەی بەناوی (کوردستان لەبازنەی کێشەی ڕۆژهەڵاتیدا ١٨٠٠ – ١٩٠٠). جگە لەمانە کتێبەکەی (م.س لازاریف)، بەناوی (مێژووی کوردستان). هەروەها (خەبات لەڕێی کوردستاندا)ی (ن. أ خالفین) خزمەتێکی زۆریان کردین. وە هەروەها (باسیل نیکیتین)، لەکتێبی (الاکراد اصلهم، تاریخهم، مواطنهم). وە (ستراتیژیەتی نێودەوڵەتی کوردستان)ی (حسین مەدەنی). و کتێبە گرنگەکەی (پ.ی. ئەڤێریانۆف)، بەناوی (کورد لە جەنگی ڕوسیا لەگەڵ ئێران و عوسمانیدا) زۆر بەبایەخ بوو، چونکە ڕاستەوخۆ پەیوەندی بە ڕووداوەکانەوە هەبووە. (کتێبی بزاڤی ڕزگاریخوازی نیشتمانی) (د.سەعدی عوسمان) بۆمان گرنگ بوو. چونکە چەندین بەڵگەنامەی گرنگی زلهێزەکانی خستۆتە ڕوو. و (د. اسماعیل محمد حصاف)، (کوردستان و المسالە

الكوردیە). و چەندین سەرچاوەی تر. و چەندین وتار و توێژینەوە لە ڕۆژنامە و گۆڤارەکاندا، وەك (گۆڤاری مێژوو) و (ڕۆژنامەی خەبات).

لەکۆتاییدا، ئەوەی ماوە بیڵێین ئەوەیە کە بەدڵنیاییەوە دەڵێین، ئەم باسە بێ کەموکوڕی نیە. چونکە تەنها و تەنها خوای گەورە کماله. بەڵام ئێمەش بەپێی پێویست و توانای خۆمان هەوڵمان داوە کە بتوانین مەبەستەکەمان بپێکین و تا بکرێت هەوڵی خۆمان داوە بۆ ئەوەی بتوانین زانیاریەکی ئەوتۆ بدەین بە دەستەوە تا کەسانی بەرامبەر سوودی لێوەر بگرن، وو بچێتە قالبی لێکۆڵینەوەیەکی زانستی بە بایەخ.

تەوەری یەکەم :–

هۆکارەکانی چاوتێبڕینی وولاَتانی زلهێز لەکوردستان

یەکەم / ستراتیژیەتی کوردستان لەروی گرنگی هەڵکەوت و شوێنی جوگرافی

شوێن و هەڵکەوتەی جوگرافی بایەخ و گرنگی زۆری بەخشی بوو بە کوردستان. چونکە خاڵی بەیەکگەیشتنی هەرسێ کیشوەری ئاسیا و ئەفریقیا و ئەوروپا بوو، وەئەڵقەی بەیەکگەیشتنی ڕۆژهەلاَت و ڕۆژئاوا بوو. وەك برونسنیش دەڵێ: ((کوردستان وولاَتی کوردان ناوچەیەکی ستراتیژی ڕۆژهەڵاتی ناڤینەو گرنگترین بەشەکانی ئەم ناوچەیە پێکدەهێنێت))[1]. جوگرافیای کوردستان و گرنگیەکەی وەکو بەشێك لەناوچەی ڕۆژهەلاَتی نزیك ڕۆلی هەبوو لەوەی کەناوچەکە بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ بکەوێتە ژێر کاریگەری دەرهاوێشتەکانی ململانێ سیاسی و سەربازییەکانی زلهێزە ئەوروپیەکانەوە[2]. یاریدەدەری قونسولی ڕوسی لەشاری وان، ئاماژە بەگرنگی ناوچە کوردیەکان دەکات و دەڵێت : ((کوردەکان لەتواناياندا هەیە کەکاریگەری مەترسیداریان

هەبێت لەسەر ڕووداوەکان لەکاتی ڕوودانی جەنگ لەنێوان روسیا و تورکیا یان لەنێوان روسیا و بەریتانیا لەبەرئەوەی هەموو ڕێڕەوە چیاییە گرنگەکانی ویلایەتەکانی وان و دیاربەکر لەدەست ئەوانە))[٣].

وولاّتە زلهێزەکان بایەخی زۆریان دەدا بەپرس وکێشەی کورد. چونکە کوردستان شوێن و جێگەیەکی ستراتیژی و ناوەندی هەبوو لەنێوان ئەنادۆل و ئەودیوی قەفقاس. هەروەها لەنێوان ئێران و ڕۆژهەلاّتی عەرەبی[٤]. بۆیە دەکرێ بڵێین کە دەوڵەمەندی کوردستان و بوونی ئەو هەموو سامانە تیایدا لەپاڵ شوێنە ستراتیژی وجیۆپۆلەتیکیەکەی، وای کردبوو هەریەك لەلایەنە رکابەرەکان هەوڵبدات ئەوانەی تر لەکوردستان دووربخاتەوە[٥]. هەر لەبەر گرنگی وستراتیژی شوێنگەی کوردستان کەکەوتبووە سەر سنوری تورکیا، ئێران و روسیا، کاربەدەستانی ئینگلیزو روسیا لەسەدەی نۆزدەهەم و لە کۆتایی سەدەش ئــەلمانیا هەوڵیان دەدا بگەنە ناوچەکە و سەدەها پشکنەر و دیبلوماسی هاتن بۆ کوردستان، وە بە بەرتیل سەرۆك هۆزەکانیان بۆلای خۆیان کێش دەکرد[٦]. دواتریش ئەمریکی و فەرەنسیەکان گرنگی ناوچەکەیان بۆدەرکەوت، ئەوانیش سیخورەکانیان رەوانی ناوچەکە کرد و کونسولخانەیان کردەوە. ئەمانە ئاماژەن بۆ ستراتیژیەت و گرنگی شوێنی جوگرافی کوردستان، بەبەڵگەی ئەوەی کە مستەفا کەمال (ئەتاتورك) دەڵێت : ((ئەگەر هاتوو هێزەکان یەکسان بوون لەجەنگدا لەناوچەی ڕۆژهەلاّتی ناوەڕاست ئەوا سەرکەوتوو ئەو کەسەیە کەکۆنترۆڵی کوردستانی بەدەستەوەیە))[٧].

گرنگی کوردستان بۆ زلهێزەکان جیاوازبوو لەناوچەیەکەوە بۆ ناوچەیەکی تر، وە لەکاتێکەوە بۆ کاتێکی تر. بۆنموونە شاری وان لەدوای ساڵانی (١٨٨٦) ناوچەیەکی ستراتیژی بوو بۆ ئینگلتەرا و دەوڵەتی عوسمانی، وە گرنگیەکی

تەواویان پێدەدا بۆ ئەوەی کە بتوانن لێوەی بگەنە ئەودیوی قەفقاسی روسیا لەکاتی هەڵگیرسانی شەڕدا لەهێڵی قارس و یەریڤان[٨].

بەریتانیا، ئەو ئیمپراتۆریەتەی (رۆژ هەرگیز لێی ئاوا نەدەبوو) لەسەرانسەری سەدەی نۆزدەم، بۆ قایمکردنی جێ پێ و پەرەپێدانی دەسەڵاتداریەتی و بەهێزکردنی نفوزی خۆی زۆر چووە پێش. لەم روانگەیەوەش لەنیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەم ئینگلیزەکان گەلێ ئیمتیازی گرنگیان لەئیمپراتۆریەتی عوسمانی دەستەبەرکرد، و میسۆپۆتامیا (نێوان دوو رووبار) یان بۆخۆیان پاوان کرد. ئەمەش زیاتر لەبەرئەوەی کەناوچەکانی نێوان دوو رووبار هێڵی پەیوەندی وبەرگری ئیمپراتۆریەتی بەریتانیایە لەلای رۆژهەڵات، کەبایەخێکی ستراتیژی تایبەتی پەیداکردبوو[٩]. بەریتانیەکان هەر زوو گرنگی ئەم ناوچەیەیان بۆ روون بۆتەوە، بۆیە سەرۆك وەزیرانی بەریتانیا لە وتەیەکیدا لەسالزبوری لەساڵی ١٨٧٨ز هۆشداری دەدات لەسەر دەسەڵاتی روسی لەناوچەکەو باس لەپێویستی رووبەروو بوونەوەی روسیا دەکات و دەڵێت : ((هەر وەزارەتێك پێکبێت لە حکومەتی بەریتانیا ئەوا بەریتانیا رێگا نادات بە هەبوونی روسەکان تا سوود وەربگرن لەزێی دیجلە و فورات))[١٠]. جگە لەمە بۆ بەریتانیا ئیمپراتۆریەتی عوسمانی و بەتایبەتیش کوردستانیان لەبەر ستراتیژیەتی شوێنەکەی کارتی سەرکەوتن بوو بەرامبەر بە فەرەنسیەکان[١١].

گومانی تێدا نیە کەکوردستان شوێنێکی گرنگ وستراتیژی لەروی جوگرافیەوە هەبووە. لەهەمان کاتدا گرنگیەکی تری هەبووە بۆ بەریتانیا، چونکە رێگای تێپەربوون بووە بۆ هندستان، کەگەورەترین داگیرگەی ئینگلیزی بووە. بۆیە هەموو کات گرنگی بەناوچەکە داوەو بەرژەوەندیەکانی خۆی لەبەرچاو گرتووە[١٢]. بۆیە کەسایەتیە سیاسیەکانی خۆی دەناردە ناوچەکە، تا

لەکۆکردنەوەی زانیاری لەسەر کوردستان و باری ژیان و گوزەران و بوارەکانی تری ژیانی ناوچەکە هاوکاری سیاسەتی بەریتانیا بکەن. لەو نێردراوانەش (ریچ، مارك سایکس[١٣]، جونز... هتد)[١٤]. هەروەها مەبەستێکی تری بەریتانیا ئەوەبوو کەجێ پێی خۆی لەکوردستان قایم بکات، تا ناوچەکانی رۆژهەڵاتی عوسمانی ورۆژئاوای ئێران لەژێر چاودێری خۆیدا بهێڵێتەوە. بەمەش هەڕەشە لەناوچە ئاسیاییەکانی روسیا دەکات[١٥].

بەم شێوەیە ستراتیژیەتی ناوچەکانی کوردستان بۆ سیاسەتی بەریتانیا بەدیاردەکەوێ لەرۆژهەڵاتی ناوەڕاست. ئەو راستیەش رۆژ دوای رۆژ زیاتر بەدیار دەکەوت، تا کار گەیشتە ئەو رادەیەی کە لۆرد کیرزنی سیاسەتمەداری ئینگلیز لەنەوەدەکانی سەدەی نۆزدەم بەروونی باس لەپێویستی چەسپاندنی دەسەڵاتی بەریتانی و خستنە ژێر نفوزی ئەم ناوچەیە بکات بۆ بەریتانیا[١٦].

کوردستان بۆ روسیاش ناوچەیەکی ستراتیژی هەبوو بۆ گەیشتن بەمەرامەکانی. چونکە لەقۆناغی زیادبوونی نفوز و دەسەڵاتی زلهێزەکان، بەسەر دەوڵەتی عوسمانی هەر یەکێك لەو زلهێزانە هەوڵی ئەوەی دەدا کە بەهەر رێگایەك بێت دەسەڵاتی زیاتری خۆی بسەپێنێت بەسەر ناوچە گرنگ و ستراتیژیەکانی کوردستان. بەتایبەتی روسیا کەلەسەرەتای نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەم و لەرێگای جەنگی قەرم، دەسەڵاتەکەی گەیشتە سنورەکانی کوردستان و چەند ناوچەیەکیشی خستە ژێر دەسەڵاتی خۆی و هەوڵی زیاتریشی دەدا. بۆیە لە١٨٥٥/٨/١ فەرمان دەکرێت بەپالکو ڤنیك فریشتماتسکی سەرکردەی سەربازی روسیا کە بەهەزار سوارەوە لەزەیدەکینەوە بچێتە دەشتی فورات بۆشاری مەلازگرد و لەوێش بۆ بیرگیر و گۆلی وان و زانیاری لەسەر بارودۆخی ناوچەکان و دانیشتوانەکەی کۆبکەنەوە. دواتر لەمەلازگردەوە

بگەڕێنەوە بۆ پانتۆس و لەوێشەوە بۆ داوێنی چیاکانی ئالاداخ و بەرێگای خاموز یا دیادینەوە بگەنە سەر رێگای کاروانی ئەرزەرۆم، وەمامەڵەی دۆستانەو سیاسەتی نەرم و هێمنی بەرامبەر بەکوردە دانیشتوانەکانی ئەم ناوچانە پەیرەو بکرێت[١٧]. هەر لەچوارچێوەی گرنگی پێدانی روسیا بەکوردستان لەبەر ستراتیژیەتی ناوچەکە. ئەوەتا ئەڤیریانۆڤ ئاماژە بەم گرنگی پێدانە دەکات و دەڵێت: ((بەگشتی سەقامگیرکردنی ئێمە یا دەورگێڕانی ئێمە لە کوردستانی بچوك و هەم لەکوردستانی گەورە یەکجار زۆر پێویستە ئەویش بۆ مسۆگەرکردنی رێگای(فارس) یاخود (ئێرەڤان) بۆ ئەرزەڕۆم و سیواس و ئەستەنبۆل کەتەنیا بەپەرەپێدانی ئۆپەراسیۆنە بەربلاوەکان و لەقۆناغی دووەم بەرێگای ئێرەڤان بەرەو وان و ئێرەڤان بەرەو موش وخاپورت (یا دیاربەکر) جێبەجێ دەبێت یا سەردەگرێت))[١٨].

مەبەستێکی تری کلاسیکی روسیا، بریتی بوو لەگەیشتن بەئاوە گەرمەکان. کەیەکێك لەو رێگایانەی دەیتوانی بگاتە مەبەستەکەی کوردستان بوو[١٩]. کەبەدوو رێگای جوگرافی دەیتوانی دەستی بگاتە ئاوە گەرمەکان. رێگای یەکەم بەباکووری کوردستاندا تێدەپەری و بگاتە ئەنادۆل لەوێش بۆ دەریای سپی ناوەراست، بەهەموو گەروەکان و ئەستەنبۆلیشەوە. بەڵام رێگای دووەم گەیشتنە بەکەنداوی عەرەبی، بەرێگای باشوری کوردستان و هەردوو شاری بەغدا و بەسرا. کەواتە ئەگەر روسیا بیەوێت بگاتە هەر یەکێك لەدەریای سپی ناوەڕاست و کەنداوی عەرەبی پێویستە بەخاکی کوردستاندا تێپەرێت[٢٠].

هۆکارەکانی گواستنەوەش لەرۆژهەڵاتی ناوەڕاست، بەئەنجام نەدەگەیشت ئەگەر بەسەر خاکی کوردستاندا تێپەر نەبووایە. چونکە هەر لەشەستەکانی سەدەی نۆزدەم، بایەخ بەهۆکارەکانی گواستنەوە و پەیوەندی زیاتر بوو.

لەحوزەیرانی ١٨٦١ ئەو هێڵە تەلەگرافەی بەغدا و ئەستانەی بەیەکدەگەیاند ئەنجامدرا و لەساڵی ١٨٦٤ هێڵێکی تر لەبەغداوە بەرەو خانەقین کرایەوە. ئامانج لەو هێڵانەش بەیەکەوە گرێدانی دەڤەرەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست بوو. هێڵی یەکەم ئەستانە – بەغدا دەبوایە بەکوردستاندا تێپەڕێت واتا ئامەد (دیاربەکر) و ئینجا موسڵ و دواتر بەغدا. هێڵی دووەم بەغدا – خانەقین لەبەغداوە بەرەو خانەقین پاشان کرماشان و هەمەدان و دواتر بەرەو تاران[٢١]. هێڵە ئاسنینەکان کە بەکوردستاندا تێدەپەرین، یەکێك لەمەبەستەکانی دروستکردنیان بریتی بوو لەدەستگرتن بەسەر ستراتیژیەتی کوردستان. بەتایبەتی هێڵی ئاسنی (بەرلین – بەغدا – بەسرا)، کە دەکرێ ئامانجەکانی لەم خاڵانەی خوارەوە بخەینەروو :–

١– کەرەستەی خاوی کوردستان لەو ڕێگایەوە بنێردرێتە دەرەوە.

٢– لەو ڕێگایەوە هێز بۆ ناوەوەی کوردستان بهێنن. لەبەر ئەوەی بنکەیەك بووە بۆ دەست بەسەرداگرتنی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست.

٣– هەروەها دەتوانرا لەو ڕێگایەوە دەسەڵاتی ناوەندی بەهێزبکرێت، ئەمەش دەبێتە هۆی لێدان و بێهێزکردنی بزاڤی رزگاریخوازی کورد[٢٢].

گرنگی خاکی کوردستان و گونجاوی ناوچەکە وایکردووە کەهۆزەکانی بێگانە لەخاکی کوردستان نیشتەجێ بکرێت. بۆ نموونە مەدحەت پاشا ١٨٦٩–١٨٧٢ والی بەغدا، لەچاکسازیەکانی خۆی لەعێراق هەڵسا بەنیشتەجێکردنی هۆزە عەرەبە کۆچەریەکان لەسنوری کوردستان. عەشیرەتەکانی رەبیعە، بەنوئەوس، جبور بۆ دەشتەکانی مەندەلی، بەلەد روز، قزلرەبات. عەشیرەتەکانی کرێوی و لهێب بۆدەشتەکانی قەرەتەپە. خێڵەکانی بەیاتی مەغۆل و عەشیرەتە عەرەبیەکانی تر لەناوچەکانی کفری و دووز نیشتەجێ کران. عەشیرەتی عوبیدیش لەناوچەکانی حەویجە. وە خێڵەکانی (تەی وجبور) لەزەویەکانی قەراج

و لەباشوری مەخمور نیشتەجێکران بێگومان ئەمەش لەبەر ستراتیژیەتی ناوچە

کوردیەکانە کەویستویەتیان دەستی بەسەر دابگرن. ئەگینا نیشتەجێکردنی عەشیرەتە عەرەبیەکان لەناوچە عەرەبیەکان کارێکی زۆر ئاسانتر و بێ گرفت ترە[٢٣]. هەروەها لەئەنجامی (جەنگی قەرم)یش چەرکەس و هۆزە موسوڵمانەکانی قەوقاز هاتن بۆ ناوچە کوردیەکان، لەبەر گرنگی ناوچەکەو بەسودی بۆیان. لەولاشەوە لەلایەن دەوڵەتی عوسمانیەوە پشتگیری لەکۆچەرەکان کرا و نیشتەجێکران لەخاکە بەپیتەکانی کوردستان[٢٤].

دووەم/ هۆکاری سیاسی و کێشەی رۆژهەڵاتی

لەسەردەمی سوڵتان عەبدولمەجیدی یەکەم ١٨٣٩ – ١٨٦١ کێشەی رۆژهەلاتی، کەململانێی سیاسی نێوان زلهێزەکان بوو لەسەر خاکی عوسمانی، پەرەیسەند. بەتایبەتی لەماوەی جەنگی (قەرم)دا ١٨٥٣ –١٨٥٦. چونکە هەر یەکێك لەلاوازی دەوڵەتی عوسمانی هەوڵی پاراستنی بەرژەوەندیەکانی خۆی دەدا، لەهەمان کاتیشدا دژی بەرژەوەندیەکانی وولاتە زلهێزەکانی تر کاری دەکرد. بۆنموونە کاتێك جەنگی قەرم روویدا لەنێوان روسیا و عوسمانی، زلهێزەکان لەترسی فراوان بوونی دەسەلات ونفوزی روسیا کاریان کردو بەریتانیاو فەرەنساو نەمسا شەریان راگەیاند شان بەشانی عوسمانیەکان لەدژی روسەکان. تالەکۆتاییدا روسەکان شکستیان هێنا[٢٥]. کێشەو ناکۆکی لەنێوان ولاتانی ئەوروپی لەسەر ناوچەکانی قەڵەمرەوی دەوڵەتی عوسمانی، زیاتر گەشەی دەکرد بەتایبەتی لەنێوان بەریتانیاو فەرەنساو روسیا، چونکە هەریەك لەم ولاتانە رێك نەدەکەوتن و تەبا نەبوون لەسەر پرۆژەی دابەشکردنی موڵکەکانی دەوڵەتی عوسمانی[٢٦]. لەساڵی (١٨٥٣ز)دا نیکۆلای قەیسەری روسیا، باوەری وابوو

کەدەکرێ کۆتایی هێنانی کێشەی ڕۆژهەڵاتی پێشنیار بکات بەشێوەیەکی ڕیشەیی، ئەویش بەدابەشکردنی ویلایەتەکانی عوسمانی. ئەوەبوو لەکانونی دووەمی هەمان ساڵ ئەم بۆچوونەی خۆی خستە بەردەم سێر هاملتون بالیۆزی بەریتانیا. وەکو پڕۆژەیەك بۆ دابەشکردنی وڵاتی عوسمانی، کەبۆخۆی بەرەو دارمان دەچێت وەك ئەوەی پیاوێکی نەخۆش بێت وهەناسەی کۆتایی بدات. ئەمەش بەمەبەستی ڕێگرتن لەشەڕێك لەئەوروپا، کەلەوانەیە لەئەنجامی ڕووخانی دەوڵەتی عوسمانی وتێکچوونی هاوسەنگی هێز ڕووبدا[٢٧]. ڕوسیا لێرەدا مەبەستی خۆی هەبوو، کەبریتی بوو لەگەیشتن بەئاوە گەرمەکان. چونکە دەترسا بارودۆخێك دروست بێت و لەم ئامانجە دوری بخاتەوە. بۆیە بارودۆخێك هاتبووە پێش نەیدەویست لەدەستی بدات[٢٨]. لەوکاتەشدا مەترسی گەورەی ڕوسیا بریتی بوو لەبەریتانیا، کەرکابەری سەرسەختی بوو لەناوچەکە. ئەمەش لەنوسراوی کونسولێکی ڕوسی بۆسەفیرەکەیان لەئەستەنبۆل بەدیاردەکەوێت کاتێك بۆی دەنوسێ : ((لە کێشەی کورددا ئەوە ئینگلیزەکانن کە گرنگترین نەخشەیان هەیە نەك عوسمانیەکان)).

وە کونسوڵی ئینگلیزی لەناوچەکە گەلێك ڕێنمایی گرنگی لەلایەن دەوڵەتەوە پێدراوە[٢٩]. ڕوسەکان دوای بێ ئومێد بوونیان لەبەکارهێنانی ڕێگای سیاسی بەناچاری پەنایان بۆ هێزی سەربازی برد و لەتەممووزی ١٨٥٣ز سوپای ڕوسیا هەردوو ویلایەتی ئەفلاق و بوغدان)ی داگیرکرد و دەوڵەتی عوسمانیش لە٢٣ی تشرینی یەکەمی ١٨٥٣ شەڕی دژی ڕوسیا ڕاگەیاند، لەبەرامبەردا هەریەك لەفەرەنسا و بەریتانیا ترسان لەداگیرکردنی ڕوسیا بۆ خاکی عوسمانی هەڵسان بەکاری دژە هەنگاوی ڕوسیا و فەرمانیاندا بەکەشتی گەلەکەیان کەبەرەو دەریای ڕەش بکەونە ڕێ بۆ پشتگیری دەوڵەتی عوسمانی[٣٠]، لەم جەنگەدا بەپلەی

یەکەم کاریگەری هەبوو لەسەر بەرژەوەندیەکانی بەریتانیا چونکە ناوچەی ڕۆژهەلاَت تاکە ڕێگای بوو بۆگەیشتن بەهندستان و بەردەوام بوونی جەنگەکەشی دەبووە هۆی لێدانی بەرژەوەندیەکانی بۆیە ڕووبەرووی هەر هێزێك دەبۆوە کەکاریگەری هەبێت لەسەر بەرژەوەندیەکانی هەر لەو گۆشە نیگایەوە کەوتە دانانی بەربەست لەبەردەم فراوانخوازیەکانی روسیا لەناوچەکانی دەوڵەتی عوسمانی بەتایبەتی لەرۆژهەلاَتی ناوەڕاست[31] بۆیە شان بەشانی فەرەنسا بۆ پشتگیری عوسمانیەکان هاتە ناو جەنگەوە تاروسیا بەتەنیا نەتوانێ دەست بگرێ بەسەر موڵکەکانی دەوڵەتی عوسمانی و ببێتە هەرەشەیەکیش دژی ئەم ولاَتانە[32]، لەئەنجامی بەشداری بەریتانیا و فەرەنسا دژی روسیا لەجەنگی قەرم بووە هۆی رزگاربوونی دەوڵەتی عوسمانی وماوەیەکی تر ژیانی پێ بەخشراوە بەلاَم ئەم جەنگە لەبەرژەوەندی دەوڵەتە چالاکەکان تەواوبوو دەوڵەتی عوسمانیش وەکو ئەڵقەی پەنجەی ئەو وولاَتانەی لێهات بەئارەزووی خۆیان هەڵیان دەسوڕاندو فێڵ وتەڵەکەیان لێدەکرد بەمەبەستی لاوازکردنی[33]. چونکە ئاشکرایە کەئیمپراتۆریەتی بەریتانیا لەسەر بنچینەی فرت وفێڵ وتەڵەکەبازی بنیات نرابوو لەم بارودۆخەشدا لاوازی لایەنی سەربازی عوسمانی خزمەتی بەرژەوەندیەکانی بەریتانیای کرد[34].

کێشەی ڕۆژهەلاَتی و ململانێی نێوان زلهێزەکان بەدرێژایی سەدەی نۆزدەم بەردەوام بوو لەڕووی سیاسی و سەربازی و ئابوری. بۆ نموونە دوای ئەوەی لە١٨٧٧-١٨٧٨ جارێکی تر جەنگ لەنێوان روسیا و عوسمانی سەریهەڵداوە کە روسەکان تیایدا سەرکەوتنی گەورەیان تۆمارکردو هێزەکانیان تەنها ١٠کم لەئەستانەوە دووربوون. کەچی بۆ جارێکیتر دیسان بەریتانیاو فەرەنسا هەڕەشەیان لەروسیا کردو هۆشداریان پێدا کەداگیری نەکات بۆ ئەم مەبەستەش

کەشتیگەلی بەریتانی گەیشتە دەوروبەری ئەستانە تەنها بۆئەوەی کەروسیا پشکی شێر لەپیاوە نەخۆشەکە وەرنەگرێت[٣٥].

خراپی بارودۆخی سیاسی وئابوری دەوڵەتی عوسمانی وکوردیش وەکو بەشێك لەم ئیمپراتۆریەتە بەمەبەستی رزگاربوون لەم بارودۆخە زۆرجار خۆیان هانایان بردۆتەبەر زلهێزەکان تا ململانێی نێوانیان بۆ بەرژەوەندی خۆیان بقۆزنەوە لەو رێگایەی کەیارمەتی زلهێزەکان بدەن و کارئاسانیان بۆ بکەن تابتوانن بارودۆخێکی باشتر بۆخۆیان بگونجێنن وەك ئەڤێریانۆڤ دەڵێت: ((چەند بەگێکی کورد بەکونسوڵی روسیا لەئەرزەرۆم رادەگەیەنن کەئەگەر هاتوو شەڕ دەستپێبکات ئەوە ئامادەی یارمەتیدانن بەروسیا))[٣٦]، لەبەرامبەریشدا بەریتانیا لەوە دەترسا کەروسەکان لەسنوری قەفقاسەوە لەرێگای قۆزاقەکانیەوە دەستدرێژی بکاتە سەر سنوری دەوڵەتی عوسمانی وفشاریش بخاتە سەر ئەرمەن وکورد بۆئەوەی بیانکاتە دەسکەلای خۆی بۆیە هانی سولتانیدا بەخێرایی هێزێك لەکوردەکان پێکبهێنێ کەدواتر بەرهەمەکەی سوارەی حەمیدیەی لێ دروست بوو[٣٧] کە لەبابەتەکانی دواتر لێی دەدوێین.

بەشێوەیەکی گشتی لەکۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەم پەرەسەندنەکانی کێشەی رۆژهەلاتی گەیشتە ئاستێك کە هەر یەکێك لەزلهێزەکان هەولی ئەوەی دەدا کەپێگەو دەسەلات و نفوزی خۆی بەهێز بکات و پێگەی وولاتەکانی تر لاواز بکات بەتایبەتیش ئەم ململانێیە لەنێوان روسیا و بەریتانیا لەوپەڕی بەهێزیدا بوو، بەریتانیا دەیویست کوردستان لەژێر چاودێری خۆیدا بێت رێگاش لەروسەکان بگرێت بۆیە بەهۆی دامەزراندنی تۆری سیخوری نفوزی خۆی لەنێو خێل وعەشیرەتە بەناوبانگەکانی کوردستاندا کردبووە پێگەیەکی بەهێز دژی روسیا[٣٨].

سێیەم / هۆکاری ئابووری

ئابووری خاڵی جولێنەر و هەستیاری کۆمەڵگاکانە لەدوای شۆڕشی پیشەسازیش گرفتی زلهێزەکان بریتی بوو لەگەران بەدوای بازار بۆ ساغکردنەوەی بەرهەمەکانیان و بەدەستهێنانی کەرەستەی خاوی پێویست و بەگەڕخستنی سەرمایەی کەڵەکە بووی وولاتەکانیان ئەوە هانی دان بۆ ئەوەی دەسەلات و پێگەی ئابووریان لەناوچەکانی رۆژهەلاتدا پەرە پێ بدەن، کوردستانیش بەشێك بوو لەم ناوچەیە کە سالانێك بوو کۆششیان دەکرد بۆ دەستگرتن بەسەر سامانەکەی و بەستنەوەی بەبازارەکانیانەوە(٣٩)، هەر لە سەدەی هەژدەمەوە هەژمونی ئەوروپیەکان کەوتە سەر ناوچەیەکی زۆری دەوڵەتی عوسمانی(٤٠).

بەدرێژایی سەدەی نۆزدەم زلهێزەکانی روسیا کە بەشێکی کوردستانی داگیرکردبوو هەروەها بەریتانیا و ئەلمانیا و فەرەنسا دەرکەوتن بەتایبەتی لەو کاتەی کە کالاکانیان گەیەنرایە بازارەکانی کوردستان وجۆراوجۆری کالا لەچۆنیەتی و نرخ سەدایەکی گەورەی لەلای خەڵکی کوردستان دایەوە و دەوڵەتە گەورەکان هەموو توانای خۆیان بۆ شوێن پێ کردنەوەیان لەم ناوچەیە بخەنە گەڕ تابازاڕەکانی خۆیان ببەستنەوە بەبازاڕەکانی جیهانەوە(٤١) چونکە کوردستان گرنگیەکی ئابووری لەبن نەهاتووی هەبوو کەببێتە جێگای ئەم گرنگی پێدانە لەلایەن زلهێزەکان لەم روانگەیەوە داتاکان ژمارەمان پێدەدەن وەك لەناوەراستی سەدەی نۆزدەم تەنها خوری مەڕ و مالات سالانە بایی نزیکەی (٧٠٠٠٠) پاوەندی ئیستەرلینی لەکوردستانەوە هەناردەی دەرەوە کراوە(٤٢)، هەروەها ناوچەیەکی گرنگی کشتوکاڵیش بووە کە سەرچاوەیەکی گرنگی دابین کردنی پێداویستیەکان بووە بۆ بەغداو قوستەنتینیە و سوریا کە تەنها

قوستەنتینیە ئەو داهاتەی کە لە کوردستانەوە پێی دەگەیشت کەمتر نەبوو لەیەك ملیۆن ونیو سەر مەر و مانگا[٤٣]، ئەو باج و سەرانەیەی کە لەخەڵکەوە وەردەگیرا خزمەتێکی زۆری دەوڵەتی عوسمانی کردووە چونکە لەو کاتەی کەدەوڵەتی عوسمانی تووشی کورتهێنانی بودجە بوو وە کەوتبووە ژێرباری قەرزێکی زۆرەوە بەپێی بەڵگەنامەکانی ئەرشیفخانەکانی عوسمانی لەشارە کوردیەکانی وەکو (ئەرزەڕۆم، دیاربەکر، وان، ئەلعەزیز و بەدلیس) پارەیەکی زۆر لەرێگای باج و هاوکاریەوە کۆکراوەتەوە و دەوڵەت بەم برە پارەیە توانیویەتی کەشتیەك بکرێت لە ساڵی (١٨٩٥) و ناوی ناوە (کوردستان)[٤٤] جگە لەم گرنگیانەی کوردستان لەسەدەکانی رابردووەوە بەشی هەرە زۆری رێگا بازرگانیەکانی نێوان دەوڵەتانی رۆژهەڵات و رۆژئاوا بەکوردستاندا تێدەپەرێت بەتایبەتی رێگای بازرگانی ئاوریشم، رێگایی بازرگانی نێوان چین و ئاسیای بچووك،رێگای بازرگانی نێوان روسیاو ولاّتانی عەرەب[٤٥].

لەبەر ستراتیژیەتی ئابووری کوردستان روسەکان لە سەرەتایی نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەم گرنگیەکی زیاتریان بە کوردستان داوە قەیسەری روسی ویستویەتی کوردستان بکاتە پردێك بۆ پەیوەندی کردن لەنێوان قەفقاس و رۆژهەڵاتی ناوەڕاست وەبیکاتە بازارێك بۆ ساغکردنەوەی بەرهەمەکانیان، لەبەر گرنگی ناوچەکە کونسوڵی روسی لەوان بەناوی اولیڤیریف دەنووسێت: ((لەسەرمان پێویستە هەموو تواناکانی خۆمان بخەینە گەڕ تابازاڕی ناوچە نزیکەکانی روسیا لەژێر دەسەلاّتی ئێمەدا بمێنێتەوە))[٤٦]، دواتر دەبینین شان بەشانی روسیا ئینگلیزەکانیش دێنە مەیدان ونفوز ودەسەلاّتی ئابوری خۆیان دەخەنە سەر بەشی باشوری کوردستان[٤٧] کاتێك بەریتانیا هەستی بەم گرنگیە کرد لەکۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەم زیاتر کەوتە ناردنی نوێنەرو رابەر

بـۆرۆژهەلآت و بەوردی لەبازاڕو ڕێگاو بانەکانیان دەکۆلیەوە بەمەبەستی ڕەوانەکردنی کەلوپەلی بەریتانیا وەك ولیامزی نوێنەری بەریتانیا لەلەشکری تورکدا دەڵێ: ((کورترین ڕێگای نێوان ئینگلتەراو دەلهی بەم ناوچەیەدا ئەڕوات، کەلوپەلی ئینگلیزیو پتر لەنیوەی ئەو کەلوپەلانەی کەلەئەورووپاوە ئەنێردرێت بۆئێران بەترابزۆن ئەرزەرۆم – تەورێزدا ئەڕوات))، کەبەپێی ئەم وتانە کوردستان دوو گرنگی هەبووە بۆ بەریتانیا :–

١– ناوچەیەکە بۆ ساغکردنەوەی کەل و پەلەکانی بەریتانیا

٢– ڕێگایەکە کەپێیدا تێپەردەبێت بۆ هندستان[٤٨].

لەکۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەم ئەمریکا و ئەلمانیا هاتنە ناو بازاڕە جیهانیەکانەوە و کەوتنە ململانێ لەگەڵ بەریتانیا و فەرەنسا[٤٩] بۆپاراستنی بەرژەوەندیەکانیان بەتایبەتی لەرۆژهەلآتی ناوەڕاست ئەمریکا سەرەتا نەیتوانی وەکو ولآتە ئەورووپیەکان بێتە مەیدانەکەوە لەبەر چەند هۆکارێك وەکو دووری لەناوچەکە و گەورەیی توانای ئەورووپیەکان و دواکەوتوویی هۆیەکانی گواستنەوە[٥٠].

ئەلمانیا دوای بوژانەوەی پیشەسازی ولآتەکەی بەرهەمەکانی لەپێداویستی بازاڕەکانی خۆی و ولآتانی دراوسێی زۆر زیاتر بوو بۆیە دەستی کرد بەگەڕان بۆ دۆزینەوەی بازاڕێك لێرە و لەوێ بەلأم لەهەموو شوێنەکان ڕووبەڕووی بەربەستی بەریتانی و فەرەنسیەکان دەبۆوە لەبەرئەوە ململانێیەکی توند بەتایبەتی لەرۆژهەلآت کەوتە نێوان زلهێزەکانی (بەریتانیا، فەرەنسا، ئەلمانیاو ڕوسیا) وە لەبەر ئەوەی کە کوردستان ناوچەیەکی ستراتیژی گرنگ و دەوڵەمەند بوو لەناوچەکە بۆیە شوێنێکی تایبەتی بۆ دانرا لەپلان و نەخشەی زلهێزەکان

کەبەهەموو هۆیەکان هەوڵیان دەدا جێی پێی خۆیان زیاتر جێگیر بکەن لەم وڵاتە بۆ دەست گرتن بەسەر سەروەتەکەی و گرێدانی بەبازاڕەکانی خۆیان[٥١].

سامانە سروشتیەکانی کوردستان کەسەروەتێکی خۆرسکی کوردستانە ئەویش بووە هۆکاری راکێشانی وولاتە زلهێزەکان بۆ ناوچەکە و رۆژ دوای رۆژیش ئەم گرنگی پێدانە زیاتر بوو کەهەریەکێك لەم وولاتانە هەوڵی ئەوەیان دەدا شوێنی خۆی لەکوردستان جێگیرتر بکات بۆ دەست گرتن بەسەر ئەم سامانە دەوڵەمەندە[٥٢].

نەوت وەك گرنگترین بەرهەمی ئابووری سەردەمیانە بایەخی کوردستانی زیاتر کرد لەمەشدا نەوتی ویلایەتی موسڵ و بەتایبەتیش کەرکوك ئەم گرنگیەی سەلماند بۆ زلهێزەکان بەتایبەتی لە (١٠) ساڵی کۆتایی سەدەی نۆزدەم ستراتیژیەتی نەوتی ویلایەتی موسڵ بەدیارکەوت ئەمەش بووە هۆی ئەوەی کەگفتوگۆیەکی چڕ لەنێوان وولاتە ئەورووپیەکان و دەوڵەتی عوسمانی ئەنجام بدرێت و بکەونە پـێشبرکێ بەمەبەستی بەدەست هێنانی ئیمتیازات و وەبەرهێنانی نەوتی ناوچەکە[٥٣]، چونکە سەرچاوەیەکی نەوتی زۆری تیادابوو[٥٤] کە لە زۆر شوێندا نەوتەکەی ئەوەندە نزیکە لەرووی زەوی بەخۆی دێتە دەرەوە و ئەرژێتە روبارەکانەوە وەدەرهێنانی تێچونێکی کەمی دەوێت بەتایبەتی لەناوچەکانی خانەقین و مەندەلی[٥٥] نەوتی کوردستان هەر لەسەدەی هەژدەمەوە بووە جێی چاوتێبرین و گرنگی پێدانی وولاتە زلهێزەکان و گەڕیدە و پسپۆرە نەوتیەکانیان هاتوونەتە ناوچەکە بۆکاری پشکنین وەك م. ئۆتر ساڵی ١٧٤٣ سەردانی بابا گورگوڕی کەرکوکی کردووە، گەڕیدەی دانیمارکی کارستن نیبور لەساڵی ١٧٦٦ و م. دانئیل ی فەرەنسی، ج.جاکسۆن ساڵی ١٧٩٧ و جیمس سیلك بکنگهام لە١٨١٦/٧/٩ و نووسینی کتێبی (رحلاتی فی بلاد الاشوریین و

میدیا وفارس)، ئەمانە هەموویان سەردانی باباگورگوری کەرکوکیان کردووە و ئاماژەیان بەنەوتی ناوچەکە کردووە[٥٦]، ئەم کارەی زلهێزەکان لەسەدەی نۆزدەم درێژەی هەبوو و بایەخ پێدانیان بەناوچەکە زیاتر بوو وەك (ج.مورغان)ی فەرەنسی کەباس لەدەولەمەندی باباگورگور و خانەقین و قەسری شیرین دەکات[٥٧]، لەسالی ١٨٧١ یەکەم تیمی ئەلمانی سەردانی ناوچەکەیان کرد و هەردوو ویلایەتی موسل و بەغدایان پشکنی و راپۆرتێکیان پێشکەش کرد کەتیایدا ئاماژەیان بەوەکرد بوو کەنەوت بەرێژەیەکی زۆر لەم ناوچانەدا هەیە[٥٨]، لەبەر ئەمە بەمەبەستی دەستگرتن بەسەر نەوتی کوردستان ململانێ کەوتە نێوان زلهێزەکان وەك شەمزینی دەلێ: ((کوردستان وەك دەولەمەندترین ناوچە نەوتاویەکانی دوو رۆژهەلاتی ناوەند و نزیك سەرنجی دەولەتە ئیمپریالیستیەکانی راکێشاو کۆنترۆل کردنی بوو بەیەکێك لەئامانجەکانیان، سەرەنجام کوردستان بووە گۆرەپانی ململانێیەکی توندوتیژی نێوان ئەلمانیا و بەریتانیا و روسیا))[٥٩].

دوای ئەوەی دەولەتی عوسمانی گرنگی نەوتی کوردستانی بۆ روون بۆوە و هەستی بەململانێی زلهێزەکان کرد لەسەرناوچەکە لەسالی ١٨٩١ز سولتان عەبدولحەمیدی دووەم داوای لەئەندازیاری جیهانی بواری نەوت (گولبەنگیان) کرد کەچەند راپۆرت و توێژینەوەیەك دەربارەی گەنجینە نەوتیەکانی ئەم دەڤەرە ئەنجام بدات،سەرەنجام ناوبراو هەلسا بەچاوخشاندنەوە بەراپۆرتەکانی پێشەخۆی و راپۆرتێکی پێشکەش بەسولتان کرد و دووپاتی ئەوەی کردەوە کەکوردستان گەنجینەیەکی شاراوەی نەوتی ئێجگار گرنگە دوای ئەمەش هەولی ئەوروپیەکان لەناوچەکە زیاتر چرپۆوە[٦٠] لەبەرامبەریشدا سولتانی عوسمانی

زەوییە نەوتەلانیەکانی مەندەلی و دوزخورماتو و باباگورگوڕی خاوەنداریەتی گشتی گواستەوە بۆ خاوەنداریەتی تایبەتی سوڵتان بەبیانوی پاراستنی[٦١]

چوارەم / هۆکاری ئایینی

کوردستان بێشکەی ئاین و ئایینزاکانی جیهانە، کورد ئەگەر لەباری ئەتنیکەوە نەژادێکی سەربەخۆی هەبێ ئەوا لەبارەی ئایینەوە سەر بەئاین و ئایینزای جۆراوجۆر بووە زەردەشتی، مانەوی، جوولەکە، مەسیحی، یەزیدی، موسڵمان، (شیعە و سوننە)، ئەهلی حەق...هتد، رێبەر و سەرانی هەر ئاینێك ویستویانە خەڵکی کورد بۆلای خۆیان رابکێشن یان بەلای کەمەوە کوردستان بکەنە مەیدانی پەرەپێدانی ئەو ئاین ومەزهەبە دیاریکراوەی خۆیان، موژدەدەرە مەسیحیەکانیش (المبشرین) دەستەیەکی دیاریکراو وبەهێزی رۆژئاواییەکانن بۆمەبەستی بلاوکردنەوەی ئایینی مەسیحی و فریاکەوتنی ژیانی رۆحی وکولتوری مەسیحیەکانی کوردستان هاتوونەتە کوردستان[٦٢] بەرژەوەندیە ئایینیەکان شان بەشانی بەرژەوەندیە ئابوری و سیاسی و سەربازییەکان هۆکارێکی گرنگ و ئامرازێکی کاریگەری تربوو بەدەست زلهێزە ئەوروپیەکانەوە لەمیانەی دزەکردنیان بۆ کوردستان و رۆژهەلاتی نزیك، یەکەمین نیشانەی دزەکردنی دەسەلاتی زلهێزەکان بۆ کوردستان لەرووی ئایینیەوە هەوڵدانیان بوو بۆ پەیوەندیکردن لەگەڵ کلێساکانی رۆژهەلات[٦٣].

موژدەدەرە مەسیحیەکان سەرەتا هەوڵی ئەوەیان دەدا کەکوردەکان بهێننە سەر ئاینی خۆیان بەلام کاتێ زانیان سەرکەوتنی ئەم پرۆژەیان ئەستەمە بۆدرێژەدان بەکۆششی خۆیان روویان کردە مەسیحیەکانی کوردستان[٦٤] چونکە کوردستان وەك بەشێك لەدەوڵەتی عوسمانی و فارسی جگە لەکورد کەزۆرینە بوون و لەسەر ئایینی ئیسلام بوون نزیکەی چواریەکی دانیشتوانەکەی لەئاینە

جۆراوجۆرەکانی تر تیایدا دەژیان وەك ئەرمەنی، نەستوری، مەسیحی یەعقوبی وەجولەکە کەگەورەترین کۆمەڵگای ئیسلامی بوون[٦٥] کەواتە ئەمە ڕێگا خۆش دەکات بۆ دزەکـردنـی دەسەڵاتی زلهێزەکان بۆ کوردستان، ئینجا وولاتە زلهێزەکان هاتنە ناوچەکە بۆ پاراستنی بەرژەوەندی ئاینیان وە بەرگری کردن لەمەزهەبی پەیرەوکراو لەوولاتی زلهێز و زیادکردنی نفوزی پەیڕەوانی وەك روسەکان هاتن بۆ بەرگری کردن لەکەنیسەی ئەرسەدۆکس و بلاّوکردنەوەی لەناو چینەکان، هەروەها فەرەنسـا بۆ بەرگریکردن وبلاّوکردنەوەی مەزهەبی کاسۆلیك کەلەوولاتەکەی پەیڕەو دەکرا، بەریتانیاو ئەمریکاش بۆ زیادکردنی پەیڕەوانی پرۆتستانت[٦٦] زۆری ئاینی لە کوردستان ڕێگا خۆشکەربوو بۆ ئەم هەوڵانە.

ئاین وەك ئامرازێك بەکارهێنرا لەلایەن زلهێزەکان دژ بەدەوڵەتی عوسمانی بەتایبەتی روسیا کەخۆی بەپارێزەرو بەرگریکاری مەزهەبی ئەرسەدۆکس دادەنا هەروەها خۆی بەمیراتگری دەوڵەتی بیزەنتی دەزانی کەلەساڵی ١٤٥٣ لەسەر دەستی عوسمانیەکان کۆتایی پێهات[٦٧] لەم پێناوەشدا ئایینیان بۆ مەبەستی سیاسی خۆیان بەکارهێناوە لەرێگای ئایینیەوە بارودۆخێکیان رەخساند بۆ دەستوەردان لەکاروباری ناوخۆی دەوڵەتی عوسمانی بەبیانوی پشتگیری کردن لەداخوازی مەسیحیەکان و بەرگری کردن لێیان[٦٨].

ئەو موژدەدەرانە کەهاتوونەتە کوردستان لەپاڵ کاروباری ئایینی زۆرجار کاری سیاسیان کردووە بۆ بەرژەوەندیە باڵاکانی وولاتەکەیان کەوەکو سیخوڕ کاریان کردووە وەك دەبینین کاتێك کەکۆلۆنێل (بێل)ی ئینگلیزی دەستی بەگەڕان کرد لەکانوونی دووەمی ١٨٨٦ بەئەسکەندەرونە، مەلاتیا، خەربووت، دیاربەکر، بەدلیس و وان کەزیاتر لەمانگێك لە وان دەمێنێتەوە لەگەڵ (لاش)ی سەرکونسوڵی ئینگلیزی وسەرۆکی موژدەدەرە ئەمریکیەکان زانیاری لەسەر

ڕێگاوبان وباری سیاسی وجەنگی کوردەکانی ئەو ناوچەیە کۆدەکاتەوەو نەخشەی ناوچەکە دەکێشن[٦٩]، جگە لەمانە زۆرجار مەسیحیە نیشتەجێکانی کوردستانیش هانی زلهێزەکانیان داوەو زانیاریان پێداون وەداوایان لێکردوون کەدەست بگرن بەسەر ناوچەکان. وەك لەنامەکەی قەشەی وان (ئاڤراهام)کە لە ١٨٥٥/٣/٣٠ بۆ (پالکۆڤنیك خرشب تیسکی) فەرماندەی هێزە سوارەکانی ئیرەڤانی روسی دەنووسیێ : ((بەرێز پالکۆڤنیك کاتێك کەئێوە بتانەوێ بەرەو وان بکەونە ڕێ داواتان لێدەکەم کەهەفتەیەك پێش بەرێکەوتنەکەتان ئاگادارم بکەنەوە بۆئەوەی منیش لەلای خۆمەوە بتوانم خۆم ئامادەبکەم کەبەهێزەکەمەوە بۆیارمەتیدانی ئێوە بێم، تکایە لەبەرێکەوتن پەلەبکەن و ئەوکات ئێمە دەتوانین بەم زووانە شاری وان بگرین بەگەیشتنی هێزەکانی ئێوە بۆ وان من بەلێنتان پێدەدەم کەئەم شوێنە پان و بەرینە هەر لەشاری موسلەوە تا وان بگرم))[٧٠].

تەوەری دووەم :—

دزەکردنی هەژموون و بەرژەوەندیەکانی زلهێزەکان بۆ کوردستانی عوسمانی

یەکەم / بەدەستهێنانی بەرژەوەندی ئابووری

لەنیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەم کوردستان بەبارودۆخێکی نالەبارو وێرانی ئابووریدا تێدەپەڕی. جەنگ و شوێنەوارەکانی هەموو گۆشەیەکی ئاوەدانی کوردستانیان تێکدابوو. باجی زۆرو زوڵمی باجگرەکانی دەسەلاتی ناوەندی جوتیارەکانی داپۆشیبوو، زۆرجار سوپای عوسمانی بەسەرەنێزەو چەك باجی زۆریان لەکوردستان بۆ خەزێنەی بەتاڵ بوویان کۆدەکردەوە[٧١]. بۆیە ئەم بارودۆخە بواری بۆ زلهێزەکان خۆشکرد کە بەرێگای جۆراوجۆری ئابووری وەکو

پێدانی قەرز، هێڵی ئاسنین، نەوت، کردنەوەی لقی بانك دەسەڵات و هەژموونی خۆیان دزە پێبکەن بۆ کوردستان. کۆمپانیاکانیشیان کەوتنە ململانێ بۆ بەدەست هێنانی ئیمتیازات لەئیمپراتۆریەتی عوسمانی، کە سوودێکی زۆریان لێ دەبینی(۷۲).

بازارەکانی کوردستان وکەرەستە خاوەکەی بوو بووە هۆکاری ململانێی زلهێزەکان وکێبرکێ لەسەری بەبەڵگەی ئەوەی کەئەلفێریێف یاریدەدەری کونسوڵی روسی لە وان دەڵێ: ((پێویستە بەهەموو تواناکانمانەوە بازارەکانی کوردستان بۆخۆمان راکێشین ورێگا نەدەین بکەوێتە بن باڵ وسایەی ئەڵمانەوە))(۷۳)، چونکە ئەڵمانیا لەپێشکەوتنێکی ئابووری گەورەدابوو پێویستی بەبازارێك هەبوو تا بەرهەمەکەی تیا ساغ بکاتەوە لەبەر ئەمەش لەرێگای موژدەدەرەکانی کەوتە کۆکردنەوەی زانیاری لەسەر ناوچە کوردیەکان و پەیوەندیان کرد بە هۆزەکان ودەست وەردان لەکاروباری ناوچەکان تا بتوانن سەرکردەی هۆزەکان بۆلای خۆیان رابکێشن(۷٤) لە ئەنجامدا ئەڵمانەکان چەندین مەڵبەندی بازرگانیان لە ناوچە کوردیەکان کردەوە، ئەم دەست تێوەردانەی ئەڵمانیا لەکوردستان روو لەزیاد بوون بوو و ئاڵوگۆرە بازرگانیەکان لەماوەی سێ دەیە لە (۱۸۸۰ تا ۱۹۱۱ز) ۲۲ جار زیادی کرد ئەمەش ژمارەیەکی پێوانەییە(۷٥).

هەروەها بۆ روسەکان کوردستان رێگایەکی سەرەکی بوو بۆ تێپەرینی بازرگانێتی قەفقاس بەرەو ئاسیای بچووك و ئێران و کەواتە کوردستان لەرووی رێگا بازرگانیەکانەوە مەڵبەندێکی ترانزێتی بوو لە نێوان دەریایی رەش و دەریایی قەزوین،دەریایی سپی ناوەراست و کەنداوی فارس(۷٦).

پێدانی قەرز بەدەوڵەتی عوسمانی رێگایەك بوو تا لەوێوە زلهێزەکان دەسەڵاتیان دزە بکات بۆ دەوڵەتی عوسمانی و کوردستانیش وەك بەشێکی

گرنگ لەم ئیمپراتۆریەتە، یەکەم قەرزیش لەساڵی ١٨٥٤ز لەبەریتانیا وەرگیرا کە سێ ملیۆن پاوەندی ئیستەرلینی بوو بە سوودی لە ٦٪، دواتر گرێبەستی تری بەدوا داهات لە ساڵانی ١٨٥٥، ١٨٥٨، ١٨٦٠، ١٨٦٢، ١٨٦٣، ١٨٦٥ (دووجار)، ١٨٦٩،١٨٧٠،١٨٧١، ١٨٧٢، ١٨٧٤، تاوایلێهات کە دەوڵەتی عوسمانی توانای دانەوەی قەرزەکانی نەما و ئیفلاسی خۆی راگەیاند ئەمەش ئەم بیانووە بوو کە وولاتە زلهێزەکان بەدوایدا دەگەڕان[٧٧].

لەنیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەم هێڵی ئاسن گرنگیەکی زۆری پەیداکرد وەکو پێویستیەکی سەردەمیانە بۆدەوڵەتی عوسمانی سەیر دەکرا لەم پێناوەشدا تەواوی زلهێزەکان هەوڵی خۆیان دەدا بۆئەوەی ئیمتیازی هێڵە ئاسنینەکان وەربگرن تالەوێوە دەسەلاتی خۆیان پەرەپێ بدەن لەگەڵ ئەوەشدا کەزۆربەی هێڵە ئاسنینەکان بەکوردستاندا تێدەپەرین وولاتی ئەڵمانیا بەشی گرنگی ئەم ئیمتیازەی وەرگرت[٧٨].

شان بەشانی ئەڵمانیا، ئەمریکیەکانیش کەوتنە خۆ بۆ بەدەست هێنانی ئیمتیازی راکێشانی هێڵی ئاسنی لەم پێناوەشدا کەسێك بەناوی ئەدمیرال کولبی میشیل چێستەر(c.m.chester) رەوانەی ناوچەکە کرا تابتوانێ مافی راکێشانی هێڵی ئاسنین وەربگرێ و بگەرێ بەدوای کانزاکان کە بۆ رووبەری ٢٠کم لەهەر لایەکی هێڵەکان رێگا پێدراو بوو ئەو هێڵەی کەپێشنیار کرابوو شاری سیواس و شاری سلێمانی بەیەك دەبەستەوە[٧٩]، هەروەها نوێنەرەکەی ئەمریکا لەساڵی ١٨٩٩ز سەردانی ئەستانەی کرد بەمەبەستی بەدەستهێنانی پشکێك بۆ ئەمریکا لەپرۆژەی هێڵی ئاسنی بەرلین ـ بەغدا[٨٠].

فەرەنسیەکانیش گرنگیان بەهێڵە ئاسنینەکان داوە زیاتر لە ئینگلیز و ئەڵمانەکان بەجۆرێك پێش کۆتایی هاتنی سەدەی نۆزدەم تێکرایی درێژی ئەو

هێڵە ئاسنەی كە ئینگلیزەكان بنیاتیان نابوو بریتی بوو لە ٤٤٠كم و ئەڵمانەكان ١٠٢٠كم و فەرەنسیەكان ١٢٦٦كم ئەمەش بووە هۆی ئەوەی كاتێك ئەڵمانەكان ئیمتیازی هێڵی ئاسنی بەرلین – بەغدایان وەرگرت فەرەنسیەكان بەشدار بكەن لەم پرۆژەیە بەدرێژەی ٤٠٪ ی پرۆژەكە(٨١).

نەوتیش سەرچاوەیەكی تری ئابووری گرنگ بوو لەكوردستان كە زلهێزەكان هەوڵیاندەدا بۆخۆیان مسۆگەری بكەن بە تایبەتی دوای ئاشكرابوونی نەوتێكی زۆر لە ویلایەتی موسل و بەتایبەتی شاری كەركوك كەلەئەنجامدا ململانێیەكی توند كەوتە نێوان زلهێزەكان (ئەڵمانیا، فەرەنسا، بەریتانیا، هۆڵەنداو ئەمریكا)(٨٢)، هەڵسان بەرەوانكردنی نوێنەرەكانیان بۆ ئەم مەبەستە لەساڵی ١٨٧١ز یەكەم شاندی ئەڵمانی سەردانی ناوچەكانی كوردستانیان كرد لە بابەگورگور و گەرمیان و مەندەلی و مدحت پاشای والی بەغدا پسپۆرە ئەڵمانەكانی لەبواری نەوت بەكارهێنا، ئەم پسپۆرانە راپۆرتێكیان بەرزكردەوە بۆ حكومەتی ئەلمانیا لەسەر چاڵە نەوتەكانی باشوری كوردستان و دەنگۆیەكی زۆری داوە، هەر لەبەر ئەمەش بوو قەیسەری ئەلمانیا ولیەمی دووەم لە٤ ی تشرینی دووەمی ١٨٨٩ز هاتە ئیمپراتۆریەتی عوسمانی(٨٣)، دوای ئەلمانەكان ئەمجارە ئینگلیزەكان هاتن بۆگەڕان بەدوای نەوت و نوێنەرەكانیان وەكو عەقید مایلز قونسولی بەریتانی لە بەغدا كەلە دەوروبەری موسڵ دەستی كرد بەگەڕان، بلودان كەلەسلێمانی و كۆیە دەستی بەگەڕان كرد دواتریش چووە هەولێر و موسڵ تاساڵی ١٨٨١، لەساڵی ١٨٨٧ز عەقید تویدی كونسولی گشتی بەریتانیا لە بەغدا هاتە هەولێر و سنجار دواتر نەقیب مانس هات بۆ دهۆك و ئامێدی و زێبار و هەولێر لەساڵانی ١٨٨٨و١٨٩٢ كە زۆر بەراشكاوانە باس لەهەبوونی نەوت لە ناوچەكە و گرنگی لە داهاتوو دەكات(٨٤).

کوردســتان بـۆ بەریتانیــەکان ناوچــەیەکی گــرنگ بــووە لــەرووی ئابووریــەوە کەهەولّیداوە بەرهەمە پیشەسازیەکانی خـۆی لـە رێگـای تەرابزۆنـەوە بگەیەنێتـە کوردستان، هەروەها دەیویست لێرەوە مـلملانێی ئابووری روسیا بکات، هەروەها بەرهـەمی خـوریش یـەکێك بـوو لـەو بەرهەمـە ئابوریانـەی کـە لای بەریتانیـەکان رەواجێکی زۆری هەبوو هەر بۆیەش بریکارەکانی سـەر بـەکۆمپانیاکانی بـەریتانی کە نووسینگەیان لەشارەکانی کوردسـتان هـەبوو ئـەم بەرهەمـەیان دەکـری و لـە کارگەکانیان فەرش و مافوریان لیّ دروست دەکرد[٨٥].

شایەنی باسە لەنیوەی دووەمی سەدەی نـۆزدەم پیـاوانی (کۆمپانیـای هنـدی رۆژهـــەلآتی)[٨٦] ی بـــەریتانی بـــە بـــەردەوامی لـــە ناوچـــەکانی کوردســـتان دەسوڕانەوە[٨٧].

هەر بەمەبەستی کۆنترۆڵکردنی ئابوری کوردسـتان لـە لایـەن زلهێزەکانـەوە و بەکارهێنانی بۆ بەرژەوەندیان خزمەت پێکردنی سیاسەتی وولآتـەکانیان لەسـالّی ١٨٩٤ز لقی بانکی عوسمانی[٨٨] لە ویلایەتی موسلّ کراوە کـە بـانکێکی هاوبـەش بـوو لـەنێوان فەرەنـسا و بـەریتانیا بـۆ نـاردنی سـەرمایە بـۆ ناوچـەکانی ژێـر دەسەلآتی عوسمانی[٨٩].

دووەم / هاتنی موژدەدەرەکان

هاتنی موژدەدەرە ئاینیەکان ڕێگایەکی تر بوو کە زلهێزەکان توانیان سودی لێوەربگرن تـا لەرێگایـەوە بتـوانن دەسـەلآتیان دزە پـیّ بکـەن، مێـژووی هـاتنی موژدەدەرەکانیش دەگەرێتـەوە بـۆ سـەردەمێکی زووتـر بـە بـڕوای(گـارۆزنی)[٩٠] یەکەم موژدەدەر کەهاتۆتە کوردسـتان دومنیکـی ب. لیوبولـد و سـولدینی بـووە لەسالآنی ١٧٦٠ـ١٧٧٩ کە لەناوچەکانی زاخۆ و خابور ژیاوە[٩١] ئەو موژدەدەرانـە گرنگیـان بەناوچـەکە داوە و بیروبـاوەڕ و رێنماییـە ئاینیـەکانی مەسـیحیان لـە

کوردستان بلآوکردۆتەوە[٩٢]، چونکە کوردستان جێگای زۆر لەتەریقەت و ئاینی مەسیحیەتی جۆراوجۆری تێدابوو بارودۆخێکی باشی گونجاند بوو بۆ بلآوکردنەوەی بیروباوەڕەکان و لەلایەن حکومەتەکانیشەوە پشتیوانی دارایی و مەعنەویان لێدەکرا و لەشارە ستراتیژیەکانی کوردستان بنکەیان دانا بوو وەکو(موسڵ، ئەرزەرۆم، دیاربەکر، خارپوت، وان، سیرت، ورمێ[٩٣] و بەدلیس)[٩٤] و هەڵسان بەدروستکردنی چەندین قوتابخانە و نەخۆشخانە سەرەتا بۆ مەسیحیەکان[٩٥] بەلآم دواتر بوارەکە فراوان بوو و قوتابخانەکانی موژدەدەرەکان دەرگایان بۆ قوتابیانی مەسیحی و موسڵمانەکانیش خستە سەرپشت[٩٦].

لەریزی پێشەوەی ئەو زلهێزانەی کەموژدەدەرەکانی خۆیان دەناردە ناوچەکە، ئەمەریکا بوو. چونکە ئەو کاتە هێشتا ئەمەریکا توانای ئەوەی نەبوو کەوولآتانی ئاسیا داگیربکات بۆیە لەرێگای موژدەدەرەکانی ویستی دەسەلآتی خۆی بسەپێنێتە سەر ناوچەکە و لەسەرەتای سەدەی نۆزدەمەوە دەستی پێکرد و لە کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەم پەرەیسەند[٩٧]، ئەم موژدەدەرە ئەمەریکیانە هەم ئاینی مەسیحیان بلآوکردەوە و هەمیش کاری سیاسیان دەکرد بۆ خزمەتی ولآتەکەیان وەك(سیرس)ی مێژوونوسی سیاسەتی دەرەوەی ئەمەریکی دەڵێ: ((کەڵك وەرگرتنی ئەمریکا لە تورکیادا بەستراوەتەوە بە پەیامنێرە فەلەکانەوە))[٩٨].

لە کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەم ژمارەی موژدەدەرە ئەمریکیەکان و چالآکیەکانیان تا دەهات لە کوردستان زۆر تردەبوو بۆ ئەم مەبەستە دەبینین تەنها لەشاری سیواس نزیکەی٢٥ قوتابخانەیان دامەزراندبوو هەریەکێك لەو قوتابخانانەش نزیکەی ١٥٠٠قوتابی تیادا بوو کەبەشی زۆریان ئەرمەنیەکان

بوون، شایەنی باسە ئەم موژدەدەرانە پەیوەندی راستەوخۆیان هەبوو لەگەڵ بالیۆزخانە و کونسولگەری وڵاتەکەیان و رۆڵی راوێژکاری نافەرمیان دەبینی لەکاروبارە گرنگەکان بۆ سیاسەتی ئەمریکا[99]، مەبەست لەکردنەوەی ئەو قوتابخانانەش خزمەتکردن بوو بەسیاسەتی ئەمریکا وەك کەلیوباکین[100] دەڵێ : ((ئەو قوتابیانەی موژدەدەرەکان دەرسیان پێ دەڵێن ئەگەر لەبیرورای کۆنیان لانەدەن ئەوا هەتا سەر نامێننەوە چونکە لەم قوتابخانانەدا زیرەکی قوتابیەکان هیچ گرنگی پێنادرێ))[101].

ئەم بارودۆخە بەم شێوەیە بەردەوام بوو جۆرێك پێش داهاتنی سەدەی بیستەم موژدەدەرە ئەمریکیەکان لە وان، ئەرزەرۆم، ماردین، تبلیس، بەغدا و سیرت و شوێنە قەرەباڵغەکانی تری رۆژهەلاتی عوسمانی دەبینران[102].

موژدەدەرە بەریتانیەکانیش لەو نێوانەدا بێ هەڵوێست نەبوون بەڵێ ئەوانیش ئەسپی خۆیان تاودا بەجۆرێك هەڵدەستان بە بلاوکردنەوەی بیروباوەری ئاینی لەنێو مەسیحیەکانی کوردستان وەکو چەکێکی کاریگەر بۆ مەبەستی دزەکردنی دەسەلاتیان بۆ ناوچەکە، بۆ ئەم مەبەستەش کەوتنە کارکردن بۆ تێکدانی پەیوەندی نێوان کوردەکان و مەسیحیەکانی کوردستان تا بتوانن بگەن بە مەرامەکانیان[103] و چەندان پروپاگەندەیان بلاودەکردەوە تا چاکترین خزمەت بکەن بە وولاتەکەیان چونکە چالاکی و بەشداربوونی موژدەدەرەکان لە ژیانی سیاسی کوردستان توانایەکی زۆری دەبەخشی بە بەریتانیا کە بتوانن بەئارەزووی خۆیان وا لەکاربەدەستانی عوسمانی بکەن گوێ رایەڵی سیاسەتەکانی ئەوان بن[104].

لەم ئەرکەدا موژدەدەرە فەرەنسیەکانیش پشکی خۆیان بەرکەوت کە توانیان لە ویلایەتی موسڵ چالاکی زۆر ئەنجام بدەن و رۆڵێکی زۆریان بینی

ـەژیانی رۆشنبیری ناوچـەکە و زمـانی فەرەنـسی بـووە زمـانی ئاخـاوتنی زۆر لـە رۆشنبیران و لە هـەموو ناوچـەکانی بادینـان بلاوبوونـەوە و فێـری زمـان و داب و نەریتی یەکتر بوون بە جۆرێك تێکرای ئـەو قوتابخانانـەی کـە دروسـتیـان کـرد گـەیشتە نزیکەی ٥٠٠ قوتابخانە لـەتێکرای ئیمپراتۆریـەتی عوسمـانی و نزیکـەی ٦٠هەزار قوتابی تیایاندا دەیانخوێند[١٠٥].

ئـەو مـوژدەدەرە فەرەنـسیانە رۆلێکـی کاریگـەریان بینـی لـە قولکردنـەوەی ناکۆکی نێوان کوردەکان و تایەفە مەسیحیەکان و دروستکردنی کێشەی ئەرمـەن لە کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەم[١٠٦].

شانبەشـانی دزەکردنـی سـەربازی، سیاسـی و ئـابووری روسـەکان بـۆ ناوچەکانی کوردستان لایەنی ئاینیشیان فەرامۆش نـەکرد چـونکە لەکۆتاییـەکانی سـەدەی نـۆزدەم و لـە ١٨٩٠ز روسـەکان هەلـسان بـەناردنی کۆمەلـەی ئـاینی بەروالەت سودبەخش بۆباوەرپێکردنی نەسـتوریەکان لـە پـەیرەوکردنی مەزهـەبی ئەرسـەدۆکس روسـی تـابتوانن لـەم رێگەیـەوەش دەسـەلات و هـەژمونی خۆیـان پەرەپێبدەن[١٠٧].

سێ یەم / کردنەوەی پێگەی سیاسی

زلهێزەکان لەناوچەکانی کوردستان چـەندین کونـسولخانەیان کـردەوە کەلـە پـالْ کـاری سیاسـی وەکـو سـیخورِ و دەسـت تێـوەردەر لـەکاروباری نـاوخۆیی ناوچەکە کاریان کردووە و بەرژەوەندی وولاتەکانیان خستۆتە پێش هەموو شتێك و چـاودێر وئاگـاداریش بوونـە لەسـەر بەرژەوەنـدی ولاتـەکانی تـرو کاروبـاری کونسولخانەکانیان ئەوەتا کونسولی روسی لەسالی ١٨٧٣ز بۆ بـالیۆزی روس لـە ئەستەنبۆل دەنووسێ: ((لـە بـارەی کوردەکانـەوە رۆلـی بنـەڕەتی ئینگلیزەکـان دەیگێرِن نەك تورکەکان))، هەروەها ئاماژە دەکات بەوەی کە کونسولی ئینگلیـز

کاریگەری گەورەی هەبووە لەسەرکوتکردنەوەی راپەرینەکانی کورد [دیارە لێرە مەبەستی راپەرینەکەی یەزدان شێر بووە] هەروەها کونسوڵخانەکانی ئینگلیز ناوی سەرۆك کوردەکانیان ئامادە دەکرد دەیاندا بە کاربەدەستەکان بۆ دوورخستنەوەیان[١٠٨].

کونسوڵخانە ئینگلیزیەکان لە هەموو کونسوڵخانەکانی تر چالاکتر بوونە[١٠٩] چونکە پرۆژەکانی بەریتانیا لەلایەن کونسوڵخانەکانەوە بەوردی چاودێری دەکران کە لە ناوچەکان دامەزرابوون و پشتگیریان لە هەوڵی کۆمپانیاکان و کەسانی تر دەکرد لە پێشکەش کردنی هەر پرۆژەیەك چونکە ئەم کونسوڵخانانە دەسەڵاتیان بەسەر زۆربەی لایەنەکانی ژیانی ناوچەکەدا گرتبوو[١١٠].

تا ساڵی١٨٨٠ز ئینگلیزەکان کونسوڵخانەکانی خۆیان لەشارە کوردیەکانی ئەرزەرۆم، وان، موسڵ و دیاربەکر دامەزراندبوو، کونسوڵگەری ئەرزەرۆم لە هەموویان گەورەتر بوو و ناوی (کونسوڵگەری کوردستان)ی لێنرا بوو[١١١] و دواتر کونسوڵخانەیەکی تریان کردەوە لەشاری تەرابزۆن[١١٢].

روسەکانیش لە ئەنجامی بەریەککەوتنیان لەگەڵ کورد چەندین کونسوڵگەریان کردەوە لە ناوچە کوردیەکان بۆ ئاڵوگۆری بازرگانی و نزیك کەوتنەوە لەسەرۆکە کوردەکان و چاودێری کردنی روداوەکان و ناردنی راپۆرت لەسەر کاروباری ناوچەکان بۆ وەزارەتی دەرەوە و فەرماندەی هێزەکان لەقەفقاس بۆ ئاگاداربوون و هەڵوێست وەرگرتن لەسەر هەر بارودۆخێك[١١٣]، لەساڵی١٨٧٩ز کونسوڵخانەی روسیا لە وان کرایەوە و شێخ عوبەیدوڵلا زۆر هەوڵیدا لەرێگای ئەم کونسوڵخانەیەوە پەیوەندی بەروسەکانەوە بکات[١١٤]، هەر لەهەمان ساڵدا کونسوڵخانەیەکی روسی لەشاری دیاربەکر کرایەوە و(یاکیمانکی) بووە کونسوڵی ئەم کونسوڵخانەیە[١١٥]، هەرەها کونسوڵخانەی تریان هەبوو لەشاری ئەرزەرۆم و

موسڵ، دواتر هەندێ دەفتەری کونسوڵگەری روسیا لەشارەکانی تری وەك بەدلیس،بایەزید و ئامێدی کرانەوە[١١٦].

ئەلیکسەندەر ژاپا کە رۆژهەڵاتناس و کوردناسێکی پۆلەندی بوو کونسوڵی روسیا بوو لە ئەرزەرۆم کە لە پاڵ کاروباری سیاسی گرنگی زۆری بە زمان و ئەدەب و کلتوری کوردی داوە و نزیکەی ٤٤ دەست نووسی لەسەر کورد بەزمانەکانی کوردی و فەرەنسی و تورکی کۆکردۆتەوە[١١٧].

ئەوەی پەیوەندی هەبێت بە ئەمریکاوە ئەوە لە ٧/ مایسی /١٨٣٠ز رێککەوتننامەی (دۆستایەتی و ئالوگۆری بازرگانی) لەگەڵ ئیمپراتۆریەتی عوسمانی مۆرکرد، بەندی دووەم لەم رێککەتنە رێگا دەدات بە ئەمریکیەکان کە کونسوڵخانەکانی خۆیان بکەنەوە لە هەر شوێنێکی ئیمپراتۆریەتەکە کە خۆیان دەیانەوێ[١١٨]، بەڵام لە کوردستان ئەم کونسوڵخانانە دواترکرانەوە بە تایبەتی دوای کوژرانی (لینتسی) موژدەدەری ئەمریکی لەساڵی ١٨٩٥ز ئەمە بووە بیانویەك کە کونسوڵخانەیەکیان لە ئەرزەرۆم کردەوە و خۆشیان ئامادەکرد لە خارپوت کونسوڵخانەیەکی تر بکەنەوە[١١٩].

فەرەنسیەکانیش بێ بەش نەبوون لەم لایەنەوە بەمەبەستی پاراستنی بەرژەوەندیەکان و ئاگادار بوون لەم ململانێیە بە هێزەی نێوان زلهێزەکان لەسەر خاکی کوردستانی عوسمانی و وریای لە لێژنەی دیاریکردنی سنوری ئێران - عوسمانی، هەڵسا بەکردنەوەی کونسوڵخانەی فەرەنسی لەشاری ئەرزەرۆم[١٢٠]، هەروەها کونسوڵگەریەکی تر لە موسڵ و لە شاری دیاربەکریش بنکەی زانیاری دانا بوو[١٢١].

ئەڵمانیەکان درەنگتر لە زلهێزەکانی تر هاتنە کوردستان بەڵام هەر بەوە راگەیشتن کە کونسوڵگەری خۆیان بکەنەوە لەنیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەم بۆ

ئەم مەبەستەش كونسوڵخانەیەكیان لەشاری(موسڵ) كردەوە بۆ كاروباری سیاسی و سیخوری و بەرژەوەندیە باڵاكانی وولاتەكەیان لە ناوچەكە[١٢٢].

چوارەم / ململانێی نێوان زلهێزەكان و پاراستنی هاوسەنگی هێز

سەدەی نۆزدەم سەدەیەك بوو لەململانێی توندی داگیركاری بۆچەسپاندنی دەسەڵات بەسەر ئیمپراتۆریەتی عوسمانی و كوردستانیش وەك بەشێك لەم ئیمپراتۆریەتە لەنێوان بەریتانیا و روسیا بەتایبەتی وەفەرەنسا و ئەلمانیا كەمتر لەوان[١٢٣]، نەك هەر ئەوەندە بەڵكو دوای هاتنیشیان هەر لەململانێ دابوون بۆكەمكردنەوەی دەسەڵاتی ئەوانی تر و پاراستنی هاوسەنگی هێز جاراستەوخۆ بێت واتا داگیركردنی سەربازی یان نا راستەوخۆ بێت وەكو هەژمونی سیاسی، ئابووری[١٢٤].

روسەكان بەهۆی نزیكی سنورەكەیان لەكوردستان لەهەردوو بواری سیاسی و سەربازییەوە هاتنە ژوورەوە، لەرێگای ناراستەوخۆ (ئایینی، سیاسی، ئابووری) پێشتر باسمان لێوەكرد، بەلام لەرێگای راستەوخۆ لەئەنجامی ئەو جەنگانەی كەلەگەڵ ئیمپراتۆریەتی عوسمانی ئەنجامی دەدا چەندین ناوچەی كوردستان كەوتە دەستی روسیا كەهەر لەشەری ساڵی(١٨٠٤–١٨٠٥) لەگەڵ كورد بووە هاوسنور[١٢٥] و لەجەنگی ١٨٢٨–١٨٢٩ز ناوچەیەكی فراوانی كوردستان كەوتە ژێر دەسەلاتی روسیا[١٢٦].

لەجەنگی قەرم سنورەكانی كوردستان بووە بەشێك لە مەیدانەكانی جەنگ، روسەكان هەوڵی ئەوەیانداوە كوردە نیشتەجێكانی سنور بۆخۆیان رابكێشن یا بێ هەڵوێست بن لەجەنگەكە بۆ ئەم مەبەستە (كنیاز قارە نتسۆڤ)[١٢٧] داوای دابین كردنی بودجەیەك دەكات لە حكومەتی روسیا بە مەبەستی پەیوەندی كردن بە كوردەكانەوە تا بیانخاتە ژێر فەرماندەیی خۆی[١٢٨] لەمەشدا تا

ئاستێکی باش سەرکەوتوو بوون کەتوانیان دوو فەوج لە کورد پێکبهێنن کە هەریەکەیان بریتی بوو لە پێنج سەد سوارە یەکێکیان بەفەرماندەیی جەعفەر ئاغاو ئەوەیتر بەفەرماندەیی ئەحمەد ئاغا بوو بە سەرپەرشتی لۆریس میلیکۆف[١٢٩] ئینجا لەتشرینی دووەمی ١٨٥٥ز روسەکان توانیان قەڵای پتەوی قارس داگیربکەن لەرۆژهەڵاتی ئەنادۆڵ[١٣٠].

لەماوەی جەنگی قەرم ودواتر، ململانێی نێوان زلهێزەکان شێوەیەکی ئاشکرای وەرگرت و بەریتانیەکان و فەرەنسیەکان هەموو جۆرە یارمەتیەکیان پێشکەش بەعوسمانیەکان دەکرد تابتوانێ بەرەورووی روسەکان بوەستێت ئەمەش بواری بۆ فەرەنسی و ئینگلیزەکان زیاتر رەخساند تادەست لەکاروبارەکان وەربدەن[١٣١] بەجۆرێك تاساڵانی حەفتاکان روسیاو بەریتانیا چالاکیەکانیان لەکوردستان زیاتر دەبوو[١٣٢].

جارێکی تر لە ٢٤ی نیسانی ١٨٧٧ز روسیا جەنگی راگەیاند دژی عوسمانیەکان[١٣٣] لەمانگی نیسان و ئایاری ١٨٧٧ز سوپای روس توانیان دەست بگرن بەسەر(ئەردەهان و بایەزید و دیادین) وەگەمارۆی (قارس)یاندا، ئینجا رویان کردە ئەرزەرۆم[١٣٤]، بەریتانیەکانیش لەم جەنگەدا یارمەتی تەواویان پێشکەش بەعوسمانی دەکرد تا بتوانێ رێگا بگرێت لە روسەکان، جەنەراڵ (کەمبیل) سەر بالیۆزی بەریتانی لەبەغدا بە پەلە دێتە ئەرزەرۆم بۆ رێکخستنی ئەو هێزەی لە ناوچەکە ئامادە کرابوو، کاتێك کەروسەکان لە١٨ی تشرینی دووەمی ١٨٧٧ز قارس[١٣٥] داگیردەکەن جەنەراڵ (کەمبیل) بەدیل دەگیرێت[١٣٦] بەجۆرێك لەکۆتایی ئەم جەنگەدا هێزی روسەکان گەیشتە قوڵایی ئاسیای بچووك و دەستیان گرتبوو بەسەر بەشێکی گەورەی کوردستاندا[١٣٧].

بەریتانیا بەتوندی دژی ئەم سیاسەتەی روسیا وەستا چونکە دەبووە هۆی تێکچوونی هاوسەنگی هێز لەناوچەکە، سیاسەتی بەریتانیش هەر لەکۆنەوە ناسراو بوو بەپاراستنی هاوسەنگی هێز بەدرێژایی سەدەی نۆزدەم ئەم سیاسەتەی پەیرەوکردووە[128] و هەریەك لەعوسمانی و بەریتانیەکان هەوڵی ئەوەیان دەدا کەکوردەکان کێش بکەن بۆلای عوسمانی تاهاوکاریان بکەن دژی روسیا[129].

بەستانی پەیمانی سان ستیڤانۆ لەساڵی ١٨٧٨ز لەنێوان روسیا و عوسمانی زیاتر بەریتانیای سەغڵەت کرد، چونکە بەپێی ئەم پەیمانە قارس و ئەردەهان و ئەرزەرۆم کەوتنە دەست روسیا ئەمەش هەڕەشەیەکی راستەوخۆ بوو لەسەر بەریتانیەکان چونکە روسەکان گەیشتنە باشوری کوردستان و کەنداوی فارس ئەمەش رێگاگرتنە لەبەریتانیا بۆگەیشتن بەهند لەمسر و کوردستانەوە بۆیە پەیوەندیە نێودەوڵەتیەکان شڵەژان و نێوان زلهێزەکان بەرەو گرژی تێکچوو تادواتر لەسەر پێشنیاری بسمارك کۆنگرەی بەرلین بەسترا کەشوێنی پەیمانی سان ستیڤانۆی گرتەوە کەمەبەست تیایدا گێرانەوەی هاوسەنگی هێزبوو[140].

کێشە سنوریەکانی نێوان ئێران و عوسمانی کە کوردستان زۆرترین بەشی پێکدەهێنێ هەر کاتێك هەوڵی چارەسەرکردنی درابێ ئەوا نوێنەری روسیاو بەریتانیا ئامادەبیان هەبووە تیایدا بەتایبەتی لەدوای جەنگی قەرم ١٨٥٣–١٨٥٦ز[141]، تا کێشەو ناکۆکیەکانی نێوان ئێران و عوسمانی بۆتە کێشەو ناکۆکی نێوان بەریتانیاو روسیا بەتایبەتی لەناوچە سنوریە کوردنشینەکان وەکو کێشەی(قوتور)[142] کەروسەکان دەیانویست بۆئێران بێت و بەریتانیەکانیش دەیانویست بۆ عوسمانیەکان بێت ئەمەش لەبەر گرنگی ناوچەکە کەهەردوولا دەیانتوانی لەوێوە هێرش بکەنە سەرناوچەکانی قەفقاس[143].

لەکۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەم هاتنی ئەلمانەکان بۆناو ململانێکانی چەسپاندنی دەسەلات بارودۆخەکەی ئالۆزتر کرد ئەوەی هاتنە ژوورەوەی ئەلمانەکانی ئاسانتر دەکرد بۆ کوردستان تا ململانێی زلهێزەکانی تر بکات و هاوسەنگی هێز بۆ بەرژەوەندی خۆی لاسەنگ بکات پشتگیری سولتان عەبدولحەمیدی دووەم بوو بۆ ئەلمانەکان(١٤٤)، لەساڵی ١٨٨٩ز قەیسەری ئەلمانی گەشتێکی بۆ دەولەتی عوسمانی کرد ئەمەش بەریتانی و روسەکانی ترساند چونکە هەستیان بەوە کرد کە ئەمە هەرەشەیەکە بۆ سەر بەرژەوەندیەکانی ئەوان ئەم بۆچوونەش راست بوو ئەلمانەکان لەکوردەکان نزیک کەوتنەوە و نیکۆلای دووەم بانگهێشتی سەرکردە کوردەکانی وەك جەعفەر ئاغای شکاك، عەبدولرەزاق بەدرخان و سەید تەهای نەهری کرد و زۆر دیاری پێبەخشین و بەڵێنی زۆری پێدان ئەمەش بەمەبەستی ئەوەی کەبتوانێ دەسەلاتی ئەلمانەکان لەناوچە کوردیەکان پەرەپێبدات تا ململانێی روسی و بەریتانیەکان بکات(١٤٥).

پێنجەم / کێشەی ئەرمەن

کێشەی ئەرمەنەکان ئەو هۆکار و رێگایە بوو کەزلهێزەکانی روسیا سەرەتاو دواتر بەریتانیا و ئینجا ئەلمانەکان بەکاریان هێنا بۆدەست خستنە ناو کاروباری ناوخۆیی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی و لەژێر پەردەی پارێزگاری کردن لەئەرمەنیە مەسیحیەکان لەدەستی کوردەکان، لەراستیدا ئەم بەرگریکردنە هیچ سودێکی ئەوتۆی نەبوو بۆئەرمەنەکان چونکە هەریەکێك لەو وولاتانە بەدوای بەرژەوەندیە تایبەتیەکانی خۆی کەوتبوو(١٤٦)، ئەگینا لەسەرەتادا ئەرمەنەکان لەکاروبارەکانی ئابوری و سەربازی دەولەتی عوسمانی کاریان دەکرد و بەشارەزایی خۆیان گەیشتبونە پلەی بەرز بەلام پشتگیری زلهێزەکان لەئەرمەنەکان سولتانی عوسمانی ترساند بۆیە ئەم کێشەیە لەوەی کەهەبوو گەورەتر بوو(١٤٧).

هەر بەمەبەستی گەیشتن بەمەرامەکانیان زلهێزەکان لەهەردوو ڕێککەوتننامەی سان ستیڤانۆ بەندی(١٦)و بەرلین بەندی(٦١) جەختیان لەسەر جێبەجێکردنی چاکسازی دەکردەوە لەناوچە ئەرمەن نشینەکان و ئەو شارانەی کەدیاریکرا بوون (وان، بەدلیس، ئەرزەڕۆم، دیاربەکر، خارپوت وسیواس) کە بەناوچەی ئەرمەن دانرابوون، بەلاّم لەراستیدا ئەم شارانە شاری کوردین و ئەرمەن تیایدا کەمینەن[١٤٨]، بەلاّم دیارە لێرەدا زلّهێزەکان تەنها مەبەستیان دروستکردنی ناکۆکی و کێشەیە لەنێوان کورد و ئەرمەن.

بەندەکانی ڕێککەوتننامەی بەرلین ١٨٧٨ز ئەو مافەیدا بە زلهێزەکان تا دەست بخەنە ناو کاروباری کوردستان بە بیانوی پاراستنی ئەرمەنەکان[١٤٩]، ئەمەش هەر ئەوەبوو کەزلهێزەکان دەیانویست، ئینجا بەریتانیا بەمەبەستی دورخستنەوەی سۆزی ئەرمەنەکان لەروسیا و بەکارهێنانی مەسەلەی ئەرمەن بۆدزەکردنی دەسەلاّتی زیاتری بۆ کوردستان ئەرکی سەرپەرشتیکردنی بەجێگەیاندنی ئەو چاکسازیانەی گرتە ئەستۆی خۆی کە دەبوایە لە ناوچە ئەرمەن نشینەکان ئەنجام بدرێت لەلایەن ئیمپراتۆریەتی عوسمانی[١٥٠]، دواتر بە کردارەکی بەریتانیەکان داوایان لە روسیا کرد کە رازی بێت کەشتیگەلی ئینگلیزی بێتە ئەستەنبۆلّ تاسولّتان ناچار بکەن داخوازی ئەرمەنەکان جێبەجیّ بکات، قەیسەری روسی لەم داوایە ترسا کەببێتە سۆنگەی زێدەبوونی دەسەلاّتی بەریتانیەکان بۆیە بەهاوکاری فەرەنسیەکان ئەم داوایەی بەریتانیەکانیان رەتکردەوە[١٥١].

زلهێزەکان سووربوون لەسەر بەکارهێنانی ئەرمەن وەکو کارتێك بۆبەرژەوەندی خۆیان لەکوردستان وەدەیانویست خاکی کوردستان بکەن بەخاکی ئەرمەنستان تازیاتر هەژموون و دەسەلاّتیان بخەنە سەر ناوچەکە، بۆ

ئەم مەبەستەش لە ساڵی١٨٨٠ز حکومەتەکانی روسیا و بەریتانیا و فەرەنسا و هەندێ دەوڵەتی تر لەوەلامی نامەیەکدا کەعوسمانی لەبارەی ئەرمەنەکانەوە بلاوی کردبووە یاداشتێکیان بەدەوڵەتی عوسمانیدا کەتیایدا هاتووە : "لەبەرئەوەی ئەو کوردە کۆچەریانەی کەلەکێوەکان دەژین هەر بۆ ئاژاوە نانەوە دژی مەسیحییەکان بۆ پێدەشتەکان دێنە خوارەوە پێویستە لەم سەرژمێریەدا حیساب نەکرێن کە بۆ دەرکەوتنی زۆرایەتی دانیشتوانی ئەو مەڵبەندە دەکرێت"[١٥٢].

تەوەری سێیەم :ـ

هەڵوێستی زلهێزەکان لەرووداوە ناوەخۆییەکانی کوردستانی عوسمانی

یەکەم / راپەرینی یەزدان شێر ١٨٥٣ـ١٨٥٦ز

جەنگی قەرم ١٨٥٣ـ١٨٥٦ز لە نێوان روسیاو عوسمانی هەلێکی بۆ کورد رەخساند بۆ گێرانەوەی دەسەلاتی لە دەست چووی پێشتریان بۆیە راپەرینێك لەژێر سەرکردایەتی یەزدان شێر بەرپابوو کە یەکێك بوو لە ئەندامانی بنەماڵەی میرەکانی بۆتان[١٥٣]. هەر لەسەرەتای راپەرینەکەدا یەزدان شێر پاڵپشتی وپشتگیری وولاتە زلهێزەکانی بەلاوە گرنگ بوو وهەستی بەکاریگەریان کردبوو[١٥٤]. بۆیە هەر لەوکاتەی کەروسەکان گەیشتنە بایەزید یەزدان شێر پێنج جار پەیوەندی پێوەکردن[١٥٥]. لە یەکێك لە پەیوەندیەکان یەزدان شێر پەیامێکی رەوانکرد بۆ فەرماندەی هێزەکانی روسی وپێشنیاری هاوپەیمانی کرد لەنێوانیان بۆ تێکشکاندنی هێزێکی قورسی عوسمانی لەناوچەی ئەرزەرۆم[١٥٦]. نێردراوەکانی داوای یارمەتی سەربازیان دەکرد لەروسەکان[١٥٧] بەلام هەموو ئەو هەولانە بێ سود بوون وروسەکان ئامادە نەبوون یارمەتی کورد بدەن[١٥٨] تەنها لەناوچە سنوریەکانیان نەبێت ئەویش بۆ بەرژەوەندی تایبەتی خۆیان نەوەکو

کـورد کێـشەیان بۆبنێتــەوە. لـەم ڕووەوە (مـۆرا فیـۆڤ) فەرمانــدەی فەیلــەقی قەفقاسی ڕوسی لـە کۆتـایی سـاڵی ١٨٥٤ز پێـی وابـوو کەبزوتنەوەکـەی کـوردان لەبەرژەوەندی ئەواندا نیەو کـوردەکـان تـەنـها بـۆ داکۆکی کردن لەوڵاتەکـەیان شەڕ دەکەن وناتوانرێ پشتیان پێ ببەسترێ[١٥٩].

کەواتە دەکرێ بڵێین هەڵوێستی ڕوسەکان بەرامبەر بە ڕاپەڕینەکەی یـەزدان شـێر هەڵوێستێکی دوژمنانە بووەو نەك هەر ئەوەندە بەڵکو هەوڵی ئەوەشیان داوە کـە لەناوی ببەن وەك لەیەکێك لەچـاو پێکەوتنـەکانی یـەزدان شـێر لەگـەڵ (ببوتۆڤ) ی لێپرسراوی ستادی سوپای ڕوسیا لە قەفقاس دەردەکەوێت کە داوای ئەوەی لە یەزدان شێر کرد تـا هێزەکـەی بـلاوە پێبکـات و واز لـە جموجۆڵەکـەی بهێنێ نەك هەر ئەوەندە بگرە لەماوەی سـەرهەڵدانی ڕاپەڕینەکـەی یـەزدان شـێر کە هاوکاتی جەنگی قەرم بوو تێبینی دەکرێت کە ڕوسەکان هێرش و فـشارەکانی خۆیان بۆ سەر عوسمانیەکان کەم کردۆتەوە تا عوسمانیەکان بتوانن هەنـدێك لـە هێزەکانی خۆیان لە بەرەکانی بەرامبەر ڕوسیا بکێشنەوە بۆ دامرکاندنەوەی ئـەم ڕاپەڕینـە[١٦٠]، بـە دان پیانـانی ئـەڤێریانۆڤ کـەدەڵێ: ((زسـتانی ١٨٥٤ـ١٨٥٥ بەشێکی زۆری سوپای تورکیا لەبەرەکانی بەرامبـەر بـە ئێمـە بـۆ سـەرکوتکردنی یەزدان شێر بـۆ کوردسـتانی مـەزن کشانەوە بـەلاّم ئێمـە نـەمانتوانی کـەڵك لـەم بارودۆخە وەربگرین))[١٦١]، هەروەها هەواڵێکی تر هەیە کـە دەڵێـت ئـەو نامانـەی کە یەزدان شێر ڕەوانەی کردووە بۆ سەرکردەکانی ڕوسی لەکات وشـوێنی خۆیـدا نەبووە بەبیانوی ئـەوەی کـەهێزەکانی ڕوس ئـەو کاتـە کشاونەتەوە بـۆ شـوێنی زستانە لەهەرێمی ئێرەڤان بۆیە نامـەکان دوا دەکـەون[١٦٢]، بـەلاّم ئەمانـە هـەموو بیانوی نابەجێن چونکە دیارە کە یەکدەنگیەکی نێو دەوڵەتی هەبووە بۆ یارمەتی نەدانی یەزدان شێر و ڕاپەڕینەکەی.

بەریتانیەکان هەڵوێستێکی جیاواز تریان هەبوو لەروسەکان چونکە ئەوان نەك هەر دژایەتی راپەرینەکەیان کرد بگرە لەعوسمانیەکان زیاتر هەوڵیاندەدا دایبمرکێننەوە[١٦٣] چونکە ئینگلیزەکان لەو باوەرە دابوون کە راپەرینەکەی یەزدان شێر دژی بەرژەوەندیەکانیانە و فەرمانیان بە دیبلۆماتکارەکانیان کرد کە ئاستەنگ بخەنە پێشی و بەڵێنی پشتیوانی و دارایشیان پێداون[١٦٤] و هەوڵیاندا کە سەرکردە کوردەکان هانبدەن لە دژی یەزدان شێر، لەم کارەشدا تا ئاستێك سەرکەوتو بوون[١٦٥] دیارە کەسیاسەتی بەریتانیای ئەو کاتە بریتی بوو لە (پارێزگاری کردن لە رەوشی ئێستا)[١٦٦].

(نەمرود رەسام)[١٦٧] سەرەتا لە شێوەی دۆستێك خۆی گەیاندە یەزدان شێر[١٦٨] هەوڵیدا رازی بکات بۆ گفتوگۆ لەگەڵ عوسمانیەکان تاکێشەکانیان چارەسەربکەن[١٦٩] داوای لێکرد کەسەر لەکونسوڵخانەی بەریتانیا بدات لەموسڵ یەزدان شێریش باوەری بەقسەکانی کردو چووە موسڵ بۆگفتوگۆکردن[١٧٠] سەرەتا یەزدان شێر لەکونسوڵخانەکە گلدرایەوە وەك دەستبەسەر بۆماوەی(٥) مانگ تافەرمان لەبالیۆزخانەی بەریتانیا لەئەستەنبۆلەوە هات بۆ تەسلیم کردنی بەوالی موسڵ، ئەویش فەرمانی پێکرا کەبینێرێت بۆ ئەستەنبۆڵ[١٧١]، بەم شێوەیە راپەرینەکەی یەزدان شێر لەرێگای بەریتانیەکانەوە کوژێنرایەوە[١٧٢].

جگە لەلایەنی سیاسی بەریتانیەکان یارمەتی سەربازیشیان پێشکەش بە ئیمپراتۆریەتی عوسمانی کردووە بۆ دامرکاندنەوەی راپەرینەکەی یەزدان شێر چونکە دەبینین کە فەرماندەی تۆپخانەی سوپای عوسمانی کەسێکی بەریتانی بوو کە لە دژی یەزدان شێر کاری دەکرد[١٧٣].

بە پێی یەکێك لە راپۆرتەکانی کونسولگەری روسیا کەرەوانی کردووە بۆ وەزارەتی دەرەوە لە (بترسبورگ) و فەرمانەدەی گشتی ناوچەکانی قەفقاس

ئاماژە دەکات بە بەشدار بوونی ژمارەیەك لەچەکدارە عەرەب و ئەرمەنەکان و ئاشوریەکان لە راپەڕینەکەی یەزدان شێر کە ناوچەکانی موسڵ و وانی گرتۆتەوە و نزیکەی ١٠٠ هەزار چەکداری هەبووە و عوسمانیەکان نەیانتوانیوە بەسەریدا زاڵ بن تەنها بە یارمەتی راستەوخۆی بەریتانیەکان نەبێت(١٧٤).

هەروەها بەپێی بەڵگە نامەیەکی عوسمانی بەکلیلی ٨ ٤٨ AMKI um٢١٠ m ١٢٧ دەڵێ : "بەپێی داواکاری کونسولی ئینگلیزی دەسەڵاتدارە حکومیەکان دەتوانن یەزدان شێر وەربگرن کە لە لای ئەوان دەست بەسەرە لە موسڵ و بیگوازنەوە بۆ بنکەی رێکخستنەکانی عوسمانی لە شاری موسڵ و جەنابی کونسول داوا دەکات کە ناوبراو ئازار نەدرێت"(١٧٥).

کەواتە گەر هەڵوێستی بەریتانیا و روسیا نەبوایە بەرامبەر بەراپەڕینەکەی یەزدان شێر لەوانە بوو ئەنجامی راپەڕینەکە بە ئاقارێکی تردا بڕۆیشتبوایە و ئەنجامێکی زیاتری دەبوو لەو ئەنجامەی کەپێی گەیشت کە بەهۆی یارمەتی زۆر جددی زلهێزەکانەوە راپەڕینەکەی یەزدان شێر بێ بەرهەم ماوە(١٧٦).

دووەم / راپەڕینی کوڕانی بەدرخان

لەماوەی ژێر لێکۆڵینەوە دوو راپەڕینی کوڕانی بەدرخان روویدا، یەکەمیان لەساڵی ١٨٧٩ بوو کەجەنگی روسی ـ عوسمانی ١٨٧٧ـ١٨٧٨ز هەلی بەرپابوونی رەخساند بەسەرکردایەتی (عوسمان پاشاو میرحوسێن) کە لەناوچەی (جزیرە) جاری سەربەخۆییانداو عوسمان پاشا بووە میرو دەسەڵاتیان گەیشتە (جۆلەمێرگ و ئاکرێ و ماردین)(١٧٧)، راپەڕینی دووەم لەساڵی ١٨٨٩ز روویدا بەسەرکردایەتی ئەمین عالی ومەدحەت پاشا کە لەئەستەنبۆڵەوە خۆیان گەیاندە (تەرابزۆن) و پەیوەندیان بەسەرۆك هۆزو عەشیرەتە کوردیەکانەوە کرد بۆ دەستکردن بەراپەڕین بەڵام هێزەکانی عوسمانی چاودێریان دەکردن و لەئەنجامدا

پێکدادان لەنێوانیان روویدا راپەرینەکە پێش لەدایك بوونی مرد[١٧٨]، ئەم راپەرینانە نەگەیشتنە ئاستی راپەڕین و شۆڕشەکانی وەکو یەزدان شێر و شێخ عوبەیدوللاّ و لەرووی فراوانی و کاریگەری[١٧٩]، لەبەر ئەوەی دوو بزوتنەوەی ناوچەیی بوون و گوزارشتیان لەبەشێکی خواستەکانی کورد دەکرد[١٨٠] هەروەها ماوەی راپەرینەکان کەم بوو راپەڕینی یەکەم تەنیا هەشت مانگی خایاند راپەڕینی دووەم هەر لە سەرەتادا دامرکاوە، کاریگەریان نەکردە سەر بەرژەوەندی زلهێزەکان بۆیە نەیانتوانی سەرنجی زلهێزەکان رابکێشن[١٨١] بۆیە هەڵوێستی نێودەوڵەتی شتێکی ئەوتۆی لێ ناخوێنرێتەوە چونکە هیچ یەکێك لەو راپەرینانە شێوەیەکی گشتگیری وەرنەگرت یان سەرکردەکانی راپەرینەکان خۆیان نەیانویستوە پەیوەندی بکەن بە زلهێزەکانەوە بەهۆی هەڵوێستیان بەرامبەر بە کورد و شۆڕشەکانی پێشووتر.

لەکاتی رووداني راپەرینەکان پێویستی نەکردوە کە زلهێزەکان بێنە ناوەوە بەڵام کونسولگەری زلهێزەکان ئاگاداری سەرووی خۆیان کردۆتەوە لە بارودۆخەکان وەك سەر کونسولی روسیا لە ئەرزەڕۆم (ئەبیر میللەر) بۆ بالیۆزی روسی لە ئەستەنبۆڵ دەنووسێ : ((کوردەکان ئەو سەربەخۆییەیان نەماوە کە لەکاتی بەدرخاندا هەیان بوو، ئێستا راپەڕیون بۆ ئەوەی ئەو سەربەخۆییە بەدەست بهێننەوە))[١٨٢]، بە بڕوای یەکێك لە نووسەران روسەکان یەکێك لە هۆکارەکانی دامرکانەوەی راپەڕینی یەکەم بوون چونکە هەوڵیاندا هەموو ئەو دەستانە دووربخەنەوە کە یارمەتی راپەرینەکە دەدات[١٨٣] و هیچ دەستێکی یارمەتیان بۆ ئەم راپەرینە درێژنەکرد[١٨٤].

عەبدولرەزاق بەدرخان کاتێك کەپلان دادەنێ تا شتێك بەشتێك بکات بۆ کورد هانا دەبات بۆ (نێلیدۆڤ) بالیۆزی روسیا لە ئەستەنبۆڵ کە بەرنامە و پلانی خۆی

پـێ دەڵێـت دەینێـرن بـۆ تـەفلیس بـۆلای گریـازنۆڤ بـەڵام لەکۆتاییـدا ئـەویش هەوڵـەکانی بـێ سـوود دەبـن چـونکە سـوڵتان عەبدولحەمیـدی دووەم لـە چاوپێکەوتنێکیدا لەگەڵ قەیسەری روسیا داوا لەقەیسەر دەکات کەعەبدولرەزاق بـەدرخان لەناوچـەی قـەفقاس دوور بخاتـەوە چـونکە خـەریکی جموجۆڵـە دژی دەوڵەت، بۆیە لـەم هەوڵەشـدا روسـەکان پـشتیان لـە کوردەکـان کـرد و کردیانـە قوربانی بەرژەوەندیەکانیان[١٨٥].

سێیەم / شۆڕشی شێخ عوبەیدوڵلای نەهری

شۆڕشی شێخ عوبەیدوڵلاش وەکو شۆڕش و راپەرینەکانی تر هۆکاری دەرەکی کاریگـەری هـەبوو لەسـەر جولانـدنی چـونکە دوای جـەنگی روسـی - عوسمـانی ١٨٧٧ـ١٨٧٨ز بـارودۆخێکی خراپـی ئـابووری و کۆمەڵایـەتی و سیاسـی ناوچـە کوردیـــەکانی گرتـــەوە و وەکـــو ئـــەنجامێکی ئـــەم جەنگـــەش شۆڕشـــەکە سەریهەڵدا[١٨٦].

شـێخ عوبەیـدوڵلا هـەر لەسـەرەتادا هەوڵیـداوە کـە پەیوەنـدی بکـات بەزلهێزەکانەوە بۆ ئەوەی پشتگیری بکەن لە شۆڕشەکەی بەتایبـەتی روسـیا کـە دەڵـێ: ((پیـاو بـۆ دۆسـتایەتی شـێر هەڵدەبـژێرێ نـەك رێـوی))، دیـارە لێـرەدا روسیای بەشێر چواندوە و بەریتانیاشی بەرێوی چواندوە بۆیـە (یوسـف ئاغـا) ی نوێنەری دەنێرێت بۆلای قونسوڵی روس لە (وان) و چەند جارێکیش پەیوەندی بە (ئـویتر میلـی) ی قونـسولی روسـیا کردبـوو لـە (ئـەرزەرۆم) بـۆ بەدەسـتهێنانی پشتگیری لە شۆڕشەکەی[١٨٧] و پێی گوتبوون ئەگـەر پـشتیوانی لێ نەکـەن ئـەوە لەگەڵ ئینگلیزەکان دەبێتە هاوپەیمان[١٨٨]، سەرەتا شێخ هانای بۆ روسەکان برد و بەریتانیای پشت گوێ خست ئەمەش لەبەر چەند هۆکارێك :-

١ـ سەرکەوتنی روسیا بەسەر عوسمانی لە جەنگی ١٨٧٧ـ١٨٧٨ز.

٢ـ دووری بەریتانیا لە کوردستان لەروی جوگرافیەوە.

٣ـ هەڵوێستی بەریتانیا بەرامبەر بەبزوتنەوە کوردیەکانی وەکو یەزدان شێر.

شێخ بۆ روسەکانی روونکردەوە کە دەتوانی رۆڵێکی گرنگی هەبێت لە ئەگەری هەڵگیرسانی جەنگ لە نێوان روسیا و بەریتانیا لەبەر ئەوەی ناوچە ستراتیژیەکان و بەندەرەکان لە دەستی کوردن، لە بەرامبەردا کۆنسوڵی روس لە وان (کەمساراکان) داوای لە شێخ کرد کە داواکانی خۆی بخاتە بەردەمی عوسمانیەکان چونکە پەیوەندی روس و عوسمانی پەیوەندیەکانی باش بوو[189]، کەواتە روسەکان لەگەڵ شۆڕشەکەی شێخ عوبەیدوڵلا نەبوون چونکە ئەم شۆڕشە دەبووە هۆی بێبەش بوونی روسیا لە هەندێك لە بەرهەمەکانی جەنگی ١٨٧٧ـ١٨٧٨ز لەلایەکی تریش روسەکان لەوە دەترسان کە ئەم شۆڕشە ببێتە هۆی زیاد بوونی نفوزی بەریتانیا لە ناوچەکە[190].

کاتێك شۆڕشەکەی شێخ لە رۆژهەلات پەرە دەسەنێ و لە توانای دەسەلاتدارانی ئێران نیە کە بەسەریدا زاڵ بن حکومەتی ئێران بەناچاری داوا لەروسیا دەکات کە فشار بخاتە سەر ئیمپراتۆریەتی عوسمانی بۆ ئەوەی سەرکوتی شێخ عوبەیدوڵلا بکات ئەوە بوو لە ١٨/تشرینی یەکەمی/١٨٨٠ز ئەلیکساندەری دووەم بەدەنگ داواکەی ئێرانەوە چوو و داوای لە باڵیۆزی خۆی لە ئەستەنبۆڵ کرد کە حکومەتی عوسمانی لەدژی کورد هان بدات و لە ئەنجامدا لە تەمموزی ١٨٨١ز توانیان شێخ ناچاری خۆبەدەستەوەدان بکەن و گواستیانەوە بۆ ئەستەنبۆڵ[191] دواتر بە پاسەپۆرتێکی ساختە لە رێگای کەشتیەکی روسی دەگەڕێتەوە کوردستان و بەپێی هەندێك سەرچاوەی تر کەشتیەکی فەرەنسیە[192]، کاتێك دەگاتەوە کوردستان لە ١٨٨٢ز جارێکی تر هەوڵیدا لەرێی نوێنەرەکەیەوە (عەلی قاسم ئۆغلو) تا لەروسیا نزیك بێتەوە

ئەویش لەرێی کونسولگەری روسیا لە شاری وان بەلآم دیسان ئەم هەولآنە بێ سوود مانەوە[١٩٣] بۆیە دوای مانگێك لە گەرانەوەی شێخ جارێکی تر دەستگیر کرایەوە لەسەر داوای نەسرەدین شای قاجاری و فشاری روسیا کە سوڵتانی عوسمانی بریاری دوور خستنەوەی شێخی دا[١٩٤].

شێخ پشتگیری وپاڵپشتی بەریتانیەکانیشی بەلاوە گرنگ بووە ئەوەتا لەچاوپێکەوتنێکدا لەگەڵ (ئاپوت)ی کونسوڵی ئینگلیزی لەتەورێز لەساڵی ١٨٨٠ز شێخ رایگەیاند کە ئەو پێویستی بەپاڵپشتی واتایی بەریتانیا هەیە بۆ کارەکەی[١٩٥] لەبەرامبەریشدا بەریتانیەکان هەر لەسەرەتاوە چاودێری خۆیان خستبووە سەر جموجۆڵەکانی شێخ چونکە بەراستی ئەوان دژی رووودانی هەر شۆرشێك بوون لەبەشە عوسمانیەکە بۆ ئەم مەبەستەش کونسوڵی بەریتانی (کلایتۆن) دووجار سەردانی شێخی کرد لەشەمدینان و لەسەردانی دووەم زۆر بەراشکاوانە هەڵوێستی وولآتەکەی دەربڕی وگووتی:)(حکومەتەکەم لەگەڵ ئەوەدا نیە کەهیچ کێشەو ئاژاوەیەك روویدات کەببێتە هەرەشە بۆ سەر یەکێتی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی دۆست))[١٩٦]، بۆیە دەتوانین بڵێین کە یەکێك لەهۆکارەکانی گۆرینی ئاراستەی شۆرشەکەی شێخ بۆ کوردستانی ئێران هەڵوێستی بەریتانیا بوو، هەروەها کرستیان رەسامیش سەردانی باشقەلای کرد کە یەکێك بوو لە بارەگاکانی شێخ لە ساڵی ١٨٧٩ز[١٩٧].

بەریتانیەکان بەوردی ئاگاداری جموجۆڵەکانی شێخ بوون و لە هەر جولانەوەیەکیدا هەڵوێستێکیان هەبووە بۆ نموونە کاتێك لەساڵی ١٨٨٠ز شێخ عوبەیدوڵلآ کۆبوونەوەیەکی بۆ سەرۆك خێڵەکان رێکخست لە گوندی نەهری و بریاردرا بەپێکهێنانی (کۆمەڵەی خێلە کوردیەکان) ئینگلیزەکان ئەم بریارەیان

پێ ناخۆش بوو و هەندێ ئەندام پەرلەمانی بەریتانی ئەم مەسەلەیەیان ورووژاند و هانی حکومەتیاندا کە زیاتر دژایەتی کورد بکات[198].

کاتێك شێخ بۆجاری دووەم دەست بەسەر دەکرێت بەریتانیەکان بەکەشتیەکی خۆیان لەساڵی١٨٨٣ز دەیگوازنەوە بۆ(ئەسکەندەرونە)و لەوێشەوە بەپاپۆرێکی تری بەریتانی دەیگەیەننە (بەیروت)[199].

هەر بۆمەبەستی بەدەستهێنانی پشتگیری زلهێزەکان شێخ هەوڵیدا مەسیحیەکان بەلای خۆیدا رابکێشێ تا ئەو ولاتانەی کەپارێزگاری لەمەسیحیەکان دەکەن لەخۆی نزیك بکاتەوە بۆیە کەوتە گفتوگۆکردن لەگەلْ (مارشیمون) سەرۆکی تایەفەی ئاشوری بەلام ناوبراو رازی نەبوو کە مەسیحیەکان بەشداری شۆڕشەکە بکەن تەنها هانیدان کەئازاری کورد نەدەن وهاوکاریان بکەن ئەم هاوکاریەش بوە هۆی تورەبونی ئینگلیز دواتر داوایان لەئاشووریەکان کرد کەهاوکاری کورد نەکەن[200].

فەرەنسیەکانیش گرنگیان بە شۆڕشەکەی شێخ عوبەیدوڵلا داوە، ئەوەتا لەراپۆرتێکی دیبلۆماتکارانی فەرەنسی لەناوچەکە دا لەسەر زاری شێخ ئەوە دەدرکێنن کە شێخ "لەبەر جەوری کارگێری و کارمەندە عوسمانیەکان توورە بووە"[201].

هەندێ ئاماژەی تر بەدەستەوەیە کەئەوە دەسەلمێنێت شێخ عوبەیدوڵلا پشتیوانی لێکراوە لەلایەن شەریفی مەککە و خدێوی مسر و هەندێ لە هۆزە عەرەبیەکانیش هاوسۆزیان بەرامبەر بە شۆڕشەکەی شێخ عوبەیدوڵلا دەربڕیووە[202].

بەم پێیە زلهێزەکان لەپێناو پارێزگاری کردن لەبەرژەوەندیەکانی خۆیان لەکوردستان هەرگیز هاوسۆزی سەرکەوتنی راپەڕین وشۆڕشەکانی کورد نەبوون

بەڵکو هەموو جارێك هەڵوێستی نێگەتیڤیان لەبەرامبەریاندا هەبووە و پشتگیری تەواوی دەوڵەتی عوسمانی و ئێرانیان کردووە بۆ دامرکانەوەیان [٢٠٣] بەجۆرێك کە هۆکارەکانی دەرەوە زۆر کاریگەرتر بوون لە هۆکارەکانی ناوخۆ بۆ دامرکاندنەوەی بزاڤ و شۆڕش و ڕاپەرینە کوردیەکان لەنیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەم [٢٠٤].

چوارەم / هەڵوێستی زلهێزەکان بەرامبەر بەسوارەی حەمیدییە

دامەزراندنی سوارەی حەمیدیە یەکێکە لە دیارترین ڕووداوەکانی سەردەمی سوڵتان عەبولحەمیدی دووەم لەسەرەتای ساڵی ١٨٩٠ کە لەسەر شێوەی سوپای (قۆزاق)ی ڕوسی دامەزرابوو [٢٠٥] کە بەهاندانی بەریتانیا بۆ عوسمانیەکان ئەم هێزە دامەزرا لە عەشایرە جۆراوجۆرەکانی ناو ولآتی عوسمانی وەکو بەشێك لەسوپای دەوڵەت بەسەرکردایەتی ئەفسەرە بەرزەکانی تورك [٢٠٦] مەبەستی سەرەکیش لەدامەزراندنی ئەم هێزانە بریتی بوو لە شەڕکردن دژی ڕوسەکان [٢٠٧].

ڕوسەکان لەو باوەڕە دابوون کەسوارەی حەمیدیە بەئامۆژگاری ئینگلیزەکان پێکهێنراوەو هەر ئەوانیش لەدژی ڕوسەکان هانیان دەدەن و هەر بەپێشنیاری ئەوانیش عوسمانیەکان زەکی پاشای سەرکردەی سوپای چوارەمی عوسمانیان هەڵبژارد تا بەرپرسیاریەتی ڕێکخستنی ئەو هێزە بگرێتە ئەستۆ، لەبەر ئەوە ڕوسەکان بەم هێزە خۆشحاڵ نەبوون [٢٠٨] هەروەها ڕوسەکان پێیان وابوو کەبوونی سوارەی حەمیدی لەسەر سنوور مایەی کێشەو گرفت ومەترسیە بۆسەر قەفقاس لەبەر ئەوەی چەند جارێك پێکدادان لەنێوان سوارەکانی حەمیدی وسەربازانی ڕوس ڕوویدا و کوشتاریش لەنێوانیان هەبوو [٢٠٩].

لە ئەگەری ڕوودانی جەنگێکی تر لەنێوان ڕوسیاو عوسمانی دا ڕوسەکان حساباتی تایبەتیان بۆ کوردو سوارەی حەمیدی کردووە چونکە زانیویانە کە

بەشداری کورد چەندە کاریگەرە لەشەڕەکاندا بۆ ئەمەش دوو ڕێگایان داناوە وەکو پلانی روسەکان بەرامبەر بەکورد و حەمیدیە کە ئەمانەن :ـ

یەکەم/ پەیوەندیکردن بەسەرکردەکان وراکێشانیان بۆلای خۆیان لەرێگای کڕین وبەڵێنی جۆراوجۆر.

دووەم / بەکارهێنانی هێزو چەك دژی ئەوانەی کەنایەنە ژێر باڵی روس زۆر بێ بەزەییانە[210].

لەساڵی ١٨٩٩ز سوارەی حەمیدی دوو ئەفسەری روسیان کوشت حکومەتی روسیاش داوای لەدەوڵەتی عوسمانی کرد سنورێك بۆ هەڵسوکەوتی سوارەی حەمیدیە دابنێت و سزای تاوانبارانیش بدات و موتەسەریفی بایەزید لە سەر کار لابدا و پلەی سوپایی لەسوارەی حەمیدیە بسەنێتەوە و خێزانی هەردوو ئەفسەرە کوژراوەکەش قەرەبوو بکاتەوە[211].

روسەکان هەوڵی زۆریاندا کە کوردەکانی سەر سنور نەچنە رێزی حەمیدیەوە و لەم هەوڵەشیاندا توانیان هەندێ لەو خێڵە کوردانەی بەلای خۆیاندا رابکێشن کە لەسەر سنوری روسیا ـ عوسمانیدا نیشتەجێ بووبوون[212] بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا سوارەی حەمیدی بەردەوامی پێدرا و مایەوە تا دوای جەنگی یەکەمی جیهانی[213].

لەلایەکی تر دەبینین ئەڵمانەکان پشتگیریان لەدەوڵەتی عوسمانی کرد بۆ پێکهێنانی سوارەی حەمیدی چونکە جگە لەوەی ئەلمانەکان دەیانویست لەو رێگایەوە دزە بکەنە ناوچەکە لەهەمان کاتدا ئەمە هەوڵێك بوو دەیویست بیقۆزێتەوە بۆ بەرهەڵستی کردنی دەسەڵاتی زلهێزەکانی تر لەناوچەکە بەتایبەتی روسیاو بەریتانیا[214].

بەریتانیەكان پشتگیریان كرد لەدامەزراندنی سوارەی حەمیدیە لەبەر دوو هۆكار :-

١- یەكەكانی سوارەی حەمیدیە لەسەر سنوور بەرامبەر بەروسەكان لە سەنگەر دابوون كە ئەمەش ئەركی بەریتانیا كەم دەكاتەوە و لە بەرژەوەندی ئەو دایە.
٢- كۆكردنەوەی سەرۆكەكانی كورد لە ڕیزەكانی سوارەی حەمیدیە كورد لە جموجۆڵ و بزاڤەكان دووردەخاتەوە[٢١٥].

بەڵام دوای ئەوەی لەساڵی ١٨٩٤ز حەمیدیەكان بەشداری كوشتاری ئەرمەنیەكانیان كرد لە بەهاری ١٨٩٥ز نوێنەرانی بەریتانیا و فەرەنسا و روسیا داواكاری چەند ریفۆرمێكیان كرد لەویلایەتە ئەرمەن نشینەكان یەكێك لەداواكاریەكانیان بریتی بوو لە چەك داماڵینی حەمیدیە[٢١٦].
مێجەر نوئێل دەڵێ: ((ناوی باشی كورد لەكەدار بوو لەئەوروپا بەهۆی سوارەی حەمیدیە))[٢١٧].

كەواتە ئەم كارەی كە سوارەی حەمیدیە ئەنجامیدا لادان بوو لە مەبەستە راستەقینەكەی خۆی و ئەو لایەنگری و پشتیوانیە كەمەی كە خەریك بوو لێی دەكرا ئەویش كۆتایی هات.

تەوەری چوارەم :-

ڕێككەوتننامە و پەیمانەكانی نێوان زلهێزەكان و عوسمانی پەیوەندی و كاریگەرییان لەسەر كوردستان

یەكەم / ڕێككەوتنی ستاتوو كوو ١٨٧٠ ز

ئەم ڕێككەوتنە لەساڵی ١٢٨٧ ك - ١٨٧٠ ز لەنێوان ئێران و ئیمپراتۆریەتی عوسمانی مۆركرا، حاجی میرزا حوسێن خان بالیۆزی ئێران لەگەڵ محەمەد ئەمین عالی پاشای وەزیری دەرەوەی عوسمانی مۆریان كرد، مەبەست لەم

ڕێککەوتننامەیە جارێکی تر ڕێکخستنی سنوورەکانی نێوانیان بوو کوردستان بەشێکی زۆری ئەم سنورەی پێکدەهێنا، ئەم ڕێککەوتنە لە(٧) خاڵ پێکدێت کە هەموو خاڵەکانی هەوڵدانە بۆ ڕێکخستن و پاراستنی ئاسایشی سنورەکان[٢١٨]، بەلام لەخاڵی دووەمدا ئاماژەیەك دەکات بۆ ئەو ناوچانەی سنوری کە کێشەیان لەسەرە و دەڵێ: "ئەوا هەر بەو حالە دەمێنێتەوە کە نێردراوی هەر چوار دەوڵەتەکە پێشتر لەسەری ڕێککەوتوون بەریتانیا، روسیا، ئێران، عوسمانی"[٢١٩].

ئەمەش ئەوەمان بۆ دەردەخات کە هەرچەندە ئەم ڕێککەوتنە لەنێوان دوو دەوڵەتی پەیوەندیدار بەمەسەلەی کوردستانەوە بەستراوە بەلام دیسان لەحالەتی چارەسەر نەکردنی کێشەکانی نێوانیان هێڵی گەڕانەوە (خگ رجعی) یان داناوە ئەویش گەڕانەوەیە بۆناوبژی کردنی زلهێزەکان و ڕازی بوونیان بەدەست خستنە ناو کاروباری کوردستان.

دووەم / پەیماننامەی سان ستیڤانۆ ١٨٧٨ ز

دوای شکستی عوسمانی بەرامبەر روسیا لەجەنگی ١٨٧٧ـ١٨٧٨ بەناچاری هاتنە سەر مێزی گفتوگۆو لە٣ـ ئازار/١٨٧٨، پەیماننامەی سان ستیڤانۆ[٢٢٠] بەسترا کەلەلایەن (صفوت پاشا)ی نوێنەری عوسمانی بەچاوی گریانەوە واژۆ کرا[٢٢١] چونکە مەرجەکانی یەکجار قورس بوون لەبەر ئەوەی چەندین ناوچەی عوسمانی کەوتە ژێر دەسەلاتی روسیاو عوسمانیەکان ناچاری بژاردنی بڕی (٣١٠) ملیۆن ڕۆبڵ کران[٢٢٢].

ئەم پەیماننامەیە لە ٢٩ماددە پێکهاتووە کەزۆربەیان لەبەرژەوەندی روسیا بوون و هەندێك لەبڕگەکانی پەیوەندیان هەبوو بە کوردەوە[٢٢٣] کە بەشێك لەناوچە کوردیەکانی وەکو (ئەردەهان، قارس، باتوم، ئەلاشکیرو بایەزید)[٢٢٤]

دەکەونە ژێر دەسەڵاتی روسیا، (قوتور)و دەوروبەری دەکەوتە دەستی ئێران[٢٢٥]، سەنجەقی بایەزید گرنگ بوو چونکە بواری بەروسەکان دەدا تارۆلی خۆیان ببینن لەناو کوردەکانی پشت ئالآداخ و وان وە دەسەلآتیان بەئاسانی دەگەیشتە سەر ئەو ناوچانە[٢٢٦].

ناڕازی بوونی زلهێزەکان بەرامبەر بەم پەیماننامەیە سەرتاسەری ئەورووپا و بەتایبەتیش بەریتانیای گرتەوە لەبەر ئەوەی دەبووە هەڕەشەیەکی روسی بۆ سەر بەرژەوەندیە ئابووریەکانی بەریتانیاو تێکچوونی هاوسەنگی هێز لەناوچەکە روسیاش هەستی بەم مەترسی و نارازی بوونە نێودەوڵەتیە کرد[٢٢٧] لە ئەنجامدا لەسەر پێشنیاری (پسمارك)ی راوێژکاری ئەلمانیا لە حوزەیرانی ١٨٧٨ز کۆنگرەی بەرلین لەئەلمانیا گرێدراو خاڵەکانی ئەم کۆنگرەیە شوێنی خاڵەکانی پەیماننامەی سان ستیڤانۆی گرتەوە، کەواتە پەیماننامەی سان ستیڤانۆ واقع بوو بەلآم جێبەجێ نەکرا[٢٢٨].

سێ یەم / کۆنگرە و پەیماننامەی بەرلین ١٨٧٨ز

کۆنگرەی بەرلین لە ١٨٧٨/٦/١٣ تا ١٨٧٨/٧/١٣ ز بەسترا بەسەرۆکایەتی پسمارك راوێژکاری ئەلمانیاو دزرائیلی سەرۆك وەزیرانی بەریتانیا و ئیتالیا و فەرەنسا وئیمپراتۆریەتی نەمسا و مەجەر و یۆنانیش تیایدا ئامادەبوون، پەیماننامەی بەرلین لەم کۆنگرەیە بەسترا کە لە ٦٤ بەند پێکهاتبوو[٢٢٩] کە مەبەست لێی چاوخشاندنەوە بوو بەخاڵەکانی پەیماننامەی سان ستیڤانۆ[٢٣٠] و خۆی لە خۆیدا کۆنگرەی بەرلین هەڵوەشاندنەوەی سان ستیڤانۆ بوو[٢٣١] کە لە ئەنجامیدا خەریك بوو بارودۆخەکە بتەقێتەوە لەنێوان روسیا و بەریتانیا چونکە خەریك بوو لە ئەنجامی جەنگی ١٨٧٧ـ١٨٧٨ز روسی – عوسمانی هاوسەنگی

هێز تێك بچێت بۆ بەرژەوەندی روسیا بۆیە كۆنگرەی بەرلین بەسترا تاببێتە چارەسەرێكی گونجا و بۆ رازی كردنی سەرجەم وولاّتە زلهێزەكان[٢٣٢].

لەراستیدا بەشێك لەخاڵەكانی ئەم پەیمانەش پەیوەندیان بەكوردەوە هەبوو بەتایبەتی بەندی (٦١) كە ئامارە دەكاتە سەر ئەوەی پێویستە ئەرمەنەكان بپارێزرێن لەدەسەڵات و هەژموونی چەركەس و كوردەكان لەلایەن عوسمانیەكانەوە. هەروەها لەو سەردەمەشدا پروپاگەندەی ئەوە بلاّو بۆوە لە ناوچە كوردیەكان كە زلهێزەكان خەریكن دەوڵەتێك بۆئەرمەنەكان دروست دەكەن لە ناوچەی وان[٢٣٣] بۆ ئەم مەبەستەش بریاردرا بە دامەزراندنی پێنج كونسوڵی سەربازی بۆ گەڕان بە ناوچەكانی ئەنادۆل و ئەرمینیا بۆ گویٚ گرتن لە داخوازی و سكالاّی مەسیحیەكانی ناوچەكە و كردەوەكانی سەركردە كوردەكان و رەوانە كردنی راپۆرت بۆ بالیۆزی بەریتانیا لە ئەستەنبۆل[٢٣٤] كەواتە لێرەدا زلهێزەكان كورد وەكو هۆكاری ترس لە ناوچەكە سەیر دەكەن و لەم پەیماننامەیە بەئاشكرا دژایەتی كورد كرا و مەسەلەی ئەرمەنیشیان وەكو هۆكارێك بەكارهێنا تا زیاتر دەسەلاّتی خۆیان بەسەر ئیمپراتۆریەتی عوسمانی بسەپێنن[٢٣٥] لە بەرامبەریشدا سولّتانی عوسمانی بۆ خۆ دەربازكردن لەم بارودۆخەی كەتێی كەوتووە كەوتە پەیرەوكردن لەسیاسەتی (كۆمكاری ئیسلامی) بۆ پێش گرتن لەم شالاّوە زۆرەی كەزلهێزەكان لەرووی سیاسیەوە دەیكەنە سەر ئیمپراتۆریەتی عوسمانی[٢٣٦].

یەكێكی تر لە خاڵەكانی پەیماننامەی بەرلین ئەوە بوو كە بریاردرا هەموو ئەو ناوچە كوردیانەی كە بەپێی پەیماننامەی سان ستیڤانۆ خرابوونە سەر دەوڵەتی روسیا بدرێنەوە بە ئیمپراتۆریەتی عوسمانی[٢٣٧].

تەوەری پێنجەم :-

کاریگەری زلهێزەکان لەسەر کورد و کوردستان

یەکەم / وروژاندنی هەستی نەتەوایەتی و وشیارکردنەوەی کورد

ئەو دواکەوتنە ئابوری و کۆمەڵایەتی و سیاسی و زانستیەی کەناوچە کوردیەکانی ژێر دەسەڵاتی عوسمانی گرتبۆوە بەهۆی سیاسەتەکانی دەوڵەتی عوسمانی(٢٢٨). لەلایەکی ترەوە پەرەسەندنی هزریی گەلانی ژێر دەسەڵاتی ئەم ئیمپراتۆریەتە، لەئەنجامی گۆڕانکاریە نوێیەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و دەست تێوەردانی وڵاتە زلهێزەکان. بووە هۆی پەیدابوونی هەستی نەتەوایەتی لەوڵاتانی ڕۆژهەڵات. بەکاریگەری شۆڕشە بۆرجوازیە نەتەوایەتیەکانی جیهانی ڕۆژئاوا. لەپاڵ لاوازی دەسەڵاتی ناوەندی عوسمانی. کە بەبەردەوامی لەجەنگ و شۆڕش و ڕاپەڕیندا بوو(٢٢٩). ئەم گۆڕانکاریانە، لەئەنجامی کاریگەریەکانی ڕۆژئاوا لەسەدەی نۆزدەمدا گەیشتە ئەوپەڕی(٢٤٠). بارودۆخی نێودەوڵەتی یارمەتیدەرێکی سەرەکی بوو بۆ هەستانەوەو ڕابوونی بزوتنەوەی ڕزگاریخوازی کورد. بەتایبەتی لەنیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەم(٢٤١). چونکە لەم ماوەیەدا هۆشیاری نەتەوەیی نەك تەنها لای کورد بەڵکو لای عەرەبەکان و ئەرمەنەکان و ئاشوریەکان و نەتەوەکانی تریش هاتە بەرهەم، تەنانەت وڵاتە زلهێزەکان یارمەتی ئاشکراو ڕاستەوخۆیان پێشکەش بەهەندێك لەو نەتەوانە دەکرد، بەتایبەتی ئەرمەنەکان(٢٤٢).

ئەگەر تێبینی بکەین دەبینین کە لەنیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەم هەردوو ئیمپراتۆریەتی عوسمانی و قاجاری بوو بوونە نیمچە داگیرکراوێکی (شبه مستعمره) دەوڵەتە زلهێزەکانی ئەورووپا بەشێوەیەك کەلەڕووی سیاسی و ئابووری و تەنانەت یاساییشەوە بۆیە ئەمە شتێکی سروشتیە کەئەم بارودۆخە هانی کورد بدات کەهەڵسێ بەخەبات و تێکۆشین لەدژی دەسەڵاتدارانی

ئەستەنبول وتاران[٢٤٣] هەر لەبەر ئەوەیە کە ئەو ماوەیە لە مێژووی کورددا بەوە جیادەکرێتەوە کە هۆشیاری نەتەوەیی لای کورد سەریهەڵدا بەمەفهومی ئەورووپی هاوچەرخ چونکە هەوڵیاندا بۆ رزگاربوون لەحوکمی بێگانە و بەدەست هێنانی حوکمی خۆجێی و سەربەخۆیی کەپێشتر هەرگیز بیری نەتەوەیی لەم ناوچەیە بەم شێوەیە نەبوو[٢٤٤].

روسەکان ڕاستەوخۆ کاریگەری بەهێزیان هەبووە لەسەر هۆشیاری نەتەوەی کورد چونکە هاوسنوری ناوچەکە بووە و هەروەها لەجەنگدا بووە لەگەڵ عوسمانی کەبارودۆخێکی گونجاوی خولقاندوە بۆ کورد وەك ئەبینین لەئەنجامی جەنگی قەرم ١٨٥٣-١٨٥٦ دوای ئەوەی زۆربەی هێزەکانی عوسمانی لەکوردستان دەکشێنەوە یەزدان شێر سوود لەبارودۆخەکە وەردەگرێ و دژی دەوڵەتی عوسمانی رادەپەرێ بەهاوکاری ئەوانەی کەسەردەمانێك بوو چاوەڕێی هەلێکی لەوجۆرە بوون[٢٤٥]، بۆیە دەکرێ بڵێین کەلەسەدەی نۆزدەم تاسەرەتای سەدەی بیستەم روسەکان رۆڵیان هەبوو لەدروست بوونی بزوتنەوەی نشتیمانی رزگاریخوازی کورد و بوژانەوەی[٢٤٦]، روسەکان هەر بەوەشەوە نەوەستان بەڵکو ئەو ناوچە کوردیانەی کەلەئەنجامی جەنگی قەرم کەوتببوە دەستیان هەڵسان بەدانانی کەسانی کوردی جێگای رەزامەندی خەڵکی سەنجەقەکان بۆ بەرێوەبردنی سەنجەقەکان وەك دانانی ئەحمەد ئاغای کورد بەبەرێوەبەری سەنجەقی بایەزید، شێخ عەبدال بە بەرێوەبەری سەنجەقی ئالاشکیرد، ئەحمەد ئاغا بۆ بەرێوەبردنی کاگیزمان وگیچەوان، بێگومان ئەمەش قۆناغێکی پێشکەوتووترە لەقۆناغەکانی پێشوو کەجۆرێکە لەسیستەمی خۆبەرێوەبردن کەرۆڵی خۆی دەبینێ لەهۆشیاری و ئاگاداری و پاراستنی خاك و نشتیمان کەدەبێتە تەواوکەر و کامڵ کردنی هەستی نەتەوایەتی لەدواتر[٢٤٧].

جەنگی ١٨٧٧-١٨٧٨ لەنێوان روسیا و عوسمانی بووە بنەمایەك بۆ دروست بوونی بیری سەربەخۆیی کوردستانی گەورە لای کورد[٢٤٨] چونکە لەئەنجامی ئەم جەنگەدا دزەکردنی زلهێزەکان بۆئیمپراتۆریەتی عوسمانی خەستتر بۆوە کەبارودۆخێکی دروستکرد بۆ سەرهەڵدانی شۆرشەکەی شێخ عـوبـەیـــدوڵلا لە ١٨٨٠ز کەبەیەکەم هەنگاوی لەوجۆرە دادەنرێ لەبەر ئەوەی توانی بووی کۆبوونەوەیەکی فراوانی (کوردیزم) رێکبخات و هەوڵی پەیوەندی بدات لەگەڵ دەوڵەتانی ئەوروپی[٢٤٩]، بەبڕوای کریس کۆچێرا (شێخ عوبەیدوڵلای نەهری) دامەزرێنەری ناسیۆنالیزمی کوردیە بەپشت بەستن بەو بەیاننامەیەی کەشێخ بۆیەکێك لەنوێنەرە رۆژئاواییەکانی ناردبوو تیایدا دەڵێت: ((میران و سەرانی کورد چ لەتورکیا و چ لەئێران و چ لەکوردستان هەر هەموو رایان وایە کەناکرێ بەمجۆرە لەگەڵ ئەم دوو حکومەتەدا هەڵبکرێ دەبێ کارێك بکرێ کە دەوڵەتانی ئەوروپی لەدۆزەکە ئاگادارین و لەم بارەیەوە لێکۆلینەوە ئەنجام بدەن، خەڵکی کورد نەتەوەیەکی جیایە و ئێمە دەخوازین کاروباری خۆمان لەدەستی خۆمان بێت))، هەروەها کریس کۆچێرا دەڵێت: ((ئەمە یەکەمین بەیاننامەی ناسیۆنالیزمی کوردیە))[٢٥٠] چونکە چەمکی نەتەوەیی سیاسی لای ئەوروپیەکان بریتییە لەرێکخستنی گەل لەچوارچێوەی دەوڵەتێکی سەربەخۆ ئەو چەمکەش لای شێخ عوبەیدوڵلا زۆر بەرونی دیارە لەم بەیاننامەیەی سەرەوە[٢٥١]، هەروەها رۆبەرت ئۆڵسن دەرکەوتنی شێخ عوبەیدوڵلا وەك رابەری ئەم شۆرشە کوردیە فراوانەی هەردوو کوردستانی عوسمانی و ئێرانی گرتەوە دەکاتە نیشاندەری هۆشیاری نەتەوایەتی کوردی و سەرەتای بزاڤە رزگاریخوازەکەی چونکە بەئاشکرا داوای سەربەخۆیی کوردستان دەکات، چەند توێژەرێکی هاوچەرخیش پاڵپشتی گوتەکانی ئۆڵسن دەکەن[٢٥٢] هەروەها لە بەڵگەنامەیەکی بەریتانیشدا

هاتووە كەشێخ و سەرۆك خێڵەكانی كوردستان دەخوازن كوردستان لەسەر بنچینەیەكی یەكگرتوو وەسەربەخۆ دابمەزرێت[٢٥٣] وكوردەكان دەیانەویست كوردستانێكی سەربەخۆ بنیات بنێن لەژێر سێبەری یەك سەركردایەتی[٢٥٤].

كەواتە دەكرێ بڵێین بەشی هەرە زۆری لێكۆڵینەوە و سەرچاوەكان كۆكن لەسەرئەوەی كەسەردەمی شێخ عوبەیدوڵلا سەرەتای پێگەیشتنی بیری ناسیۆنالیزمی كوردیە لەگەڵ هەبوونی هەندێك رای پێچەوانەش، بێگومان سەرهەڵدانی ئەم بیرەش لەبەر دوو هۆكاری سەرەكی بووە یەكەم ناوەخۆ كەپەیوەندی بەبارودۆخی نالەباری ناوچە كوردیەكان هەبووە و دووەم دەرەكیە كەكاریگەری وولاتە زلهێزەكان بووە بەڕاستەوخۆ كەتێكەڵ بوونە لەگەڵ كورد و هاتوونەتە ناوچەكە و ناراستەوخۆ كەپێشكەوتنەكانی زلهێزەكان لەتەواوی لایەنە جۆراوجۆرەكانی ژیانی كۆمەڵگاكانیان.

ئەوەی پەیوەندی هەبێت بەكۆمەڵە و رێكخراوە سیاسیەكانی ئەم سەردەمە ئەوا كۆمەڵەیەكی كوردی وانەبووە كەبەپێی تێگەیشتنی هاوچەرخ رێكخرابێت، بەلأم هەستێكی هاوبەشی زۆربەی نشتیمان پەروەرانی لەم لاو ئەولای كۆكردبووەوە تاجارجارە كۆڕ و كۆمەڵ بگرن[٢٥٥].

وشیاری كورد لەكۆتاییەكانی سەدەی نۆزدەم گەیشتە ئاستێكی بالأ بەبەڵگەی ئەوەی كاتێك كەرێكخراوی ئیتحاد و تەرەقی لەساڵی ١٨٨٩ دامەزرا چوار كەس ئەم رێكخراوەیان دامەزراند كە دوو كەسیان (ئیسحاق سكۆتی لە دیاربەكر و عەبدوڵلا جەودەت لە عەرەبگیر) كورد بوون ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ كەكورد ئیتر وشیار بۆتەوە ودەیەوێت هەوڵبدات بۆ گۆڕینی بارودۆخی خراپی دەوڵەت[٢٥٦].

دوای ئەوەی موژدەدەرەکان هاتنە ناوچەکانی کوردستان و چالاکیان ئەنجام دەدا یەکێك لەکارەکانیان بریتی بوو لەکردنەوەی ژمارەیەکی زۆری قوتابخانە لەناوچە جیاجیاکان بەتایبەتی بۆ منداڵە مەسیحیەکان کەدواتر ئەم قوتابخانانە بەشدارییان کرد لە هەستانەوەی وشیاری نەتەوەیی کەمینە نەتەوەییەکان، کوردیش وەك بەشێك لەکەمە نەتەوەییەکانی ژێر دەسەڵاتی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی سوودی لەم بارودۆخە بینیوە(٢٥٧)، جیا لەهەموو هەوڵەکانی سوڵتانی عوسمانی زۆربەی ئەفسەرانی سوارەی حەمیدیەو قوتابیانی قوتابخانەی (عەشیرەت مەکتەبلەری) بوونە بناغەی هزری نەتەوەیی کوردی کەبەشداریان کرد لەزۆربەی کۆمەڵە و رێکخستنە سیاسیە کوردیەکان(٢٥٨)، چونکە بەزۆربوونی ژمارەی خوێندەوارانی کورد هەستی نشتیمان پەروەرێتی زیاتر تەشەنەی کرد(٢٥٩).

بزوتنەوەی رزگاریخوازی کوردی لەکۆتایی سەدەی ١٩ و سەرەتای سەدەی بیست پێی نایە قۆناغێکی نوێ چونکە چینێکی رۆشنبیر شان بەشانی شێخەکان برەویاندا بەبیروباوەڕی نەتەوەیی لەو چوار چێوەیەدا سەرقافلەی کاروانی شۆڕشی رۆشنبیری کوردی مەدحەت بەدرخان لەساڵی ١٨٩٨ز بۆیەکەمجار لەشاری قاهیرە رۆژنامەیەکی بەزمانی کوردی بەناوی (کوردستان) دەرکرد دەورێکی باڵای بینی لەسەر بزواندنی زیاتری هەستی نەتەوەیی(٢٦٠).

دووەم / لایەنی رۆشنبیری و زانستی

هەژمون و دەسەڵات و هەبوونی زلهێزەکان نەك هەر هۆکارێك بوونە بۆ پێشکەوتنی بواری زانستی و رۆشنبیری لەکوردستان و فراوانترکردنی مەودای بیری مرۆڤی رۆشنبیری کورد بگرە زۆرجاریش خودی کەسایەتی و نوێنەری کونسوڵخانە و موژدەدەرەکان خۆیان هەڵساون بەلێکۆڵینەوە یان دانانی پەرتوك

کەلەم رێگایەوە خزمەتیان بەرەوتی رۆشنبیری و مەعریفی کوردستان کردووە وەك ئەلێکسەندەر جابای کونسولی روس لەئەرزەرۆم لەماوەی نێوان ساڵانی ١٨٣٦-١٨٦٩ کە لەگەڵ مەلا مەحمودی بایەزیدی(٢٦١) بەیەکەوە کاریان کردووە و چەند بەرهەمێکیان پێشکەشی کردو سوودیان لەیەکتری وەرگرتووە(٢٦٢).

هەروەها ئەو قوتابخانانەی کە دەزگا موژدەدەرەکان لە کوردستان دایانمەزراندبوو رۆڵیان هەبووە لە بڵاوکردنەوەی زانیاری و فێرکردن هەرچەندە ئەم قوتابخانانە بۆ مەبەستی موژدەدەری و شتی تر دامەزرابوون بەڵام لەخزمەتکردن بە رۆشنبیری و پێشکەوتنی زانستی کەمتەرخەم نەبوون(٢٦٣) دواتریش لە قوتابخانە سەربازی و بیانیەکان چینێك لەرۆشنبیرانی نوێ سەریانهەڵدا و گەشەیان کرد ئەم رۆشنبیرانە لەنەوەی میر و شێخ و سەرۆك عەشیرەتەکان بوون کەکاریگەری ئەوروپایان بەسەرەوە دیاربوو بەدڵنیاییەوە ئەوانە رۆڵی کاریگەریان هەبوو لەسەر بارودۆخەکان(٢٦٤).

لەنموونەی ئەو قوتابخانانەش دەبینین فەرەنسیەکان چەندین قوتابخانەیان لەسەرتاپای قەڵەمڕەوی دەوڵەتی عوسمانی کردەوە کەدەیان هەزار قوتابیان لەخۆدەگرت و لەشاری موسڵ پێگەی بەرچاویان لەلایەنی رۆشنبیری شارەکە هەبوو و زمانی فەرەنسیش کاریگەری زۆری هەبوو لەسەر هەندێ لەرۆشنبیرانی شارەکە هەروەها هێنانی چاپخانە بۆ شاری موسڵ ئەمانە بەیەکەوە کاریگەریان هەبوو لەسەر ژیانی رۆشنبیری و زانستی ناوچەکە(٢٦٥).

ئەمریکیەکان لەم بارەیەوە بێ هەڵوێست نەبوون تەنیا موژدەدەرە پرۆتستانتەکانیان لەساڵی ١٨٧٠ نزیکەی ٢٠٥ دامەزراوی پەروەردەییان هەبوو لەدەوڵەتی عوسمانی کەزۆربەیان بۆ کەمەنەتەوایەتیەکان کرابوونەوە(٢٦٦) و

لەساڵی ١٨٩٨ز لەشاری وان دوو قوتابخانەیان دامەزراند یەك بۆكچان وئەویتر بۆ كوڕان[٢٦٧].

دوای ئەوەی كوردەكان خۆیان هەستیان بەوەكرد كەدواكەوتوون لەرووی خوێندن و زانستەوە لەئەنجامی تێكەڵ بوونیان بەبێگانە و سەردانی بەردەوامی كونسوڵە ئەوروپیەكان بۆكوردستان حەڤدە سەرخێڵی كورد لەناوچەی وان یاداشتێكیان پێشكەش بەنوێنەری سوڵتان كرد كەبەناوی چل هەزار كوردەوە داوایان كرد كەچەند خوێندنگەیەك بەپارەی خۆیان بۆمناڵەكانیان بكرێتەوە لەئەنجامدا لە١٨٩٠/٩/٢١ سوڵتان عەبدولحەمید فەرمانیدا بەدروستكردنی ئەو خوێندنگایانە و خوێندن تیایدا لەساڵی ١٨٩٢ز دەستی پێكرد كە بە(عەشیرەت مەكتەبلەری) ناسران وعوسمانیەكان بەمەبەستی راكێشانی سۆزی كورد داوایانكرد منداڵی سەرۆك خێڵەكان بچنە ئەستەنبوڵ و لەو قوتابخانانە بخوێنن[٢٦٨] ئینجا فەرمانبەران و بازرگانان و دەرەبەگ و خانەدانەكان مناڵەكانیان رەوانەی قوتابخانەكان كرد بۆ وەرگرتنی زانیاری لەسەر زانستە جۆراوجۆرەكان[٢٦٩] بەجۆرێك كەلەكۆتاییەكانی سەدەی نۆزدەم لەبواری رۆشنبیری و زمانەوانی كورد پێشكەوتنی زیاتری بەخۆوە بینی ئەویش لە زیاد بوونی چاپ و پەخشی كتێب و پێشكەوتنی رێزمانی كوردی وەك بڵاو بوونەوەی (ئینجیل)ێك بە زمانی كوردی و (ئەلف و بێ)یەكی كوردی بەپیتی ئەرمەنی لە ١٨٩٠ز وە چەندین بەرهەمی تر[٢٧٠].

لە ئەنجامی گەشە كردنی ئاستی رۆشنبیری تاكی كوردی لە مانگی كانوونی یەكەمی ١٨٩٧دا عەبدوڵلا جەودەت لەگەڵ ئیسحاق سكۆتی هاوڕێیدا رۆژنامەی (عوسمانلی)یان دەركرد كە دوو هەفتە جارێك دەردەچوو بەزمانی توركی و ئینگلیزی كە بووە جێگای نارەزایی دەسەڵاتدارانی عوسمانی چونكە بانگەوازی

بۆ گۆڕینی رژێمی عوسمانی دەکرد تا لە ١٨٩٩ز وەستا[٢٧١]، شـایـانـی باسە رۆژنامەی عوسمانلی

لەجنێف دەردەچوو ئەگەر چی بەزمانی كوردی نەبوو بەلام ئەوە سەرەتایەك بوو بۆ زیاتر بوژانەوەی ئاستی رۆشنبیری كوردی كە دواتر ئەم بزوتنەوە رۆشنبیریە زیاتر گەشەی كرد و گەیشتە ئەو ئاستەی كە لە سالانی ١٨٩٨ – ١٩٠٢ رۆژنامەی (كوردستان) بەزمانی كوردی دەربچێت[٢٧٢].

بەر لەكۆتایی هاتنی سەدەی نۆزدەم و رێك لە ١٨٩٨/٤/٢٢ بزاڤی رۆشنبیری كوردی گەیشتە لوتكەی گەشەسەندنی خۆی كاتێك لەسەر دەستی یەكێك لە ئەندامانی بنەماڵەی بەدرخانیەكان (مقداد مدحت بەدرخان) توانی لە شاری قاهرە تۆبەرەی رۆژنامەگەری كوردی بهێنێتە بەرهەم بەناوی رۆژنامەی (كوردستان)[٢٧٣] كەتەنها (٣١)ژمارەی لێدەرچوو[٢٧٤]، دەركردنی ئەم رۆژنامەیەو بەڕێوەبردنی لەلایەن كوردەوە راگەیاندنی قۆڵ هەڵماڵینی كوردە لە بواری زانستی و رۆشنبیری شانبەشانی بواری سیاسی و سەربازی بۆ تەواوكردنی رێگاكەی بزاڤی رزگاریخوازی كوردی[٢٧٥]، چونكە یەكێك لەو لایەنانەی كە رۆژنامەی كوردستان گرنگی پێداوە بریتی بووە لە پێشخستنی لایەنی زانستی و هزری مرۆڤی كورد و داوا دەكات كە كوردەكان منالەكانیان بنێرنە قوتابخانە و بۆ ئەم مەبەستەش چەندین ئایەتی قورئانی پیرۆز و فەرموودەی پێغەمبەر (ص) دەهێنێتەوە[٢٧٦] وەك لە ژمارەی (٢)ی رۆژنامەكە لە ٦/ئایاری/١٨٩٨ مقداد مدحت بەدرخان باس لە گرنگی و سوودی خوێندن و فێربوون دەكات و سوودەكانی خوێندن و زانست و زانیاری دەخاتە بەرچاو[٢٧٧].

## پوختەی توێژینەوە

ئێستا کاتی ئەوە هاتووە کە بەرهەمەکەمان بخەینە روو بەشێوەیەکی کورت و پوخت بەجۆرێك کە لە ئەنجامی بینینی چەندان سەرچاوەی جۆراوجۆر ئەو مافە بەخۆمان بدەین کە بڵێین بەڵێ کوردستانی عوسمانی شوێنگەیەکی ستراتیژی جوگرافی گرنگی هەبووە، هەروەها سامانێکی ئابووری دەوڵەمەندی هەبووە بەتایبەتی لەرووی سامانی سروشتی جگە لەمانە سەرە رێی بازرگانی و پردی بەیەکبەستنەوەو پەیوەندی نێوان رۆژهەڵات و رۆژئاوا بووە، جا ئیتر خاکێك ئەم هەموو خاڵی ئیجابیەی تیادا کۆببێتەوە بەدڵنیاییەوە بۆتە جێگای چاوتێبڕینی زلهێزەکانی ئەو کاتە لەسەرووی هەموویانەوە روسیا، بەریتانیا، فەرەنسا، ئەلمانیا و ئەمریکا تا بەکاری بهێنن بۆ بەرژەوەندیەکانی خۆیان نەك هەر ئەوەندە بگرە ململانێیەکی توندی یەکتریان کردووە لەسەر ئەم خاکە و لەپێناوی ئەم خاکە، ئەم زلهێزانە لەپێشبڕکێ دابوونە بۆ چەسپاندنی دەسەڵاتی زیاتر و هەژمونی خۆیان لەسەر کوردستان لەرێگای بەکارهێنانی بیانووی جۆراوجۆری وەك ئابووری و بڵاوکردنەوەی ئایین و پاراستنی کەمە نەتەوایەتیە مەسیحیەکان و کردنەوەی پێگەی سیاسی و کونسوڵگەری لەناوچە کوردیەکان بەشێوەیەك کە هەندێ جار ئەو ململانێیە گەیشتۆتە ئاستی جەنگ لەگەڵ یەکتر وەك ئەوەی کە لەجەنگی قەرم روویدا کاتێك بەریتانیا و فەرەنسا هاتنە ناو جەنگەوە بۆ یارمەتی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی لەدژی روسیا بەبیانووی پاراستنی هاوسەنگی هێز و بەرگری کردن لە مومتەلەکاتی عوسمانی بەڵام لەراستیدا پاراستنی هاوسەنگی هێز بریتی بوو لە پاراستنی بەرژەوەندی زلهێز.

لەنیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەم زلهێزەکان گرنگیەکی یەکجار زۆریان داوە بە کوردستان و سڵیان نەکردۆتەوە لەبەکارهێنانی هەموو رێگایەك بۆ دەست

بەسەر داگرتنی کوردستان بۆ ئەمەش هەر یەکێك لەم زلهێزانە بەرژەوەندی خۆی لەسەرووی هەموو شتێکەوە داناوە و لەپێناو پاراستنی چی پێویست بووبێت کەمتەرخەمیان نەکردووە.

ئەو زلهێزانەی کە وجودیان هەبووە لەکوردستان بەرامبەر بە کورد وەکو نەتەوە یەك هەڵوێستی نەگۆڕیان هەبووە بە درێژایی سەردەمەکە بەبێ دوو دڵی دژایەتی هەموو شۆڕش و راپەڕینە کوردیەکانی نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەمیان کردووە و هەوڵی لەناوبردنیان داوە، جاروبار بینیومانە کە یارمەتی یان هاوکاری کەسایەتیەکی کورد یان خەڵکی ناوچەیەکیان کردووە بەڵام لەسەر ئاستی گشتی نەبووە تەنها بۆمەبەستی پاراستنی بەرژەوەندیەکانیان یان پاراستنی خۆیان لەکورد یان بەکارهێنانی کورد بۆ مەبەستێکی دیاریکراوی خۆیان ئەم کارەیان کردووە ئەگینا کورد وەکو نەتەوە هیچ کاتێك لەلایەن زلهێزەکانەوە دەستی یارمەتی بۆ درێژ نەکراوە لەبەر ئەوەی ئەوان زۆرباش دەیانزانی کە دامەزراندنی دەوڵەتێکی کوردی بەهێز دەبێتە هەڕەشە بۆ سەر بەرژەوەندی زلهێزەکان لەئیمپراتۆریەتی عوسمانی لاواز و لەدەست چوونی ناوچەیەکی گرنگ کە ئەویش کوردستانە بۆیە هەموو زلهێزەکان ئەگەر لەململانێشدا بووبن ئەوا کاتێك مەسەلەکە هاتۆتە سەر کورد یەك هەڵوێست بوونە لەدژایەتی کردنی کورد.

کاتێك کەزلهێزەکان لەگەڵ عوسمانیەکان پەیمان یان رێککەوتننامەیان بەستاوە لەگەڵ یەکتر ئەوا هەموو کات خاکی کوردستان کراوە بە قوربانی یەکلایی کردنەوەی کێشەکان و بەویستی خۆیان و بەرژەوەندیەکانیان ناوچە کوردیەکانیان لەیەکتر دابڕاندوە تا کار گەیشتۆتە ئەو ئاستەی کە لەهەندێ

سەردەم هەوڵی ئەوە بدەن کەکوردستان بکەن بە ئەرمەنستان و بەیەکجاری لەمۆرکی کوردی بیسڕنەوە.

خاڵێکی تری گرنگ کە زۆر پێویستە ئاماژەی پێ بکەین ئەوەیە کە لەئەنجامی هاتنە ژوورەوە و تێکەڵ بوونی زلهێزەکان بەناوچەکە لەڕێگای جۆراوجۆری وەکو سیاسی، ئابووری، ئایینی کارلێکی هێواش روودەدات کە بریتیە لە چاوکرانەوە و وریابوون و هەستی وشیاری کورد لەبارودۆخەکان و دەرچوون لە قالبی داخراوی کۆن بەتایبەتی لای بنەماڵە ناودارەکان و کەسایەتیە رۆشنبیریەکان بەشێوەك کە دەتوانین ڕێگا بەخۆمان بدەین و بڵێین لەو سەردەمەدا هەستی کوردایەتی و نیشتمانی هەستی پێدەکرێ و لەدایك دەبێت وە خاڵی دەست پێك دەگەڕێتەوە بۆ شێخ عوبەیدوڵڵای نەهری کاتێك زۆر بە روونی هەوڵی خۆی دەخاتە کار بۆ سەربەخۆیی کوردستان بە هەردوو بەشی عوسمانی و ئێرانی، هەرچەندە ئەمە ویستی زلهێزەکان نەبووە بەڵام بەبێ ویستی ئەوان لەئەنجامی بەریەککەوتنی ئەوان لەگەڵ کورد و نەتەوەکانی تر ئەم قۆناغە دروست دەبێت بەجۆرێك ساڵ دوای ساڵ دزەکردنی دەسەڵاتی زلهێزەکان زیاتر دەبێت لە بەرامبەرا هەستی نەتەوەیی ونیشتمانی زیاتر دەبێت تا لەسەرەتاکانی سەدەی بیستەم هەردووکیان بەیەکەوە گەشە دەکەن.

جگە لە هەستی نەتەوەیی ئاستی رۆشنبیری و زانستی کوردی لەو سەردەمەدا دەگەشێتەوە و قۆناغێکی باش دەبڕێت هەرچەندە بێ کەموکوڕی نیە بەڵام ئەمە دەستپێکێکی گرنگە کە دەکەوێتە نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەم کاتێك کە کوردەکان پەیوەندی دەکەن بەجیهانی دەرەوەی عوسمانی شارەزای بوارە رۆشنبیرو زانستیەکانی جیهانی دەبن، هزری رۆشنبیری کوردی پێشدەکەوێ و هەر ئەو رۆشنبیرانە هەوڵ دەدەن ئەم هەستە بگوازنەوە بۆ نەوەکان لەئەنجامدا

یەکەم رۆژنامەی کوردی بەزمانی کوردی بەدەستی کوردێك لەقاهیرە بەناوی کوردستان لەدایك دەبێت پێش کۆتایی هاتنی سەدەی نۆزدەم، هەروەها ئەو موژدەدەرە مەسیحیانەی کە هاتنە کوردستان چەندین قوتابخانەیان کردەوە لەژێر ئەو فشارە دواتر قوتابخانەی میریش دەکرێتەوە کە هەردووکیان بەیەکەوە دەبنە هۆی زیادبوونی ژمارەی خوێندەواران و زیادبوونی ژمارەی خوێندەوارانیش بەپێی هاوکێشەکان دەبێتە هۆی وشیاربوونەوەی کۆمەڵگا و دواتریش کامڵ بوونی لایەنەکانی نەتەوایەتی و سەربەخۆیی و ئازادی کە لە کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەم وەکو سەرەتایەك دەست پێدەکات لەقالبی ساوایی بەڵام دواتر لە سەدەی بیستەم دەگاتە لوتکەی خۆی.

**پەراوێزەکان:**

١) کامەران مەنتك، کوردستان لەململانێی نێودەوڵەتی وناوچەییدا ١٨٩٠ – ١٩٣٢، چ١، چا: سەردەم، سلێمانی، ٢٠٠٠، ل ٣١.

٢) کامەران محەمەد حاجی،کوردستان لەبازنەی کێشەی رۆژهەڵاتیدا ١٨٠٠–١٩٠٠، چ١، چا: رۆشنبیری، هەولێر، ٢٠٠٧، ل ٨٧.

٣) جەرجیس فتح الله، ثورة الشیخ عبیدالله النهري، ط٣، مط: ئاراس، اربیل، ٢٠١٠، ص ٦٩.

٤) ن. لازاریف، مێژووی کوردستان، و: وشیار عەبدوڵلاّ، هەولێر، ٢٠٠٨، ل ٢٥٢.

٥) کامەران مەنتك، س. پ، ل ٣٧.

٦) ن. ا. خالفین، خەبات لەرێ ی کوردستاندا، و: جەلال تەقی، سلێمانی، ١٩٧١، ل ٣٦.

٧) د. اسماعیل محمد حصاف، کوردستان و المسالة الکوردیة، ط١، مط: خانی، دهوك، ٢٠٠٩، ص ١٦١.

٨) خالفین، س. پ، ل ٢١٣.

٩) حسین مەدەنی، کوردستان و ستراتیژیەتی دەوڵەتان، ب١، چا: رۆژهەلات، هەولێر، ٢٠٠٩، ل ١٥٥.

١٠) د. احمد محمد احمد، اکراد الدولة العثمانیة، ط١، مط: حجی هاشم، اربیل، ٢٠٠٩، ص ٤٠٧.

١١) د. جاسم تۆفیق خۆشناو، مەسەلەی کورد و یاسای نێودەوڵەتان، سلێمانی، ٢٠٠٢، ل ١٤٢.

١٢) کەمال بورکای، کورد و کوردستان، و: عەلی فەتحی، چ١، چا: منارە، هەولێر، ٢٠٠٨، ل ٣٤٤.

١٣) مارك سایکس توێژەرێکی ئینگلیزی بەتواناو شارەزا بووە لەکاروباری رۆژهەڵاتی ناوەڕاست بەگشتی و کوردستان بەتایبەتی، دوو جار هاتۆتە کوردستان لەساڵانی ١٨٩٥ و ١٩٠٥، کۆمەڵێ راپۆرتی گرنگی نووسیوە لەبارەی باردۆخی کوردستان.(بڕوانە کۆمەڵێ لەپسپۆران و نووسەرانی سیاسی ئینگلیزی، کوردو کوردستان، و: حوسێن عوسمان نێرگزەجاڕ و حسین احمد جاف، چ١، چا: پەروەردە، هەولێر، ٢٠٠٢، ل ٩٩).

١٤) کەیوان ئازاد ئەنوەر، چەردەیەك لەمێژووی کورد، چ٥، چا : رەهەند، ٢٠٠٨، ل ١٤٠.

١٥) خالفین، س. پ، ل ٢٢١.

١٦) د. کمال مظهر احمد، کوردستان في سنوات الحرب العالمیة الاولی، ت: محمد الملا عبدالکریم، ط٢، بغداد، ١٩٨٤، ص ٤٠.

١٧) پ. ی. ئەڤێریانۆڤ، کورد لەجەنگی روسیا لەگەڵ ئێران و تورکیادا، و: د. ئەفراسیاو هەورامی، سلێمانی، ٢٠٠٤، ل ١٣٦.

١٨) هـ. س، ل ٣١٦.

١٩) د.فاضل رسول، کردستان والسیاسة السوفیتیة في الشرق الاوسط، ت: عثمان نعمان، مراجعة: ماموستا جعفر، مط: حمدی، سلیمانی، ٢٠٠٨، ص١٢٣.

٢٠) هۆگر طاهر توفیق،جريدة كوردستان وروسيا القيصرية ١٨٩٨ – ١٩٠٢، گۆڤاری (مێژوو)، ژ : ٦، هەولێر، ٢٠٠٨، ل ٢٢٦.

٢١) کامەران مەنتك، س. پ، ل ٥٢.

٢٢) هـ. س، ل٦١.

٢٣) شێخ سدیق، پاکتاوکردنی رەگەزی لە مێژووی کورددا، چ١، چا: وەزارەتی کشتوکاڵ، هەولێر، ٢٠٠٥، ل،٢٥ ؛ گۆران ئیبراهیم سالح، کەرکوك لەسەردەمی دەوڵەتی عوسمانیدا ١٨٧٦-١٩٠٩، چا: مەحوی، سلێمانی، ٢٠٠٧، ل ل ١٠٣ – ١٠٤.

٢٤) ارشاك سافراستيان، الكورد و كردستان، ت: احمد محمود الخليل، ط١، مط: دار الزمان، سوريا، ٢٠٠٨، ص٨٥.

٢٥) کۆمەڵێ نوسەر، عوسمانییەکان، و: سەلام عەبدولکەریم، چ٢؛ چا: گەنج، سلێمانی، ٢٠٠٨، ل١٣٧.

٢٦) مصطفى محمد كريم، جەنگی(قەرم)١٨٥٣ـ ١٨٥٦ز هۆکارو دەرئەنجامەکانی، گۆڤاری (مێژوو)، ژ: ١٠، هەولێر، ٢٠٠٩، ل ٩٩.

٢٧) د.محەمەد سوهەیل تەقوش، عوسمانییەکان لەدامەزراندنی دەوڵەتەوە تا کودەتا بەسەر خەلافەتدا، و: مەریوان خۆشناو و مستەفا سەید مینە، چ١، هەولێر، ٢٠٠٩، ل ٤٥٤.

٢٨) د.فەرهاد پیرباڵ، کورد لەدیدی رۆژهەڵاتناسەکانەوە، چا: شڤان، سلێمانی، ٢٠٠٩، ل ٥٢.

٢٩) کەمال بورکای، س. پ، ل ٣٥١.

٣٠) محەمەد سوهەیل تەقوش، س. پ، ل ٤٦٣.

٣١) مصطفى محمد كريم، س. پ، ل ١٢٢.

٣٢) ن. لازاریف، س.پ، ل ل ٢١٥ـ٢١٦.

٣٣) محەمەد سوهەیل تەقوش، س. پ، ل ٤٧٣.

٣٤) kemal Arkun , II Sultan Mahmut Han , Istanbul ٢٠١٠ , p ٥٩.

٣٥) کامەران محەمەد حاجی، س. پ، ل ١٨٢.

٣٦) هـ. س، ل ١٧٤.

٣٧) م. رەسول هاوار،کوردو باکوری کوردستان لەسەرەتای مێژووەوە هەتا شەڕی دووهەمی جیهانی، چ١، چا: خاك، سلێمانی، ٢٠٠٠، ل ٤٠١.

٣٨) حسین مەدەنی، س. پ، ب١، ل ٢١٤.

٣٩) کامەران محەمەد حاجی، س. پ، ل ٦٧.

٤٠) د.نمير طه ياسين، تاريخ العرب الحديث و المعاصر، ط١، اردن، ٢٠١٠، ص ٢٠.

٤١) کەیوان ئازاد ئەنوەر، س. پ، ل ل ١٣٩ـ١٤٠.

٤٢) کاتب شیوعي مجهول، القضیة الکردیتو حق الشعب الکردي فی تقریر مصیرە، گۆڤاری (k٢١)، ژ (١)، هەولێر، ٢٠٠٨، ل ٤١٩.

٤٣) باسیل نیکیتین، الاکراد اصلهم، تاریخهم، مواطنهم، عقائدهم، عاداتهم، ادابهم، لحجاتهم، قضایاهم، مط: دار الروائع، بیروت، ب.س، ص ٤٦.

٤٤) رۆژەڤا کورد، لەساڵی١٨٩٥ پاپۆڕێك بەناوی کوردستان دروستکرا، رۆژنامەی خەبات، ژ : ٣٦٠٣، ٢٠١٠/١٠/١٩، ل١.

٤٥) فەرهاد پیرباڵ، کورد لەدیدی رۆژهەلاتناسەکانەوە، ل ٥٢.

٤٦) اسماعیل محمد حصاف، م. س، ص ١٥٩.

٤٧) د. عبدالرحمن قاسلو، کوردستان و کورد، و: عبدالله حسن زادە، ب. ش، ١٩٧٣، ل ١٢٦.

٤٨) خالفین، س. پ، ل ١٧١.

٤٩) احمد محمد احمد، م. س، ص ٤٠١.

٥٠) کمال مظهر احمد، کردستان في سنوات الحرب العالمیة الاولی، ص ٦٧ـ٦٨.

٥١) م. ن ؛ ص ٢١.

٥٢) م. ن، ص ٢٨.

٥٣) فوئاد حەمە خورشید، کەرکوك لەبەڵگەنامەکاندا،و: نەریمان عەبدوڵلا خۆشناو،چ١، چا: منارە، هەولێر، ٢٠٠٧، ل ل١١١-١١٢.

٥٤) باسیل نیکیتین، م. س، ص ١١.

٥٥) د. جەلیلی جەلیل، کوردەکانی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی، و: د. کاوس قەفتان، بەغداد، ١٩٨٧، ل ٨٤.

٥٦) کاوە نادر قادر، رۆڵی نەوت لەچارەنوسی گەلی کوردستاندا، چا: روون، سلێمانی، ٢٠٠٧، ل ٢٤.

٥٧) کمال مظهر احمد، کوردستان في سنوات الحرب العالمیة الاولی، ص ٢١.

٥٨) دلشاد عمر عزیز، نەوتی کەرکوك وململانێی زلهێزەکان،نامەی ماستەری بلاونەکراوە لەکۆلێژی زانستە مرۆڤایەتیەکان،زانکۆی سلێمانی، ٢٠١٠،ل٢٩.

٥٩) کامەران مەنتك، س. پ، ل ٣٣ ؛ د.محمد رۆوف سعید والمهندس زمناکو سعید فتح الله، اقلیم کورستان العراق في دائرة السیاسات النفطیة العالمیة، ط١، مط : تیشك، سلیمانی، ٢٠٠٨، ص١٥.

٦٠) بەختیار سەعید مەحمود شوانی، کەرکوك لەسەدەی نۆزدەهەمدا، چ١، سلێمانی، ٢٠٠٩، ل ١٧٩.

٦١) کاوە نادر قادر، س. پ، ل ٢٨.

٦٢) فەرهاد پیرباڵ، کورد لەدیدی رۆژهەلاتناسەکانەوە، ل ٥٣.

٦٣) کامەران محەمەد حاجی، س. پ، ل ١٠٦.

٦٤) د.فەرهاد پیرباڵ، ژەنەراڵ شەریف پاشا١٨٦٥_١٩٥١، چ١، سلێمانی، ٢٠٠١، ل ل ٨٨_٨٩.

٦٥) Susan meiselas , Kurdistan in the Shadow of history , Spain , w. y , P ٢.

٦٦) خالفین، س. پ، ل ٣٥ ؛ کامەران محەمەد حاجی، س. پ، ل ل ١١٦_١١٧.

٦٧) مصطفی محمد کریم، س. پ، ل ١١٦.

٦٨) هـ. س، ل ١٠٠.

٦٩) خالفین، س. پ، ل ل ٢١٣_٢١٤.

٧٠) پ. ی. نەڤێریانۆڤ، س. پ، ل ١٦٨.

٧١) نەجاتی عەبدوڵڵا، شۆڕشی شێخ عوبەیدوڵڵای نەهری لە بەڵگەنامەکانی فەرەنسیدا١٨٧٩_١٨٨٢، سلێمانی، ٢٠٠٤، ل ل٢٢_٢٣.

٧٢) حەمید بۆز ئەرسەلان، مێژووی تورکیای هاوچەرخ، و: نەجاتی عەبدوڵڵا، چ١، هەولێر، ٢٠٠٩، ل ل ٢٠_٢١.

٧٣) کامەران مەنتك، س. پ، ل ٣٢.

٧٤) احمد محمد احمد، م. س، ص ٤١٢.

٧٥) کمال مظهر احمد، کردستان في سنوات الحرب العالمية الاولى، ص ٣١.

٧٦) کامەران محەمەد حاجی، س. پ، ل ٧٤.

٧٧) د. مجيد جعفر،کردستان- تركيا دراسة اقتصادية - اجتماعية سياسية في تحت التخلف الاستعماري، مط: اميرال، بيروت، ب.س،ص ص٩٧-٩٨.

٧٨) کمال مظهر احمد، کردستان في سنوات الحرب العالمية الاولى، ص ص ٢٤-٢٥.

٧٩) کامەران محەمەد حاجی، س. پ، ل ل ٨٤-٨٥.

٨٠) کاوە نادر قادر، س. پ، ل ٢٨.

٨١) کمال مظهر احمد، کردستان في سنوات الحرب العالمية الاولى، ص ٧٧.

٨٢) دلشاد عمر عبدالعزیز، س. پ، ل ٣٠.

٨٣) کاوە نادر قادر، س. پ، ل ل ٢٤-٢٥ ؛ گۆران ئیبراهیم ساڵح، س. پ، ل ١٧٤.

٨٤) مارك سايكس،القبائل الكرديةفي الامبراطورية العثمانية،ت: د.خليل علي مراد،مراجعة: أ.د.عبدالفتاح بوتاني،مطدار الزمان،سوريا، ٢٠٠٧،ص٢٠.

٨٥) کامەران محەمەد حاجی، س. پ، ل ل ٧٠-٧١.

٨٦) کۆمپانیای هندی رۆژهەڵاتی، کۆمپانیایەکی ئینگلیزی بەناوبانگ بوو، کۆمەڵێك بازرگانی بەناوبانگ دایانمەزراند لەساڵی ١٦٠٠ بەمەبەستی برەوپێدانی پەیوەندیەکانیان لەگەڵ هند و باشووری رۆژهەڵاتی ئاسیا و چین، دواتر گۆڕا بۆ دەزگایەکی حکومی کە مافی ئەوەی هەبێت جەنگ رابگەیەنێ و سکە لێبدا و دادگاکان پێکبهێنێ، دوای ئەوەی چەندین کارگەی لە هند دروست کرد ئینجا دەستی وەردا لەناوچەکانی تری وەك رۆژهەڵاتی دوور و ناوەراست، ئەم کۆمپانیایە رۆڵێکی کاریگەری هەبوو لە چەسپاندنی نفوزی بەریتانیا لەسەر ژمارەیەکی زۆر لە وولاتانی رۆژهەڵات ئەم کۆمپانیایە لە عێراق و کەنداو رۆڵی هەبوو، بەیارمەتی ئەو کۆمپانیایە سلێمان پاشا توانی ببێتە والی بەغدا لەساڵی١٧٨٠و بەردەوام بوو و رۆژ دوای رۆژ نفوزی زیاتر دەبوو و هەر لەرێگای بەغداوە توانی بگاتە کوردستانیش، بروانە : كمال مظهر احمد، كردستان في سنوات الحرب العالمية الاولى، ص٣٣.

٨٧) م. ن، ص ٣٣.

٨٨) ئەم بانکە لەساڵی١٨٥٦ز لە دەوڵەتی عوسمانی دامەزرا بەناوی (بانکی عوسمانی) بەسەرمایەی ئینگلیزی بەبڕی یەك ملیۆن پاوەنی ئیستەرلینی، لەساڵی١٨٦٣ بەفەرمانێکی سوڵتان ئەم بانکە گواسترایەوە بۆ بانکی دەوڵەت بەناوی (بانکی شاهانەی عوسمانی)و سەرمایەکەی بەرز بۆوە بۆ ١٠ملیۆن پاوەند، دوای بەشدار بوونی فەرەنسا لەم بانکە و لەساڵی١٨٩٣ لقی ئەم بانکە لە ویلایەتی بەغدا کرایەوە، (بروانە دلشاد عمر عزيز، س. پ، ل ٣٢).

٨٩) هـ. س، ل ٣٢.

٩٠) غارزۆنی خۆشی موژدەدەرێك بوو کە ئەندامی کۆمەڵەی رۆما بووە بۆ پروپاگەندە، لەساڵی ١٧٦٤ ز هاتۆتە کوردستان و بۆماوەی ١٨ساڵ لە ئامێدی ماوەتەوە و لێکۆڵینەوەیەکی گرنگی کردووە لەسەر رێزمانی کوردی، بروانە : ب. ليرخ، دراسات حول الاكراد و اسلافهم الخالديين الشماليين، ت: د.عبدي حاجي، ط١، سوريا، ١٩٩٤، ص٢٩.

٩١) م. ن، ص ص ٢٨-٢٩.

٩٢) م. ن، ص ١١.

٩٣) حسین مەدەنی، س. پ، ب١، ل ٢١٣.

٩٤) فەرهاد پیرباڵ، ژەنەراڵ شەریف پاشا، ل ٨٩.

٩٥) susan meiselas , op. cit , p ٢.

٩٦) حەمید بۆز ئەرسەلان، س. پ، ل ٢٠.

٩٧) خالفین، س.پ، ل ل ٤١-٤٢.

٩٨) خالفین، س. پ، ل٢١٩ ؛ کامەران محەمەد حاجی، س. پ، ل ١٠٥.

٩٩) کمال مظر احمد، کردستان في سنوات الحرب العالمية الاولى، ص ص ٦٩-٧٠ ؛ احمد محمد احمد، م. س، ص ٤٢١.

١٠٠) کەلیوباکین : سەر کونسولی روسیا بوو لەشاری وان بۆ ماوەیەکی درێژ، بڕوانە : خالفین، س. پ، ل٢١٥.

١٠١) هـ. س، ل ٢١٥.

١٠٢) هـ. س ، ل ٤٣.

١٠٣) کامەران محەمەد حاجی، س. پ، ١٠٩.

١٠٤) خالفین، س. پ، ل ٢١٧.

١٠٥) کمال مظهر احمد، کردستان في سنوات الحرب العالمية الاولى، ص ٧٨.

١٠٦) هۆگر طاهر توفیق، س. پ، ل ٢٢٩.

١٠٧) دیڤید مەکداول، مێژووی هاوچەرخی کورد، و: ئەبو بەکر خۆشناو، چ٢، هەولێر، ٢٠٠٥، ل ١٤٣.

١٠٨) کامەران مەنتك، س. پ، ل ٢٦.

١٠٩) حسین مەددنی، س. پ، ب١، ل ٢١٣.

١١٠) کامەران محەمەد حاجی، س. پ، ل ٩٢.

١١١) کەمال بورکای، س. پ، ل ل ٣٥٣ـ٣٥٤.

١١٢) د. عەبدوللا عەلیاوەیی، کوردستان لەسەردەمی دەوڵەتی عوسمانیدا، سلێمانی، ٢٠٠٤، ل ١١٣.

١١٣) کمال مظهراحمد،کردستان في سنوات الحرب العالمية الاولى، ص ص ٥٤-٥٥.

١١٤) خالفین، س. پ، ل ١٦٩.

١١٥) هـ. س، ل ٢٣ ؛ عەبدوللا عەلیاوەیی، س. پ، ل ١١٣.

١١٦) کەمال بورکای، س. پ، ل ٣٥٤.

١١٧) د. ماریا گێز، پێشبینیەکانم بۆ داهاتوو وای لێکردم کە راپۆرتێك لەسەر کوردستان بنووسم، گۆڤاری زانکۆ پرێس، ژ: (٥)، هەولێر، ٢٠١٠، ل ٧.

١١٨) کمال مظهر احمد، کردستان في سنوات الحرب العالمية الاولي، ص ٦٨.

١١٩) کامەران مەنتك، س. پ، ل ٣٩.

١٢٠) کامەران محەمەد حاجی، س. پ، ل ٢٢٧.

١٢١) کمال بورکای، س. پ، ل ٢٥٣.

١٢٢) حسین مەدەنی، س. پ، ب١، ل ٢١٣.

١٢٣) susan meiselas , op. cit , p ٢.

١٢٤) كەیوان ئازاد ئەنوەر، س. پ، ل ل ١٤٣–١٤٤.

١٢٥) موحەممەد ئەمین زەكی بەگ، خولاصەیەكی تاریخی كوردو كوردستان لەزۆر قەدیمەوە تادەوری ئیمرۆ، چ٤، هەولێر، ٢٠٠٦، ل ١٧٩.

١٢٦) د. سعدي عثمان هروتي، كوردستان و الامبراطورية العثمانية، ط١، مط: خاني، دهوك، ٢٠٠٨، ص ١٧٣.

١٢٧) كنیاز ڤارەنتسۆڤ : حاكمی روسیا بوو لەناوچەی قەفقاس لەماوەی شەڕی(قەرم) ١٨٥٣–١٨٥٦ز لە نێوان روسیا و ئیمپراتۆریەتی عوسمانی، بڕوانە : ئەڤێریانۆڤ، س. پ، ل ١٠٢.

١٢٨) هـ. س، ل ١٠٢.

١٢٩) عەبدوڵلا عەلیاوەیی، س. پ، ل ٦٤.

١٣٠) ن. لازاریف، س. پ، ل ٢٢٤.

١٣١) علی تتر توفيق، الحياة السياسية في كوردستان ١٩٠٨–١٩٢٧، ت: تحسين ابراهيم الدوسكي، ط١، دهوك، ٢٠٠٧، ص٣٨.

١٣٢) ن.لازاریف، س. پ، ل ٢٢٨.

١٣٣) محەمەد سوهەیل تەقوش، س. پ، ل ٥١٣.

١٣٤) ن.لازاریف، س. پ، ل ٢٣٥.

١٣٥) قارس شارێكە لە هەرێمی قەفقاس، ساڵانی حەفتای سەدەی نۆزدەم زۆربەی دانیشتوانەكەی كورد بوون، جگە لە كورد گەلانی قەفقاسیشی تێدا ژیاوە، دوای داگیركردنی لە لایەن روسەكانەوە لەشەڕی ١٨٧٧ز دانیشتوانەكەی توشی راونان و دەركردن و كوشتن بوونەوە تا كوردەكان بوونە كەمینەی دانیشتوان، بڕوانە : د.ئەفراسیاو هەورامی، كوردستانی پشت قەفقاس، سلێمانی، ٢٠٠٦، ل ل ٥٨–٥٩.

١٣٦) خالفین، س. پ، ل ١٤٦ ؛ ئارام عەلی سەعید، دۆزی كورد لەنێوان بیری نەتەوەیی و ئایینیدا، چ١، چا: تیشك، ٢٠٠٩، ل ١٠٦.

١٣٧) susan meiselas , op. cit , p ٢.

١٣٨) هۆگر طاهر توفیق، س. پ، ل ل ٢٢٦–٢٢٧.

١٣٩) عەبدوڵلا عەلیاوەیی، س. پ، ل ل ٩١–٩٢.

١٤٠) كامەران مەنتك، س. پ، ل ٢٧.

١٤١) ن. لازاریف، س. پ، ل ٢٢٩.

١٤٢) قوتور: شوێنێکی ستراتیژی گرنگ و هەستیاری هەبوو لە سنوری نێوان عوسمانی و روس و ئێران دا، هەرچەندە بەپێی پەیمانی سان ستیڤانۆ ١٨٧٨ز و خاڵی٦٠ لەپەیمانی بەرلین باس لەوە کراوە کە قوتور بەشێکە لە ئێران بەلام عوسمانیەکان هەموو توانایەکیان دەخستە گەڕ بۆ دەست بەسەر داگرتنی ئەم ناوچەیە، بروانە : حسین مەدەنی، س. پ، ب٢، ل٧٧.

١٤٣) هـ. س، ب٢، ل ل ١٥٦–١٥٧.

١٤٤) کامەران مەنتك، س. پ، ل ٣٤.

١٤٥) هـ. س، ل ٣٨.

١٤٦) ن. لازاریف، س. پ، ل ٢٥٥ ؛ کامەران محەمەد حاجی، س. پ، ل ٢٤٣.

١٤٧) صالح محمد حسن، شریف باشا حیاته و دورە السیاسي١٨٦٥-١٩٥١، ط١، لبنان، ٢٠٠٦، ص ١٧٥.

١٤٨) کامەران محەمەد حاجی، س. پ، ل ٢٤٥.

١٤٩) علی تتر توفیق، م. س، ص ص ٤١-٤٢.

١٥٠) کامەران محەمەد حاجی، س. پ، ل ٢٣٦.

١٥١) کامەران مەنتك، س. پ، ل ٤٠.

١٥٢) عبدالرحمن قاسملۆ، س. پ، ل ل ٤٨-٤٩ ؛ کامەران محەمەد حاجی، س. پ، ل ٢٤٦ ؛ د. ئەحمەد عوسمان ئەبوبەکر، کورد و کوردستان لە کۆمەڵە وتارێکی مێژووییدا، و : ئازاد عوبێد سالح، چ ١، چا : وەزارەتی پەروەردە، هەولێر، ٢٠٠٥، ل ١٣١.

١٥٣) علی تتر توفیق، م. س، ص ٣٦.

١٥٤) د. سەعدی عوسمان، بزاڤی رزگاریخوازی کوردی، چ١، هەولێر، ٢٠٠٦، ل ل٤٠-٤١.

١٥٥) اسماعیل محمد حصاف، م. س، ص ١٧٦ ؛ د.ئەفراسیاو هەورامی، کورد لەئەرشیفی روسیاو سۆڤیەتدا، چ١، چا: پەروەردە، هەولێر، ٢٠٠٦، ل ٨٤.

١٥٦) کەمال بورکای، س. پ، ل ٣٨٧.

١٥٧) مینورسکی، کورد، و: حمە سەعید حمە کەریم، چا : زانکۆ، هەولێر، ١٩٨٣، ل ل ٥٥-٥٦.

١٥٨) ن.لازاریف، س. پ، ل ٢٢٣.

١٥٩) عەبدوڵلا عەلیاودیی، س. پ، ل ٧٧.

١٦٠) م. رەسول هاوار، س. پ، ل ل ٢٩٧-٢٩٨.

١٦١) کورد لەجەنگی روسیا لەگەڵ ئێران و تورکیادا، ل ١٢٥.

١٦٢) هـ. س، ل ١٦٢.

١٦٣) عەبدوڵلا عەلیاوەیی، س. پ، ل ٧٩.

١٦٤) خالفین، س. پ، ل ١٠٩ ؛ کەمال بورکای، س. پ، ل ٣٤٨.

١٦٥) ن. لازاریف، س. پ، ل ٢٢٣.

١٦٦) کامەران محەمەد حاجی، س. پ، ل ١٧٩.

١٦٧) نەمرود ڕەسام : لەبنچینەدا خەڵکی شاری موسڵە، هەندێ لە سەرچاوەکان بە کونسوڵی بەریتانیا و لە هەندێکی تر بەسیخوڕی کونسوڵی بەریتانیا لە موسڵ ناوبراوە، ناوبراو ڕۆڵێکی کاریگەری هەبوو لە دامرکانەوەی ڕاپەرینەکەی یەزدان شێر و دەستگیر کردنی و ڕەوانە کردنی بۆ ئەستەنبوڵ، بڕوانە : علی تتر تۆفیق، م. س، ص ٣٧.

١٦٨) شوکرولای بابان، مێژووی کوردو کوردستان، چا : شڤان، ٢٠٠٤، ل ٢١٢.

١٦٩) باسیل نیکیتین، م. س، ص ١٩٧. د. حسن جاف، کێشەی نێودەوڵەتان لەسەرەتا و ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەهەمدا و ڕەنگدانەوەی لە کوردستاندا، گۆڤاری (مێژوو)، ژ: (١١)، هەولێر، ٢٠٠٩، ل ل ١١٢-١١٣.

١٧٠) م. ڕەسوڵ هاوار، س. پ، ل ٢٩٨.

١٧١) عەبدوڵلا عەلیاوەیی، س. پ، ل ٨٠.

١٧٢) مینۆر سکی، س. پ، ل ٥٦.

١٧٣) کەمال بورکای، س. پ، ل ٣٥٠.

١٧٤) كمال مظهر احمد، كردستان في سنوات الحرب العالمية الاولى، ص١٢٢.

١٧٥) د. عثمان علي، الكرد في الوثائق العثمانية، ط١، اربيل، ٢٠١٠، ص ١١٧.

١٧٦) د. كاظم حبيب، لمحات من نضال حركة التحرير الوطني للشعب الكردي في كردستان العراق، ط٢، اربيل، ٢٠٠٥، ص ٥١ ؛ حسین مەدەنی، س. پ، ب٢، ل ٤٣٣.

١٧٧) ساغ قەفتان، سێ لێکۆڵینەوەی مێژوویی، چ١، چا : سەردەم، سلێمانی، ٢٠٠٩، ل ٢٨٧ ؛ د. شاکر خەسباك، کوردو مەسەلەی کورد، و: ئەمجەد شاکەلی، چ٢، چا: ئاراس، هەولێر، ٢٠٠٥، ل ل ٣٢-٣٣.

١٧٨) د.محمد زكي البرواري، الكورد و الدولة العثمانية، ط١، مط: دار الزمان، سوريا، ٢٠٠٩، ص ص ٢٣٥-٢٣٦.

١٧٩) محەمەد ساڵح عقراوی، کوردو دەوڵەتی سەربەخۆ بەپێی بەڵگەنامە نێودەوڵەتیەکان، پ: کەمال غەمبار، چ١، چا: خانی، دهۆك، ٢٠٠٧، ل ٧.

١٨٠) عەبدوڵلا عەلیاوەیی، س. پ، ل ١٠١.

١٨١) کەمال بورکای، س. پ، ل ٣٨٩.

١٨٢) خالفين، س. پ، ل ١٦٥.

١٨٣) محمد زكي البرواري، م. س، ص ص ٢٣٣-٢٣٤.

١٨٤) عەبدوڵلا عەلیاوەیی، س. پ، ل ٩٩.

١٨٥) جەلیلی جەلیل، بیرەوەری عەبدولرەزاق بەدرخان، و: شوکور مستەفا، چ١، هەولێر، ب. س، ل ل ٢٤-٢٥.

١٨٦) عەبدوڵلا عەلیاوەیی، س. پ، ل ١١٨ ؛ بۆ زانیاری زیاتر لەبارەی ئەم شۆڕشە بڕوانە : جەلیلی جەلیل، راپەڕینی کوردەکان.

١٨٧) محەمەد حەمەباقی، راپەڕینی هەمزاغای مەنگوڕ لەبەڵگەنامەکانی قاجاریدا ١٨٥٤-١٨٨١، چ١، چا: وەزارەتی پەروەردە، هەولێر، ٢٠٠٢، ل٨؛ م. رەسوڵ هاوار، س. پ، ل ل ٣٣٤-٣٣٥ ؛ د. ئەحمەد عوسمان ئەبوبەکر، س. پ، ل ٨.

١٨٨) کەمال بورکای، س. پ، ل ٤٠٠.

١٨٩) عەبدوڵلا عەلیاوەیی، س. پ، ل ل ١٤٩-١٥٠.

١٩٠) جرجيس فتح الله، م. س، ص ٥٠ ؛ د. ئەفراسیاو هەورامی، کورد لە ئەرشیفی روسیا و سۆڤیەتدا، ل ٨٤.

١٩١) عەبدوڵلا عەلیاوەیی، س. پ، ل ١٥١ ؛ سەعدی عوسمان، بزاڤی رزگاریخوازی نیشتمانی لەکوردستانی رۆژهەڵات ١٨٨٠ – ١٩٣٩، چا: ئاراس، هەولێر، ٢٠٠٧، ل ٢٥.

١٩٢) حسین مەدەنی، س. پ، ب١، ل ١٧٩.

١٩٣) عەبدوڵلا عەلیاوەیی، س. پ، ل ١٤٥.

١٩٤) ئەرشیفی وەزارەتی کاروباری دەرەوەی ئێران، کارتۆنی (١٧)دۆسیەی (١٢/ع) بەڵگەی ژمارە(٥٨٥، ٥٩٧، ٥٩٨، ٦٠٢،٦٠٣،٦٠٧)، لە : سەعدی عوسمان هەروتی، بزاڤی رزگاریخوازی نیشتمانی، ل ٢٦.

١٩٥) سەعدی عوسمان، بزاڤی رزگاریخوازی کوردی، ل ٤٩.

١٩٦) جرجيس فتح الله، م. س، ص ٧٨ ؛ کەمال بورکای، س. پ، ل ٤٠٠.

١٩٧) عەبدوڵلا عەلیاوەیی، س. پ، ل ١٥٣.

١٩٨) هـ. س، ل ل ١٣٠-١٣١ ؛ محەمەد حەمەباقی، س. پ، ل ٦٤.

١٩٩) خالفين، س. پ، ل ٢٠٨.

٢٠٠) هـ. س، ل ل ١٤٧-١٤٨ ؛ علي تتر توفيق، م. س، ص ص ٤٣-٤٤ ؛ د. ئەحمەد عوسمان ئەبوبەکر، س. پ، ل ١٣٥.

٢٠١) ئەرشیفی وەزارەتی جەنگ، بەشی سوپای زەمینی(پاریس)، کارتۆنی ژمارە TN١٦٢٦ پاشکۆی راپۆرتی ژمارە ١٤٩، بروسکەیەکی جێگری کونسوڵی فەرەنسا لە موسڵ بە مێژووی ٦/١٠/١٨٧٩ز، بە وەرگرتن لە: سەعدی عوسمان، بزاڤی رزگاریخوازی نیشتمانی، ل ١٥.

٢٠٢) عەبدوڵلا عەلیاوەیی، س. پ، ل ١٢٨ ؛ سەعدی عوسمان، بزاڤی رزگاریخوازی نیشتمانی، ل ١٧.

٢٠٣) کامەران محەمەد حاجی، س. پ، ل ٢٦٩.

٢٠٤) محەمەد ئەمین زەکی بەگ، س. پ، ١٧٥.

٢٠٥) عەبدوڵلا عەلیاوەیی، س. پ، ل ل ١٦٦-١٦٧ ؛ خالید مەحمود کەریم، سیاسەتی دەوڵەتی عوسمانی بەرامبەر بەعەشیرەتە کوردەکان لەباشوری کوردستان ١٨٦٩-١٩١٤ز، نامەی ماستەری زانکۆیی بلاونەکراوە لەکۆلێژی زانستە مرۆڤایەتیەکان، زانکۆی سلێمانی، ٢٠١٠، ل ١٠٤.

٢٠٦) م. رەسوڵ هاوار، س. پ، ل ٣٩٦.

٢٠٧) عبدالرحمن قاسملو، س. پ، ل ٤٨.

٢٠٨) عەبدوڵلا عەلیاوەیی، س. پ، ل ١٧٢.

٢٠٩) کامەران محەمەد حاجی، س. پ، ل ٢٤١.

٢١٠) پ. ی. ئەڤێریانۆڤ، س. پ، ل ل ٣٠٨ — ٣١٠.

٢١١) عەبدوڵلا عەلیاوەیی، س. پ، ل ل ١٧٢-١٧٣.

٢١٢) هـ. س، ل ١٣٧.

٢١٣) محەمەد ئەمین زەکی بەگ، س. پ، ل ١٨١.

٢١٤) کامەران محەمەد حاجی، س. پ، ل ١٠٧.

٢١٥) هـ. س، ل ٢٣٩.

٢١٦) دیڤید مەکداول، س. پ، ل ١٠٩.

٢١٧) مارك سایکس، م. س، ص ص ١٦-١٧.

٢١٨) ساڵح هەرکی، بەشێك لە پەیمانەکانی دژی کورد، چ١، چا: منارە، هەولێر، ٢٠٠٨، ل ل ٤١-٤٢.

٢١٩) هـ. س، ل ٤١.

٢٢٠) سان ستیڤانۆ: شارێکە دەکەوێتە رۆژئاوای ئەستەنبوڵ ورێککەوتننامەکە لەم شارەدا مۆرکرا، بڕوانە: کۆمەڵێ نووسەر، س. پ، ل ل ٢٢٥-٢٢٦.

٢٢١) د. علی محمد الصلابي، الدولة العثمانية عوامل النهوض و اسباب السقوط، لبنان- بيروت، ٢٠٠٨، ص ص ٤١٩-٤٢٠.

٢٢٢) اسماعيل محمد حصاف، م. س، ص ١٥٩.

٢٢٣) عەبدوڵلا عەلیاوەیی، س. پ، ل ٩٤.

٢٢٤) خالفین، س. پ، ل ل ١٥٤-١٥٥.

٢٢٥) ن.لازاریف، س. پ، ل ٢٣٨.

٢٢٦) پ. ی. نەڤێریانۆڤ، س. پ، ل ٢٢٨.

٢٢٧) عەبدوڵلا عەلیاوەیی، س. پ، ل ٩٥.

٢٢٨) کامەران مەنتك، س. پ، ل ٢٧.

٢٢٩) عەبدوڵلا عەلیاوەیی، س. پ، ل ٩٥.

٢٣٠) ن. لازاریف، س. پ، ل ٢٣٨.

٢٣١) خالفین، س. پ، ل ١٧٢.

٢٣٢) کۆمەڵێ نووسەر، س. پ، ل ل ٢٢٦-٢٢٧ ؛ علی محمد الصلابي، م. س، ص ص ٤٢١-٤٢٢.

٢٣٣) شکیب عقراوي، سنوات المحنة في کردستان، ط١، مط: منارة، اربیل، ٢٠٠٧، ص ٤٦٤ ؛ حەسەن عەلی خان گەرووسی، شۆرشی شێخ عوبەیدوڵلای نەهری لەبەڵگەنامەکانی قاجاریدا، و: محەمەد حەمە باقی، هەولێر، ٢٠٠٧، ل ٧ ؛ محەمەد حەمەباقی، س. پ، ل ٩.

٢٣٤) صالح محمد حسن، م. س، ص ١٥١.

٢٣٥) کەمال بورکای، س. پ، ل ٣٦٣.

٢٣٦) د. هشام سوادي هاشم، تاریخ العرب الحدیث ١٥١٦-١٩١٨، ط١، الاردن، ٢٠١٠، ص ٨٥.

٢٣٧) پ. ی. نەڤێریانۆڤ، س. پ، ل ٢٢٨.

٢٣٨) کاظم حبیب، م. س، ص ٥٣.

٢٣٩) اسماعیل محمد حصاف، م. س، ص ص ١٥١-١٥٢.

٢٤٠) susan meiselas , op. cit , p ٢.

٢٤١) ن. لازاریف، س. پ، ل ٢١٥.

٢٤٢) عەبدوڵلا عەلیاوەیی، س. پ، ل ١٢٥.

٢٤٣) ن. لازاریف، س. پ، ل ل ١٦٩-١٧٠.

٢٤٤) مجید جعفر، م. س، ص ٥٨١.

٢٤٥) عەبدوڵلا عەلیاوەیی، س. پ، ل ٧٤.

٢٤٦) ن.لازاریف، س. پ، ل ١٦٨.

٢٤٧) پ. ی. نەڤێریانۆڤ، س. پ، ل ١٣٤.

٢٤٨) حەسەن نەرفەع، کوردەکان، و: حامید گەوهەری، چ١، چا: منارە، هەولێر، ٢٠٠٧، ل ٥٠.

٢٤٩) جاسم توفیق خۆشناو، س. پ، ل ١٤٧.

٢٥٠) کورد لەسەدەی نۆزدەم وبیستەمدا، و : حمە کەریم عارف، چ٢، چا: شڤان، سلێمانی، ٢٠٠٤، ل ١٩.

٢٥١) دیرك کینان، الكرد و كردستان، ت: صلاح عرفان، مركز الدراسات الكوردية، سليماني، ٢٠٠٧، ص ٢٨.

٢٥٢) سەعدی عوسمان، بزاڤی رزگاریخوازی کوردی، ل ٢٨.

٢٥٣) د. س، ل ٤٧.

٢٥٤) علی تتر توفیق، م. س، ص ٤٣.

٢٥٥) د. بلەچ شێرکۆ، کێشەی کورد مێژینە و ئێستای کورد، و: محەمەد حەمە باقی، چ٣، کوردستان، ١٩٩١، ل ٤٠.

٢٥٦) عەبدوڵڵا عەلیاوەیی، س. پ، ل ١٨١.

٢٥٧) پۆل دۆمۆن، سەردەمی تەنزیمات ١٨٣٩-١٨٧٨ز، و: نەجاتی عەبدوڵڵا، چ١، هەولێر، ٢٠٠٨، ل ٥٨.

٢٥٨) علی تتر توفیق، م. س، ص ٤٩.

٢٥٩) شاکر خەسباك، س. پ، ل ٣٤.

٢٦٠) حسین مەدەنی، س. پ، ب١، ل ٢١٥.

٢٦١) مەلامەحمود خەڵکی بایەزیدی کوردستانی باکورە لە دەوروبەری ساڵی ١٧٩٧ز لە دایك بووە، شارەزای زمانەکانی عەرەبی و فارسی و تورکی بووە، مەلایەکی بێ هاوتای نەك هەربایەزید بەڵکو هەموو کوردستان بووە، هەوڵیداوە کارەکەی شەرەفخانی بەدلیسی تەواو بکات و مێژووی کورد بنوسێتەوە لەو شوێنەی کە شەرەفخان کۆتایی پێهێناوە، بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە د.کمال مەزهەر ئەحمەد، مێژوو، چا : دار افاق، بەغدا، ١٩٨٣، ل ل ١٢٥-١٣٢.

٢٦٢) هـ. س، ل ١٢٧.

٢٦٣) کامەران محەمەد حاجی، س. پ، ل ل ٥٣-٥٤.

٢٦٤) فاضل رسول، م. س، ص ٤٨.

٢٦٥) کامەران محەمەد حاجی، س. پ، ل ١١٨.

٢٦٦) پۆل دۆمۆن، س. پ، ل ٥٨.

٢٦٧) کەمال بۆرکای، س. پ، ل ٣٥٩.

٢٦٨) د.نوری دەرسیمی، دەرسیم لەمێژووی کوردستاندا، وت. ئەحمەد فەتاح، چ١، هەولێر، ٢٠٠١، ل١٠٦ ؛ عەبدوڵڵا عەلیاوەیی، س.پ، ل١٧٤-١٧٥.

٢٦٩) علی تتر توفیق، م. س، ص ٥٠.

٢٧٠) مالیسانژ، جەمعییەتی تەعاون وتەرەقی کوردو رۆژنامەگەری،و: زریان رۆژهەلاتی، پێداچوونەوەی: سدیق سالح، چا:حەمدی،سلێمانی، ٢٠٠٧، ل ٢٠.

٢٧١) عەبدوڵلا عەلیاوەیی، س. پ، ل ١٨٣.

٢٧٢) عەبدوڵلا عەلیاوەیی، س. پ، ل ١٨٧.

٢٧٣) بۆ دەقی ژمارەکانی رۆژنامەی(کوردستان) بروانە: کوردستان یەکەمین رۆژنامەی کوردی ١٨٩٨-١٩٠٢ز کۆکردنەوە و پێشەکی، کەمال فوئاد، بەشە تورکیەکەی : شێرزاد عبدالکریم، سلێمانی،٢٠٠٠.

٢٧٤) سەعدی عوسمان، بزاڤی رزگاریخوازی کورد، ل ٥١.

٢٧٥) بلەچ شێرکۆ، س. پ، ل ٤٥.

٢٧٦) عەبدوڵلا عەلیاوەیی، س. پ، ل ل ١٨٨-١٨٩.

٢٧٧) هۆگر طاهر توفیق، س. پ، ل ٢٣٣.

## لیستی سەرچاوەکان

### یەکەم / نامەی زانکۆیی بلاونەکراوە :

١) خالید محمود کەریم، سیاسەتی دەوڵەتی عوسمانی بەرامبەر بە عەشیرەتە کوردەکان لەباشوری کوردستان ١٨٦٩ - ١٩١٤ ز، نامەی ماستەر، کۆلێژی زانستە مرۆڤایەتیەکان، زانکۆی سلێمانی، ٢٠١٠.

٢) دلشاد عمر عبدالعزیز، نەوتی کەرکوك و ململانێی زلهێزەکان ١٨٩٠ – ١٩٢٧، نامەی ماستەر، کۆلێژی زانستە مرۆڤایەتیەکان، زانکۆی سلێمانی، ٢٠١٠.

### دووەم / کتێب :

#### أ / بەزمانی کوردی :

٣) ئارام عەلی سەعید، دۆزی کورد لەنێوان بیری نەتەوەیی و ئایینیدا، چ١، چا: تیشك، ٢٠٠٩.

٤) د. ئەحمەد عوسمان ئەبوبەکر، کوردو کوردستان لەکۆمەڵە وتارێکی مێژووییدا، و: ئازاد عوبێد سالح، چ١، چا: وەزارەتی پەروەردە، هەولێر، ٢٠٠٥.

٥) د. ئەفراسیاو هەورامی، کوردستانی پشت قەفقاس، سلێمانی، ٢٠٠٤.

٦) د. ئەفراسیاو هەورامی، کورد لەئەرشیفی روسیاو سۆڤیەتدا، چ١، چا : وەزارەتی پەروەردە، هەولێر، ٢٠٠٦.

٧) بەختیار سەعید مەحمود شوانی، کەرکوك لەسەدەی نۆزدەهەمدا، چ١، سلێمانی، ٢٠٠٩.

٨) د. بلەچ شێرکۆ، کێشەی کورد مێژینە و ئێستای کورد، و: محەمەد حەمە باقی، چ٢، کوردستان، ١٩٩١.

٩) پ.ی.ئەڤێریانۆڤ کورد لەجەنگی روسیا لەگەڵ ئێران وتورکیادا، و: د. ئەفراسیاو هەورامی، سلێمانی، ٢٠٠٤.

١٠) پۆل دۆمۆن، سەردەمی تەنزیمات ١٨٣٩-١٨٧٨ز، و: نەجاتی عەبدوڵلا، چ١، هەولێر، ٢٠٠٨.

١١) د. جاسم تۆفیق خۆشناو، مەسەلەی کورد و یاسای نێودەوڵەتان، سلێمانی، ٢٠٠٢.

١٢) جەلیلی جەلیل، بیرەوەری عەبدولرەزاق بەدرخان، و: شوکور مستەفا، چ١، هەولێر، ب.س.چ.

١٣) د. جەلیلی جەلیل، کوردەکانی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی، و: د. کاوس قەفتان، بەغداد، ١٩٨٧.

١٤) حەسەن ئەرفەع، کوردەکان، و: حامید گەوهەری، چ١، هەولێر، چا: منارە، ٢٠٠٧.

١٥) حەسەن عەلی خان گەرووسی، شۆرشی شێخ عوبەیدوڵلای نەهری لەبەڵگەنامەکانی قاجاریدا، و: محەمەد حەمە باقی، هەولێر، ٢٠٠٧.

١٦) حەمید بۆز ئەرسەلان، مێژووی تورکیای هاوچەرخ، و: نەجاتی عەبدوڵلا، هەولێر، چ١، ٢٠٠٩.

١٧) حسین مەدەنی، کوردستان و ستراتیژیەتی دەوڵەتان، ب ١٢، چا: رۆژهەلات، هەولێر، ٢٠٠٩.
١٨) دیڤید مەکداول، مێژووی هاوچەرخی کورد، و: ئەبوبەکر خۆشناو، چ٢، هەولێر، 2005.
١٩) سالح قەفتان، سێ لێکۆلینەوەی مێژوویی، چ١، چا : سەردەم، سلێمانی، ٢٠٠٩.
٢٠) سالح هەرکی، بەشێك لە پەیمانەکانی دژی کورد، چ١، چا : منارە، هەولێر، ٢٠٠٨.
٢١) د.سەعدی عوسمان، بزاڤی رزگاریخوازی کوردی، چ١، هەولێر، ٢٠٠٦.
٢٢) د. سەعدی عوسمان، بزاڤی رزگاریخوازی نیشتمانی لەکوردستانی رۆژهەلات ١٨٨٠ – ١٩٣٩، چا: ناراس، هەولێر، ٢٠٠٧.
٢٣) د. شاکر خەسباك، کوردو مەسەلەی کورد، و: ئەمجەد شاکەلی، چ٢ چا: ناراس، هەولێر، 2005.
٢٤) شوکرو لای بابان، مێژووی کوردو کوردستان، چا: شڤان، ٢٠٠٤.
٢٥) شێخ سدیق، پاکتاوکردنی رەگەزی لەمێژووی کورددا، چ١، چا: وەزارەتی کشتوکاڵ، هەولێر، 2005.
٢٦) د. عەبدوڵلا عەلیاوەیی، کوردستان لەسەردەمی دەوڵەتی عوسمانیدا، سلێمانی، ٢٠٠٤.
٢٧) د. عبدالرحمن قاسلو، کوردستان و کورد، و: عبدالله حسن زادە، ب.ش.چ، ١٩٧٣.
٢٨) د. فەرهاد پیربال، ژەنەرال شەریف پاشا١٨٦٥-١٩٥١، چ١، سلێمانی، ٢٠٠١.
٢٩) د. فەرهاد پیربال، کورد لەدیدی رۆژهەلاتناسەکانەوە، چا : شڤان، ٢٠٠٩.
٣٠) فوئاد حەمە خورشید، کەرکوك لە بەلگەنامەکاندا، و: نەریمان عەبدوڵلا خۆشناو، چ١، چا: منارە، هەولێر، ٢٠٠٧.
٣١) کامەران مەنتك، کوردستان لەململانێی نێودەوڵەتی وناوچەییدا١٨٩٠-١٩٢٣، چ١، چا:سەردەم، سلێمانی، ٢٠٠٠.
٣٢) کامەران محەمەد حاجی، کوردستان لە بازنەی کێشەی رۆژهەلاتیدا ١٨٠٠ – ١٩٠٠، چ١، چا : رۆشنبیری، هەولێر، ٢٠٠٧.
٣٣) کاوە نادر قادر، رۆڵی ئەوت لەچارەنووسی گەلی کوردستاندا، چا: روون، سلێمانی، ٢٠٠٧.
٣٤) کەمال بورکای، کوردو کوردستان، و: عەلی فەتحی، چ١، چا: منارە، هەولێر، ٢٠٠٨.
٣٥) کەیوان ئازاد ئەنوەر، چەرەدیەك لەمێژووی کورد، چ٥، چا : رەهەند، ٢٠٠٨.
٣٦) کریس کۆچێرا، کورد لەسەدەی نۆزدەم وبیستەمدا، و: حمە کەریم عارف، چ٢، سلێمانی، چا: شڤان، ٢٠٠٤.
٣٧) د. کمال مەزهەر ئەحمەد، مێژوو، چا: دار افاق، بەغدا، ١٩٨٣.

٢٨) کۆمەڵێ لەپسپۆران و ئەفسەرانی سیاسی ئینگلیزی، کوردو کورستان، و: حوسێن نێرگزەجاڕ و حسین احمد جاف، چ١، چا: وەزادەتی پەروەردە، هەولێر، ٢٠٠٢.

٢٩) کۆمەڵێ نوسەر، عوسمانیەکان،و: سەلام عەبدولکەریم، چ٢، چا: گەنج، سلێمانی، ٢٠٠٨.

٤٠) گۆران ئیبراهیم سالەح، کەرکوك لەسەردەمی دەوڵەتی عوسمانیدا ١٨٧٦-١٩٠٩، چا: مەحوی، سلێمانی، ٢٠٠٧.

٤١) م. رەسول هاوار، کورد و باکوری کوردستان لەسەرەتای مێژووە وە هەتا شەڕی دووهەمی جیهانی، ب١، چ١، چا: خاك، سلێمانی، ٢٠٠٠.

٤٢) م. س. لازاریف، مێژووی کوردستان، و: وشیار عەبدوڵڵا، هەولێر، ٢٠٠٨.

٤٣) مالمیسانژ، جەمعییەتی تەعاون و تەرەقی کورد و رۆژنامەگەری، و:زریان رۆژهەلاتی، پێداچوونەوەی: سدیق سالح، سلێمانی، چا: حەمدی،٢٠٠٧.

٤٤) مەحەمەد سالح عقراوی، کوردو دەوڵەتی سەربەخۆ بەپێی بەلگەنامە نێودەوڵەتیەکان، پ: کەمال غەمبار، چ١، چا: خانی، دهۆك، ٢٠٠٧.

٤٥) محەمەد حەمەباقی، راپەڕینی هەمزاغای مەنگوڕ لە بەلگەنامەکانی قاجاریدا ١٨٥٤-١٨٨١، چ١، چا: وەزارەتی پەروەردە، هەولێر، ٢٠٠٢.

٤٦) د. محەمەد سوهەیل تەقوش، عوسمانیەکان لەدامەزراندنی دەوڵەتەوە تا کودەتا بەسەر خەلافەتدا، و: مەریوان خۆشناو و مستەفا سەید مینە، چ١، هەولێر، ٢٠٠٩.

٤٧) موحەممەد ئەمین زەکی بەگ، خولاصەیەکی تاریخی کورد و کوردستان لە زۆر قەدیمەوە تا دەوری ئیمڕۆ، چ٤، هەولێر، ٢٠٠٦.

٤٨) مینورسکی، کورد، و: حەمە سەعید حەمە کەریم، هەولێر، چا: زانکۆی سەلاحەددین، ١٩٨٣.

٤٩) ن. ا. خالفین، خەبات لەرێ ی کوردستاندا، و: جەلال تەقی، سلێمانی، ١٩٧١.

٥٠) نەجاتی عەبدوڵلا، شۆڕشی شێخ عوبەیدوڵلای نەهری لەبەلگەنامەکانی فەرەنسیدا١٨٧٩-١٨٨٢، سلێمانی، ٢٠٠٤.

٥١) د. نوری دەرسیمی، دەرسیم لەمێژووی کوردستاندا، و: د. ئەحمەد فەتاح دزەیی، چ١، هەولێر، ٢٠٠١، ل١٠٦.


### ب / بەزمانی عەرەبی :


٥٢) د. احمد محمد احمد، اکراد الدولة العثمانية، ط١، مط: حجي هاشم، اربيل، ٢٠٠٩.

٥٣) ارشاك سافراستيان، الكورد و كردستان، ت: احمد محمود الخليل، ط١، مط: دار الزمان، سوريا، ٢٠٠٨.

٥٤) د. اسماعيل محمد حصاف، كوردستان و المسالة الكوردية، ط١، مط: خاني، دهوك، ٢٠٠٩.

٥٥) ب. ليرخ، دراسات حول الاكراد واسلافهم الخالديين الشماليين، ت: د.عبدى حاجى، ط١، سوريا، ١٩٩٤.

٥٦) باسيل نيكيتين، الاكراد اصلهم، تاريخهم، مواطنهم، عقائدهم، عاداتهم، ادابهم، لهجاتهم، قبائلهم، قضاياهم، طرائف عنهم، مط: دار الروائع، بيروت، ب. س.

٥٧) جرجيس فتح الله، ثورة الشيخ عبيدالله النهري، ط٢، مط: ناراس، اربيل، ٢٠١٠.

٥٨) ديرك كينان، الكردو كردستان، و: صلاح عرفان، سليمانى، مركز الدراسات الكوردية، ٢٠٠٧.

٥٩) د. سعدي عثمان هروتي، كوردستان الامبراطورية و العثمانية، ط١، مط: خاني، دهوك، ٢٠٠٨.

٦٠) شكيب عقراوي، سنوات المحنة في كردستان، ط١، اربيل، مط: منارة، ٢٠٠٧.

٦١) صالح محمد حسن، شريف باشا حياته و دورد السياسي ١٨٦٥-١٩٥١، ط١، لبنان، ٢٠٠٦.

٦٢) د. عثمان على، الكرد في الوثائق العثمانية، ط١، اربيل، ٢٠١٠.

٦٣) على تتر توفيق، الحياة السياسية في كوردستان١٩٠٨-١٩٢٧، ت: تحسين ابراهيم الدوسكي، ط١، دهوك، ٢٠٠٧.

٦٤) د. على محمد الصلابي، الدولة العثمانية عوامل النهوض و اسباب السقوط، لبنان- بيروت، ٢٠٠٨.

٦٥) د. فاضل رسول، كردستان و السياسة السوفيتية في الشرق الاوسط، ت : عثمان نعمان، مراجعة : ماموستا جعفر، مط : محمدى، سليمانى، ٢٠٠٨.

٦٦) د.كاظم حبيب، لمحات من نضال حركة التحرير الوطني للشعب الكردي في كردستان العراق، ط٢، اربيل، ٢٠٠٥.

٦٧) د. كمال مظهر احمد، كوردستان في سنوات الحرب العالمية الاولى، ت: محمد الملاعبدالكريم، ط٢، بغداد، ١٩٨٤.

٦٨) مارك سايكس، القبائل الكردية في الامبراطورية العثمانية، ت: أ.د.خليل على مراد، متابعة: أ.د.عبدالفتاح على بوتانى، ط١، مط: دار الزمان، سوريا، ٢٠٠٧.

٦٩) د. مجيد جعفر، كردستان-تركيا دراسة اقتصادية اجتماعية سياسية في تحت التخلف الاستعمارى، مط: اميرال، بيروت، ب.س.ط.

٧٠) د. محمد روؤف سعيد والمهندس زمناكو سعيد فتح الله، اقليم كوردستان العراق في دائيرة السياسات النفطية العالمية، ط١، مط: تيشك، سليماني، ٢٠٠٨.

٧١) د. محمد زكى البرواري، الكورد و الدولة العثمانية،ط١، مط: دار الزمان، سوريا، ٢٠٠٩.

٧٢) د. نمير طه ياسين، تاريخ العرب الحديث و المعاصر، ط١، الاردن، ٢٠١٠.

٧٣) د.هشام سوادي هاشم، تاريخ العرب الحديث ١٥١٦-١٩١٨، ط١، الاردن، ٢٠١٠.

ج / بەزمانی ئینگلیزی :

٧٤) Suzan maiselas , Kurdistan in the history of shadow , Spain,

د / بەزمانی تورکی :

٧٥) kemal Arkun , II sultan Mahmut Han , Istanbul , ٢٠١٠.

سێیەم / ووتار وتوێژنەوە :

أ / گۆڤار :

٧٦) د.حسن جاف، کێشەی نێودەوڵەتان لەسەرەتا و ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەهەمدا و ڕەنگدانەوەی لە کوردستاندا، گۆڤاری (مێژوو)، ژ (١١)، هەولێر، ٢٠٠٩.

٧٧) كاتب شيوعي مجهول، القضية الكردية و حق الشعب الكردي في تقرير مصيره، گۆڤاری (k٢١)، ژ (١)، هەولێر ، ٢٠٠٨.

٧٨) د. ماریا گێز، پێشبینیەکانم بۆ داهاتوو وایلێکردم کتێبێك بەناوی ڕێگاکانی سەربەخۆیی کوردستان بنووسم، گۆڤاری (زانکۆ پرێس)، ژ (٥)، هەولێر، ٢٠١٠.

٧٩) مصطفى محمد کریم، جەنگی (قەرم) ١٨٥٣ـ ١٨٥٦ز هۆکار و دەرئەنجامەکانی، گۆڤاری (مێژوو)، ژ (١٠)، هەولێر، ٢٠٠٩.

٨٠) هۆگر طاهر توفيق، جريدة كوردستان و روسيا القيصرية ١٨٩٨ – ١٩٠٢، گۆڤاری (مێژوو)، ژ (٦)، هەولێر، ٢٠٠٨.

ب / ڕۆژنامە :

٨١) ڕۆژهڤا کورد، لەساڵی١٨٩٥ پاپۆڕێك بەناوی کوردستان دروستکرا، ڕۆژنامەی (خەبات)،ژ: ٣٦٠٢، ٢٠١٠/١٠/١٩.

بەڵگەنامە

چەند نامەیەکی سەرکردە روسیەکان دەخەینە روو کە بەدرێژایی جەنگی قەرم ۱۸۵۳ — ۱۸۵٦ ز ئاراستەی کورد و سەرکردە کوردیەکانیان کردووە کە تەنها کەبەست تیایاندا بریتی بووە لە دەست خستنە ناو کاروباری ناوچەکان و بردودان بە دەسەڵاتیان هەروەها هەوڵدان بووە بۆ لەناوبردنی شۆڕش و راپەرینە کوردیەکان نەگینا هیچ شتێکی تری لێ ناخوێنرێتەوە.

**نامەی فەرماندەی هێزەکانی ئیرەڤان بۆ یەزدانشێر لە۲۰ی ئاوگوستی ۱۸۵٤**

**( لەئارشێوی بارەگای سەرکردایەتی هێزەکانی روسیا لەقەفقاز، دۆسیەی ژمارە۲۱۳ نۆپیسی بەشی دوو سەرکردایەتی گشتی سەبارەت بەونامە جۆراوجۆرانەی کەنێردراوە بۆ گەورەکانی کوردو کەسانی تر )**

یەزدانشێر ! روسەکان هەر لەمێژە پێشنیاری دۆستایەتی لەگەل کوردەکاندا دەکەن، بۆئێوە لە پەسەندکردنی ئەم دۆستایەتیە درەنگ دەمێنن (بەدوای دەخەن) ئێوە یاخود شك وگومانتان لەوەدا هەیە کەئێمە لەتورکیا کەمتر دەبینە پاڵپشتێکی باوەرپێکراوو بەمتمانە بۆ ئێوە ئەو دەوڵەتەی تورك کەبناغەکەی کەوتوەتە لەرزینەوە و بەکەوتنەکەی دەتوانێت (لەوانەیە) ئەوانیش کەپشتیوانیان لێ کردوە بخاتە ژێردوە ئایا دەتان ئەوێ کە لەنێوانمان دا خوێن برژێت ؟

تۆ زانایت (عاقڵی) هۆزە کوردەکانی ژێر دەستت رێزت لێ دەگرن هێزە سوارەکانی خۆت هەڵوەشێنەوەو پێ یان بڵێ کەبگەرێنەوە بۆکاروباری ژیانی ئاسایی یان بەڵێنت پێ ئەدەم کەماف ودەسەڵاتی تۆ بپارێزین و پشتیوانیت لێ بکەین و بەهێزترت بکەین.ئەو دەم ئێوە، ئێمە وەك هاوپەیمانێکی پاك و دۆستێکی باوەرپێ کراو دەبینن.

هیوای تەندروستیتان بۆدەخوازم وچاوەرێ ی وەڵامی ئێوە دەکەم

بەوەرگرتن لە پ.ی. ئەڤێریانۆڤ، س. پ، ل ۲۷۹.

**بانگەواز بۆکوردەکانی پاشالیکی وان لەلایەن فەرماندەی هێزەکانی ئیرەڤانەوە**

**( لەئارشیفی سەرکردایەتی هێزەکانی روسیا لەهەرێمی قەفقاز ژمارە ۲۱۳، نامەی جۆراوجۆر بۆگەورەکانی کوردو کەسانی تر ).**

کوردەکانی پاشالیکی وان :

دەوڵەتی تورکیا ئێوە دژی روسەکان چەکدار دەکات و لەئێوە لەشکر پێك دێنێت، بەڵام روسەکان لەگەڵ خەڵکی بێ تاوان شەڕناکات، ئێمە تائێستا هیچ یەك لەئێوەمان نەڕەنجاندودو مەڕومالاتی ئێوەمان بەتالان نەبردوە گەرچی دەمانتوانی ئەم کاردبکەین، بۆ دەتانەوێ خۆتان توشی شەرو ماڵ ویرانی بکەن؟ تەسلیم بن و ئەوەدەم ئێوەش وەك هەندێك لەکوردەکانی سەرسنور قازانجتان پێ دەگات (لەبەرژەوەندیتان) ئەم قازانج و بەرژەوەندیەش بەپێ ی خزمەت و هەڵسووکەوتی ئێوە لەزیادبووندا دەبێت.

بەخشەندەیی و لێبوردنی دەوڵەتی ئێمە بەرامبە بەوەفاداری ئێوە مەزنە

بەوەرگرتن لە پ.ی. ئەڤێریانۆڤ، س. پ، ل ٣٨٠.

**نامەی فەرماندەی هێزەکانی ئیرەڤان بۆسەرۆکی هۆزی کوردی حەیدەرانلی شێخ عابید**

**( دۆسیەی ژمارە٢١٢ لەئەرشیفی سەرکردایەتی هێزەکانی روسیا لەقەفقاز، نامەی جۆراوجۆر بۆ گەورەکانی کورد وکەسانی تر ).**

شێخ عابید! من دەمەوێ کە لەناوچەکەدا هێمنایەتی و دادپەروەری هەبێت، من دەمتوانی کەناوچەکەی ئێوەکاول بکەم، سوپای روسیا تینوی شەڕن، بەڵام ئێمە نامانەوێ لەگەڵ دانیشتوانی بێ تاوان شەڕبکەین.

من پێشنیاری دۆستایەتیم بەکوردەکان کردوە، من بیستومە کەئێوە مرۆڤێکی زاناو دادپەروەرن، پێش کوردەکانی ژێر دەستت لەتالان کردن و نازاردانی دانیشتوان بەبێ لەچاوگرتنی ئەوەی کەئەوانە سەر بەچ نایینێکن بگرە دەست لەئەرمەنیەکان مەدەن و بگەرێنەوە بۆ سەر کاروباری ئاسایی خۆتان و ئەو دەم ئێمە دەبینە دۆست و هیوادارم کەواش بێت.

تێ بینی : نامەیەك هەر بەوچەشنەش بەو ناوەرۆکەیش نێردرا بۆشێخ بەکر(باقر)و حەیدەر ئاغا و جەهان گیر ئاغاو گەورەکانی تری کورد نێردرا.

بەوەرگرتن لە پ. ی. ئەڤێریانۆڤ، س. پ، ل ٣٨١.

**نامەی فەرماندەی هێزەکانی ئیرەڤان بۆدەروێش بەگ گەورەی کورتینەکان( کوردەکان )**

**( دۆسیەی ژمارە٢١٣ لەئارشیڤی سەرکردایەتی هێزەکانی روسیا لەهەرێمی قەفقاز، نامەی جۆراو جۆر بۆ گەورەکانی کوردو کەسانی تر ).**

بەرێز دەروێش بەگ :

داواتان لێدەکەم کەبەشداری شەری ئێمە لەگەڵ تورکیا مەکەن و کوردەکانی ژێر دەستتان ئامۆژگاری بکەن کەئارام دانیشن و ئەوەدەم ئێوە دەتوانن باوەر بەدۆستایەتی ئێمە بکەن تەندروستی تان بۆ دەخوازم وداوادەکەم کەوەڵامم بدەنەوە.

بەوەرگرتن لە پ. ی. ئەڤێریانۆڤ، س. پ، ل ٣٨٢.

## نامەی فەرماندەی هێزەکانی ئیرەڤان بۆشێخ عەبدال سەرۆکی کوردەکان

**( دۆسیەی ژمارە٢١٢ نامەی جۆراوجۆر بۆ گەورەکانی کوردو کەسانی تر )**
**( لەئارشێوی سەرکردایەتی هێزەکانی روسیا لەهەرێمی قەفقاز )**

شێخ عەبدال! سوپاسی دادپەروەری ئێوەو براکانت دەکەم، ئێوە پارێزگاریتان لەدانیشتوانی بێ تاوان و ئەرمەنەکان کردووە خودا پاداشتتان بداتەوە، ئێمە تەنیا هێمنایەتی ناوچەکەمان دەوێ و هەروەها هیوای ئارامی بۆ دانیشتوانی بەشەرەف سەر بەهەر ئول و ئاینێك بین دەکەین.

هیوای سەلامەتی تان بۆدەخوازم

بەوەرگرتن لە پ. ی. ئەڤێریانۆڤ، س. پ، ل ٣٨٣.

## بۆ کوردەکانی دیادین لەلایەن فەرمانەدەی هێزەکانی ئیرەڤانەوە

**( دۆسیە ژمارە٢١٣ نامەی جۆراوجۆر بۆگەورەکانی کوردو کەسانی تر. لەئارشێوی سەرکردایەتی هێزەکانی روسیا لەهەرێمی قەفقاز )**

دیادینەکان ! ئارام بن و ئەرمەنەکان لەخۆتان زیز مەکەن و بگەرێنەوە بۆماڵ و شوێنی خۆتان. ئەو دەم ئێمە دەستتان لێ نادەین.

بەوەرگرتن لە پ. ی. ئەڤێریانۆڤ، س. پ، ل ٣٨٤.

## لە پەیوەندی گرتنی کنیاز دولگاروکوڤ بەژێنراڵ موراڤیوڤەوە لە ٦ی ئاپریلی ١٨٥٥ ژمارە ١٦٣
**( لەبەرگی یانزەی بەڵگەکانی کۆمیسیونی ئارخیوگرافیا )**

من لەسەر ئەو نامەی ئێوەوە کەلە رۆژی ٢١ ی مارت ژمارە ٧٩ سەبارەت بەپەیوەندیەکانی ئێستای ئێمەوە بەکوردەکانی تورکیاوە نوسیبوتان راپۆتێکم ئاراستەی بەرێز گ. ی کرد.

خاوەن شکۆیان فەرمانیدا کەدرێژە بەو پەیوەندیانە بدەن کە لەمقۆناغی یەکەمدا گرینگایەتێکی هەرە گەورەیدا هەیە. لەبەر ئەوە ئەوانە قازانجێکی بەرچاویان بۆ ئێمە هەبوە. سنوردکانی ئێمەیان لەهێرشی درندەکان پاراستوە. بەلاّم بۆ گەیشتن بەمەبەستی دیاریکراودا کاتێك دێتەدی کەکوردەکان بەئاشکرایی لەدەوڵەتی تورکیا دابڕن و وازبێنن و هاوکاری سوپای

ئێمە لەو شەڕەی کە لەپێشدایە بکەن. داواتان لێ دەکەم ئەوەی کە لەدەستتان دێت و لەتواناتان هەیە لەهەموو شێوەیەك بگرە دەستیش بەپارەوە مەگرن کەخاوەن شکۆیان بۆ ئەم مەبەستە دیاری کردووە بۆ خاوەن شکۆیان چاوەڕێی دەنگوباسی ئێوە لەسەر بەردەوامی ئەم پەیوەندیانە دەکەم.

بەوەرگرتن لە پ. ی. ئەڤێریانۆڤ، س. پ، ل ٢٨٧.

# پارتی ( ڕەفاه ) لە تورکیا
## ( ١٩٩٧-١٩٨٣ )

م/ ئەحمەد حەمەدئەمین

پێشەکی

هاتنە پێشەوەی قۆناغێکی نوێ لە رژێمی سیاسی تورکیا دوای ساڵانی جەنگی دووەمی جیهانی، وڵاتی لە سیستەمی تاك حزبییەوە گواستەوە بۆ سیستەمی فرە حزبی، بەمەش سەرەتاکانی گەڕانەوە بۆ پرەنسیپەکانی ئاینی ئیسلامو ئازادییە کۆمەڵایەتییەکانی بە دوای خۆیدا هێنا کە لەگەڵ دامەزراندنی تورکیای نوێ لەسەر دەستی(مستەفا کەمال) هاتبووە قەدەغە کردن. ئەوە لە لایەك، لە لایەکی دیکەشەوە کاتێکیش بەشێك لە پارتەکان بۆ زیاد کردنی هەوادارانو رێژەی دەنگەکان لە هەڵبژاردنەکان دەستیان بۆ سۆزی ئاینی برد، ئیتر لێرەوە لە شانۆی سیاسی تورکیا پارتی هاوسۆزی ئیسلامی بینرا تا ئەوەی لە کۆتایی شەستەکانو سەرەتاکانی حەفتاکان پارتی تایبەتی ئیسلامی لە ژێر ناوی تردا دامەزران، بەڵام دەوترێ بە دامەزراندنی پارتی(ڕەفاه) لە ساڵی ١٩٨٣ بزووتنەوەی ئیسلامی لە تورکیا پێی ناوەتەوە قۆناغێکی ترەوە. لێرەشدا بۆ تیشك خستنە سەر رۆڵی پارتی(ڕەفاه) لە شانۆی سیاسی تورکیاو سەرکەوتنی لە هەڵبژاردنەکان تا ئەوەی لە ساڵی ١٩٩٦ حکومەت دەگرێتە دەست لە دووتوێی ئەم توێژینەوە لە دوو تەوەردا باس لە رۆڵی ئەو پارتە دەکەین.

تەوەری یەکەم: تایبەتە بە باسکردنی پارتو رێکخراوە سیاسییە ئیسلامییەکان لە تورکیا کە بەر لە پارتی(ڕەفاه) کارو چالاکییان هەبوو

وەکو(پارتی ڕژێمی نیشتمانی)و(پارتی سلامەی نیشتمانی).

لە تەوەری دووەم، باس لە دامەزراندنی(پارتی ڕەفاه)و سەرکەوتنەکانی ئەم پارتە دەکرێت لە هەڵبژاردنەکانی تورکیا، کە لە بەشێك لە سەرچاوەکان ئەم پەرەسەندنەی(ڕەفاه) بە بازێکی خێرا دەدرێتە قەڵەم.

لە ئەنجامدا باس لە گرنگترین ئەم خاڵانە دەکەین کە لە دووتوێی ئەم توێژینەوەیە پێی گەیشتووین.

دیارە بۆ ئەم توێژینەوەیە پشت بە کۆمەڵێك سەرچاوە بەستراوە لە وانە:(د. محمد عثمان عبدالله، الاسلاميون والسلطة في تركيا: التجربة الاربكانية نموذجاً)،(د. ادريس بووانو، الاسلاميون الجدد في تركيا، البدايات والمكونات، التحولات والمعادلات)، کە دوو توێژینەوەی ئەکادیمی گرنگن لە لایەن(مركز الكاشف للمتابعة والدراسات الاستراتيجية) ئەنجامدراوەو، بۆ ئەم توێژینەوەی ئێمە جێگای بایەخ بوون. هەروەها هەر دوو سەرچاوەی(د. ابراهيم خليل احمد و د. خليل علي مراد، ايران و تركيا دراسة في التاريخ الحديث والمعاصر)و،(محەمەد نورەدین، تورکیا لە سەردەمی گۆڕاندا) بایەخی خۆیان بۆ ئەم توێژینەوە هەبووە، لەگەڵ کۆمەڵێك سەرچاوەی تر کە لە ریزبەندی سەرچاوەکان ئاماژەیان بۆ کراوە.

لە ڕاستیدا، ئەم توێژینەوەیە بێ خەوش نییە بۆیە دەخوازین لە کەموکورتییەکان ئاگادار بکرێینەوە بۆ ئەوەی خزمەتی زانستی زیاتر بکات. خوای گەورە پشتو پەنای هەموو لایەکمان بێت.

## تەوەری یەکەم: زەمینەی دامەزراندنی پارت و ڕێکخراوە سیاسییە ئیسلامییەکان لە تورکیا، بەر لە پارتی ڕەفاه

لەگەڵ سەرەتاکانی دامەزراندنی تورکیای نوێ(مستەفا کەمال)[١]، ڕێگا نەما نەیگرێتەبەر لە پێناو بەرکەنارکردنی ئاینی ئیسلام لەسەر شانۆی ژیان لەم وڵاتەدا، بەمەبەستی ئەوەی نەوەیەکی نوێ دروست بکات کە بە ڕووخسارو ناوەڕۆکییەوە ڕۆژئاوایی بێت و، هیچ جۆرە پەیوەندییەکی بە ڕابردووی خۆیەوە نەبێت. بەمەش توانی لە ماوەی دەسەڵاتیدا بانگەواز کاران لە ناو ببات و، بە شێوەیەکی کاتی کارو چالاکی ئیسلامی سست بکات[٢].

بە تێپەڕبوونی تورکیا بە ساڵانی جەنگی دووەمی جیهانی(١٩٣٩-١٩٤٥)و، هاتنە پێشەوەی ئەم بارودۆخەی دوای ساڵانی جەنگ، قۆناغێکی نوێی بە دوای خۆیدا هێنا، کە ژیانی سیاسی تورکیای لە قۆناغی تاک حزبییەوە گواستەوە بۆ قۆناغی فرە حزبی، لەم چوارچێوەیەشدا ژمارەیەك پارت هاتنە دامەزراندن. لێرەشدا ئەو پارتانە هەڵوێستیان دەربارەی ئاینی ئیسلام دابەش بوون بەسەر دوو گروپدا: گروپی یەکەمیان ئەو حزبە لاوەکییانە بوون کە کەم تا زۆر دیدوو تێڕوانینی ئیسلامگەرییان هەبووو، جەختیان لە سەر ڕیشەیی تورکیا دەکرد لە جیهانی ئیسلامدا، لەگەڵ خوێندنی ئاینی و، پێداچوونەوە بە عیلمانییەت و خاوکردنەوەی کۆت و زنجیر لەسەر نواندنە ئاینییەکان[٣]. گروپەکەی دیکەشیان ئەو حزبە سیاسیانە بوون کە پەیڕەویان لە کەمالیزم دەکرد، بەڵام لەبەر چەندین هۆی جیا جیا لە بەرانبەر مەسەلەی ئاینی لە تورکیا نەرمییەکی زۆریان نواند[٤].

(پارتی دیموکرات)[٥]، کە یەکێك بوو لەم حزبانەی لە دوای هاتنە پێشەوەی ئەم بارودۆخە هاتبووە دامەزراندن و، سەرسەختترین ململانێکەری (پارتی گەلی

کۆماری)[٦] بوو، خۆی بە داکۆکی کاری ئیسلامو پرەنسیپەکانی دەدایە قەڵەم، ئەمەش وای کرد کە بەشێکی زۆر لە خەڵك لە دەوری خۆیدا کۆبکاتەوە. کاتێکیش لە هەڵبژاردنەکانی ساڵی(١٩٥٠) سەرکەوتنی بە دەست هێناو جڵەوی دەسەڵاتی گرتە دەست، هەندێ هەنگاوی لەم شێوە بابەتەی نا[٧]، بەڵام ئەوە بەردەوام نەبوو، ئەگەر بزانین دەسەڵاتی فەرمانڕەوایی(پارتی دیموکرات) لە رێگای کودەتای مایسی(١٩٦٠) کۆتایی هات[٨].

شیاوی باسە، گەشەسەندی پرەنسیپە ئیسلامییەکانو زیادبوونی کۆچ لە لادێ کانەوە بۆ شار، هەڵگرانی بیری سیاسی ئیسلامی هێنایە سەر ئەوەی مشۆری خۆیان بخۆن. بۆ ئەم مەبەستەش(نەجمەددین ئەربەکان)[٩]، هەڵسا بە راپرسیو ئالوگۆڕی بیروڕا لەگەڵ کەسانی دیکە، کە ئەنجام هەموویان کۆك بوون لەسەر دامەزراندنی پارتێکی ئیسلامی بۆ ئەوەی ببێتە مینبەری گەیاندنی بیروڕاکانیان بە دانیشتوانی تورکیا. لێرەشدا ئەگەرچی ژیانی سیاسیو ئازادی بیروڕا لە تورکیا پروپاگەندەی بۆ دەکرا، بەڵام رێگە بە دروست کردنی پارتو رێکخراوێك لەسەر بنچینەی ئایینی ئیسلام نەدەدرا[١٠]. ئیتر ئەم رێگرییە(ئەربەکان)و هاورێکانی ناچار کرد ناوی پارتەکەیان بنێن(پارتی رژێمی نیشتمانی).

(پارتی رژێمی نیشتمانی)، لە ٢٦ کانوونی دووەمی ١٩٧٠ بە سەرۆکایەتی(نەجمەددین ئەربەکان) هاتە دامەزراندنو، لە کۆنگرەی یەکەمیدا داکۆکی کرد لە تێڕوانینی دینیو، موقەدەساتی وێژەیی، هەروەها رایگەیاند کە ئیسلام بنچینەو چاوگی ژیانی سیستەمو هەموو زانستو نەزاکەتێکەو مەرجێکیشە نەك هەر بۆ رزگارکردنی تورکیا بەڵکو بۆ هەموو جیهان. ئەوە لە لایەك، لە لایەکی دیکەشەوە رِوونی کردەوە کە تاکە نوێنەری ئیسلامە، بۆیە بە پێویستی دەزانی کە پارتەکانی دیکە لە ئیسلام نزیك بکەنەوە نەك پروپاگەندی ئیسلامییەتی بکەن. ئەم پارتە بۆ یەکەمین جار لە مێژووی تورکیا چەند

خۆپێشاندانێکی یاسای ئەنجامدا کە تیایدا بانگەشەی بۆ پەیڕەوکردنی ئیسلام کرا، لە کاتێکدا شەقامەکانی تورکیا دروشمی دینیان تیایدا بەرز نەکرایەوە. ئیتر ڕێك نەکەوتنی ئەم هەنگاوانە لەگەڵ چەمکی باوی عیلمانییەت، بووە هۆکاری ئەوەی داواکاری گشتی تورك لە ٢٥ی مارتی ١٩٧١ دوای شانزە مانگ لە تەمەن بە داوایەکی یاسای هەڵوەشانەوەی ئەم پارتەی ڕابگەیەنێت بە بیانووی ئەوەی ئەم پارتە لە کۆنگرەی خۆیدا ڕێداوە باسی ئیسلامو شەریعەت بکرێت، ئەوەش شتێکە لەگەڵ یاسای ڕێکخستنی حزبایەتیو دەستووردا ناگونجێت[11].

قۆناغی دوای ئەوە تا دەهات ئەوە بیرۆکەیە زیاتر ڕەگی دادەکوتا کە (نەجمەددین ئەربەکان) دەتوانی سەرکردایەتی جولانەوە ئیسلامییەکان بکات لە تورکیا. بەمەش لەم سۆنگەیەوە بە هاوڕێیەتی لەگەڵ گروپەکەی لە ١١ی تشرینی یەکەمی ١٩٧٢ (پارتی سەلامەی نیشتمانی)یان دامەزراند[12].

(ئەربەکان)و هاوڕێکانی لەوە گەیشتبوون کە ئەمە هەلێکی کاتییە، دوور نییە تووشی هەمان چارەنووسی پێشوو بێنەوە، بۆیە هەر زوو کەوتنە خۆیانو بە چالاکتر لە قۆناغی پێشوو کەوتنە کارکردن، بەمەش لە ماوەیەکی کەمدا ئەم پارتە توانی سەنگی خۆی لە ناو تورکیا دەربخات، بەوە لە ڕۆژی دامەزراندنییەوە تاوەکو مایسی ١٩٧٣ توانی(٣٤) مەڵبەندو(٣٠٠) لق لە گشت ناوچەکانی تورکیادا بکاتەوە، ڕۆژنامەیەك بە ناوی (ملی گازیت) لە ١٢ی کانوونی دووەمی ١٩٧٣ دەربکات. کۆنگرەی خۆی لە ٢١ی تەمموزی ١٩٧٣ ببەستێتو، لە ١٤ی تشرینی دووەمی ١٩٧٣ بەشداری هەڵبژاردن بکاتو لە(١١,٨٪) دەنگەکانو(٤٨) کورسی ئەنجوومەنی نیشتمانی بە دەست بێنێت[13]، ئەنجام (نەجمەددین ئەربەکان) بەشداری کرد لە حکومەتێکی هاوبەشدا لەگەڵ(بولند ئەجەوید)[14]. (پارتی سەلامەی نیشتمانی)، لە کاتی فەرمانڕەوایەتیدا ژمارەیەك

دەستکەوتی بە دەست هێنا وەك: کردنەوە ژمارەیەکی زۆر لە پەیمانگاو خوێندنگای قورئان لەبەر کردنو پێگەیاندنی مامۆستایان، فەرز کردنی پەروەردەی ئیسلامی لە پرۆگرامی خوێندنو، دەرکردنی بڕیاری لێبووردنی سیاسی، بە تایبەت بۆ بەندکراوە ئیسلامییەکان...هتد(١٥).

هەموو ئەمانەی ئاماژەیان بۆ کرا، ترسو دڵە ڕاوکێ لای عەلمانییەکان دروست کردو، دواجار لە ٥ی حوزەیرانی ١٩٧٧ هەڵبژاردنی نوێ ئەنجامدراو،(پارتی سەلامەی نیشتمانی) بە هۆی پلانی چەپەکان شکستی هێناو کورسییەکانی پەرلەمانی کەم بووەوە بۆ(٢٤) کورسی، بەڵام لەگەڵ هەموو ئەم کێشەو گیروگرفتانە ئەم پارتە ڕووبەرووی بووەوە، کە بە هەموو لایەنەکانی دیکە هەوڵی دوورخستنەوەیاندا، کەچی(پارتی عەدالەت)(١٦) و (پارتی گەل) نەیان توانی زۆرینەی پەرلەمان مسۆگەر بکەن، بۆیە بە ناچاری دوای سێ مانگ لە قەیرانی وەزاری لە ٢١ی تەممووزی ١٩٧٧ (پارتی سەلامەتی نیشتمانی) لەگەڵ (پارتی عەدالەت)و(پارتی بزووتنەوەی نەتەوەیی)(١٧) چووە ناو حکومەتێکی دیکەی هاوبەشەوە کە تاوەکو ٥ی کانوونی دووەمی١٩٧٨ بەردەوام بوو(١٨).

لە ڕاستیدا، ئەم هەنگاوە نەبوو هۆکاری ئەوەی دوژمنە ناوخۆییەکانی (پارتی سەلامەی نیشتمانی) لە هەنگاوەکانیان بوەستن، لەگەڵ ئەوەش ئەمریکاش لەبەر مەترسییەکانی لە ناوچەکە هەوڵەکانی خستبووەگەڕ بۆ وەرگرتنەوەی دەسەڵات لە لایەن (پارتی گەل)ەوە. بەمەش لە دوای ئەم بارودۆخەو هاتنە پێشەوە هەندێ باری ناوخۆی تورکیا، تا دەهات کارو چالاکییەکانی(پارتی سەلامەتی نیشتمانی) دەخرایە ژێر چاودێرییەوە، بەڵام نەبووە هۆکاری ساردبوونەوەی سەرکردەکانی(١٩).

خراپی باری ناوخۆی تورکیا لە سەرەتای هەشتاکانی سەدەی بیستو کەڵەکەبوونی کۆمەڵێك هۆکاری ناوخۆییو دەرەکی، دواجار لە ١٢ی ئەیلولی

١٩٨٠ کودەتایەکی تری سەربازی بە دوای خۆیدا هێنا[٢٠]. ئەنجامدەرانی ئەم کودەتایە یەکێك لە کارەکانیان دژایەتی بوو بۆ بوژانەوەی ئیسلام، چونکە بە دژی پرەنسیپەکانی(ئەتاتورك)یان دەزانی. لەم پێناوەشدا چەندین لیژنەی سەربازیان پێك هێنا بۆ دادگایی کردنی ئیسلامییەکان، لەم چواچێوەشدا لە ٢٤ی نیسانی ١٩٨٣ (ئەربەکان)و (٣٣) کەس لە هاوڕێکانی لە (پارتی سەلامەی نیشتمانی) دادگای کران‌و بە کۆمەڵێك تاوان، بڕیاری هەڵوەشانەوەی پارتەکەیان دراو خۆشیان خرانە زیندانەوەو، قەدەغەکران کاری سیاسی ئەنجام بدەن[٢١].

## تەوەری دووەم: دامەزراندنی پارتی( ڕەفاه)و رۆڵی سیاسی لە تورکیا

دەرکردنی بڕیاری یاسای تایبەت بە کاری پارتە سیاسییەکان لە دوای کودەتای ساڵی(١٩٨٠)و گەڕانەوە بۆ باری ئاسایی، دەرفەتیدرایەوە بە سیاسییەکانی تورکیا هەنگاوی دامەزراندنی پارتی سیاسی بدەن. لەم چوارچێوەیەش ئەگەرچی(نەجمەددین ئەربەکان) مافی ئەنجامدانی کاری سیاسی نەبوو، بەڵام لە ژێر کاریگەری ئەوو لەسەر پاشماوەی(پارتی سەلامەی نیشتمانی) لەسەر دەستی پارێزەر(عەلی تورکان) لە ١٩ی تەمموزی ١٩٨٣(پارتی ڕەفاه) هاتە دامەزراندن[٢٢].

بەهۆی تازە دامەزراندنی(پارتی ڕەفاه)و تەواونەبوونی ڕێکخستنەکانی، فریای هەڵبژاردنەکانی ساڵی(١٩٨٣) نەکەوت، بەڵام توانی لە ماوەیەکی کەم لە دواتر خۆی ڕێك بخات‌و لە هەڵبژاردنە ناوخۆییەکانی ٢٥ی مایسی ١٩٨٤ ڕێژەی (٤,٤٪) دەنگەکانی بە دەست بێنێت، لەگەڵ هەر یەك لە سەرۆکایەتی شارەوانی(ئورفە)و(وان)، کەچی ئەنجامەکە بە بەراورد لەگەڵ پێشینەی سەرانی ئەو پارتە ڕێژەیەکی کەم بوو. لێرەشدا سەرچاوەکان ئەم کەم دەنگ هێنانە بۆ

ئەوە دەبنەوە کە تاوەك ئەو دەمەش کاریگەری سیستەمی سەربازی هەر مابوو، کە لە کودەتاکەوە دەستیان گرتبوو بەسەر سەروەتو سامانی دارایی(پارتی سەلامەی نیشتمانی)؛ هەروەها ڕێگەیان لە کادیری سەرەکی وەك (ئەربەکان) گرتبوو کاری سیاسی ئەنجام بدات، ئەوە سەرەڕای ئەوەی(تورگوت ئۆزال)[٢٣] کە کاندیدی(پارتی سەلامەی نیشتمانی) بووو، لە هەڵبژاردنەکانی ساڵی ١٩٧٧ کشابوویەوەو(پارتی نیشتمانی دایك)ی[٢٤] دامەزراندبوو، توانی بوو سەرنجی پارێزگارەکانو ئیسلامییەکان بۆ خۆی ڕابکێشێت[٢٥].

(پارتی ڕەفاه) لە هەڵبژاردنەکانی شارەوانی ساڵی(١٩٨٦) ڕێژەی دەنگەکانی بەرزبوویەوە بۆ(٨٪)، هەروەها لە هەڵبژاردنەکانی پەرلەمانی ساڵی(١٩٨٧) ڕێژەی (٧,١٦٪) دەنگەکانی بە دەست هێنا، بەڵام لەبەر ئەوەی نەیتوانی ڕێژەی پێویست بەدەست بێنێت کە بریتی بوو لە(١٠٪) ئەوە هیچ ئەندامێکی نەچووە ناو پەرلەمانەوە. کەچی ئەم بارودۆخە کاریگەری نەکرد لەسەر چالاکیە سیاسییەکانی ئەم پارتە بۆ بەهێز بوونی پێگەی سیاسی خۆی، ئەگەر بزانین لە هەڵبژاردنی شارەوانییەکانی ٢٦ مارتی ١٩٨٩ ڕێژەی دەنگەکانی بەرزبوویەوە بۆ(٩,٨٪)و، لەگەڵ ئەوەشدا سەرۆکایەتی هەر یەك لە پارێزگاکانی(قونیە)،(سیواس)،(ئورفە)و(مەرعەش)و پارە شارەوانیشی بە دەست هێنا[٢٦].

لەم ماوەیەشدا بە بەردەوامی لە کاتی بانگەی هەڵبژاردن،(ئەربەرکان) جەختی لەسەر ئەوە دەکردەوە، کە (پارتی نیشتمانی دایك)و (پارتی ڕێگای ڕاست) [٢٧]و، (پارتی گەلی کۆماری) پارتی یانەی ڕۆژئاواین، هەروەها ئاماژەی بۆ خراپەکارییەکانی(تورگوت ئۆزال) دەکردو تۆمەتی گەندەڵکاری دەستختە پاڵییەوە، ئەمەش هەموو لە پێناوی ئەوەبوو دەنگی ئیسلامییەکان بە دەست بهێنێتەوە[٢٨].

(پارتی ڕەفاه) بە هاوپەیمانییەتی لەگەڵ هەر یەك لە(پارتی بزووتنەوەی نەتەوەیی)و(پارتی چاکسازی دیموکراتی) چووە ناو هەڵبژاردنەکانی ساڵی(١٩٩١) یەکەوە، توانیان ڕێژەی(١٦,٩٪) دەنگەکان بە دەست بێنن، کە دەکاتە(٦٢) کورسی پەرلەمان، لەمەشدا (٣٨) کورسی بۆ (پارتی ڕەفاه) بوو[٢٩].

سەرچاوەکان هۆکاری سەرکەوتنی (پارتی ڕەفاه) لە هەڵبژاردنەکان دەبنەوە بۆ ئەو بانگەشە هەڵبژاردنەی کە وەکو شێوازێکی تازەو دوور لە شێوازە کۆنەکان کە پارتەکانی دیکە لەسەر ڕۆیشتوون لەوەدا دەبینین هەوڵی داوە بە زمانێکی نوێ لەگەڵ دەنگدەر بدوێو، سەرنجی هەموو توێژەکان بۆخۆی ڕابکێشێت، پەنجە لەسەر کەمو کورتییەکان دابنێتو چارەسەریان بۆ بدۆزێتەوە. ئەوە لە لایەك، لە لایەکی دیکەشەوە هەوڵی داوە سەرنجی ئافرەتان بەلای خۆیدا ڕابکشێت، لە ڕێگای بڵاوکردنەوەی وێنەی بانگەشەی هەڵبژاردنەکان کە پێشانی وێنەی ئافرەتی مودەشی لە خۆ گرتووە[٣٠].

سەرکەوتنی گەورەی(پارتی ڕەفاه) لە هەڵبژاردنی شارەوانییەکان بوو لە ساڵی(١٩٩٤)، کاتێك ڕێژەی(١٩,٧٪) دەنگی بەدەست هێناو، سەرکەوتوو بوو لە هەر دوو پارێزگای(ئەستەنبوول)و(ئەنقەرە). بەمەش عیلمانییەکانی تورکیای تووشی سەرسورمانو شۆك کرد، چونکە بەم ئەنجامە(پارتی ڕەفاه) دەستی گرت بەسەر سەرۆکایەتی(٢٨) ئەنجومەنی شارەوانی. لێرەشدا شێوازی بانگەی هەڵبژاردن کە(پارتی ڕەفاه) پەیڕەوی کرد، بە تایبەت بڵاوکردنەوەی فۆرمو توێژینەوە لە بیروڕای خەڵك بۆ داهاتووی وڵات، لەگەڵ دەست نیشان کردنی کەموکورتی پارتەکانی دیکەو، ئەم بەرنامە ڕێژییەی هەیبوو بۆ داهاتووی وڵات کاریگەری زۆری هەبوو لەم سەرکەوتنەدا. ئەوە لە لایەك، لە لایەکی دیکەشەوە هۆکاری ئەم سەرکەوتنە بە پلەی یەکەم دەگەڕێتەوە بۆ کەرت بوونی پارتو ڕێکخراوە سیاسییە ڕاستڕەو

چـەپرەوەکان، لەگـەڵ زیـاد بـوونی هەسـتی ئـاینی دوای شـەڕی کەنـداوی دووەمو، هەڵوەشـانەوەی یـەکێتی سـۆڤییەتو، ڕووداوەکـانی بۆسـنە کـە عیلمانییـەکانی تورکیـا کەوتبوونـە بـەرگری کردنـی، لەگـەڵ چارەسـەرکردنی کێشەی کورد کە پارتی(ڕەفاه) بانگەشـەی بـۆ دەکـرد بـووە هۆکـاری ئـەوەی دەنگی زۆر کوردەکان بۆ(ڕەفاه)بێت[٣١].

لە ئەنجامی ئەم هەڵبژاردنە(نەجمەددین ئەربەکان) لـە دوای وتـاری ڕۆژی هەینی لە گۆڕەپانی مزگەوتی (ئەیوب سوڵـتان) لەبـەردەم نزیکـەی دە هـەزار کەس لە هـەوادارانی پارتەکـەی ڕایگەیاند، سێیەکی دەسـەڵاتیان بـە دەسـت هێنـاوەو، هەوڵـدەدەن لـە ماوەیـەکی کەمـدا دەسـەڵاتی ناوەنـدی دەسـتبەر بکەن، بەمەرجێ لە ڕێگای ئاشتیو ئارامییەوە بێت[٣٢].

تورکیــا لـــە هەڵبژاردنـــەکانی پەرلـــەمانی ٢٥ کـــانوونی یەکـــەمی ١٩٩٥ نزیکەوتـەوەو،(پـارتی ڕەفـاه) تـوانی بـە جیـاواز لـە ڕێـژەی هەڵبژاردانـەکانی پێـشوو،(٢١,٣٪) دەنگـەکان بـە دەسـت بێنێـتو، بەمـەش بـوو بـە یەکـەمی هەڵبژاردنەکـەو(١٥٨) کورسـی پەرلـەمان بەرکـەوت. لێرەشـدا چـاودێرانی بارودۆخەکە سەرکەوتنی(پارتی ڕەفاه) بۆ چەند فاکتەرێك دەگێڕینەوە:

١- سوود وەرگرتنـی(پـارتی ڕەفـاه) لـە جولانـەوەی هـاتنی دانیـشتوانی ناوخۆ لە باشووری ڕۆژهەڵات بە تایبەت ناوچە هەژارەکان بۆ بەشـی بـاکووری ڕۆژئاوا بە پلەی یەکەم، بەمەش(ڕەفاه) سەرکەوتو بـوو لـە پەیوەنـدی کـردن پیانو ڕاکێشانیان بەلای خۆیدا، هەروەها(ڕەفاه) سوودی بینـی لـە مەسـەلەی ئاین کە فاکتـەری یـەکێتی ژیـانی، ڕۆشـنبیری، کۆمەڵایـەتیو ئەخلاقییـە کـە ناسنامەی زۆر لە تورکەکان یەك دەخاتو لایەنگیرانیان بۆی هەیە[٣٣].

٢- لاوازی بـیری چـەپی تـا هەڵوەشـانەوە دوای کودەتـای سـاڵی(١٩٨٠) دروسـت بـوونی بۆشـایی سیاسـی، لەگـەڵ ئـەو بـیرە ڕادیکالیانـەی کـە داوای

یەکسانیو دادپەروەری هاوشێوەی ڕۆژئاوای دەکرد، بە تایبەت دوای ڕووخانی یەکێتی سۆڤییەتو کۆتایی هاتنی جەنگی سارد. بەمەش (ڕەفاه) بووە جێگرەوەی ئەو بیرۆکەیە بە بانگەشەکانی[٣٤].

٣- گەشەسەندی لایەنی ئیسلامی لە تورکیا، ئەویش بە هۆی سیاسیەتی لیبرالیانەی دەسەڵات کە سیستەم لە ژیانی سیاسی، کۆمەڵایەتیو ئابووری هێنابووە ئاراوە، کاتێك ڕێگای دابوو بە بزووتنەوەی ئیسلامییەکان بڵاوبنەوەو کەشو هەوایەکی ڕۆشنبیری ئیسلامی فراوان لە ناو خەڵك دروست بکەن.

٤- ئەو هەنگاوو کارو چالاکییانەی کە(ڕەفاه) پێشکەشی کردن لەم شارەوانییانەی کە هەڵبژاردنەکانی ساڵی (١٩٩٤) بە دەستی هێنابوون، کە تیایدا بە خزمەتی چاكو بە دەست پاك لە ناو خەڵك ناویان دەرکرد بوو، هەروەها هەموو ئەم کەمو کورتیو وەرگرتنی بەرتیلو گەندەڵیانەی بەر لە خۆیان دەرخستبوو.

٥- دابەش بوونی ڕاستڕەوەکانی(پارتی داد) بۆ هەر یەك لە(پارتی نیشتمانی دایك) بە سەرۆکایەتی(تورگوت ئۆزال)و، (پارتی ڕێگای ڕاست) بەسەرۆکایەتی(سلێمان دیمیریل) [٣٥]، هەروەها دابەش بوونی(پارتی گەلی کۆماری) بۆ (پارتی چەپی دیموکرات) [٣٦] بە سەرۆکایەتی(بولند ئەجەوید)و، (پارتی گەلی کۆماری) بە سەرۆکایەتی(دەنیز بایکال)[٣٧].

٦- پەیڕەوکردنی ئەو هەڵمەتە هەڵبژاردانەی بە هێزەی(پارتی ڕەفاه)، کە بریتی بوو لە زمانێکی نەرمی گفتوگۆکردن، ئەوە سەرەڕای ئەوەی بۆ یەکەمین جار ئافرەتانی ئەو پارتە هاتنە ناو بانگەشی هەڵبژاردنەکانو بەردەوام لەم ماوەیەدا سەردانی ناوچە جیاوازەکانیان دەکرد بە تایبەت شوێنی کۆبوونەوەی ئافرەتان[٣٨].

٧- بەدەست هێنانی بڕێکی زۆر لە یارمەتی لە لایەن هەریەك لە ئێرانو

سعودیا وە، کە هەر لە زووەکەوە یارمەتی زۆریان پێشکەش بە بزووتنەوەی ئیسلامییەکان بە گشتیو پارتی(رەفاه) بە تایبەتی لە تورکیا داوە[٣٩].

شیاوی باسە، لەگەڵ ئەو سەرکەوتنە لە هەڵبژاردنەکاندا، تا ماوەیەك لە تورکیا هەوڵی ئەوەدرا(پارتی رەفاه) لە دامەزراندنی حکومەت دووربخەنەوە، بەڵام دوای ئەوەی هاوپەیمانییەتەکەی(تانسۆ جیللەر)[٤٠]و(مەسعود یەلماز)[٤١] سەرکەوتوو نەبوو. لە ٧ی حوزەیرانی ١٩٩٦ داوا لە(نەجمەددین ئەربەکان) کرا حکومەت پێك بێنیت، ناوبراویش بە هاوبەشی لەگەڵ(پارتی رێگای راست) لە ٢٩ی حوزەیرانی ١٩٩٦ کابینەی حکومەتی راگەیاند، بەمەش یەکەمین سەرۆکی پارتێکی ئیسلامی بوو کە سەرۆکایەتی حکومەت لە تورکیا وەربگرێت[٤٢].

لە دوای دامەزراندنی حکومەت، (ئەربەکان) پابەندی خۆی بۆ سیستەمی عیلمانی وڵاتەکەی دەبڕیو، تەنانەت هیچ ناکۆکییەکی ئەو تۆشی پەیدا نەکردووە بەرانبەر بە پەیوەندییە ستراتیژییەکەی نێوان تورکیاو ئیسرائیل، بگرە زۆر جار خۆی بێ دەنگ کرد بوو لە ئاست داخستنی خوێندنگا ئایینییەکانو قەدەغەکردنی لەچك لەسەر کرد بۆ خوێندکارانی کچ لە زانکۆکان، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا سیستەمی عیلمانی، بە تایبەتی سوپا قبوڵی ئەوەیان نەبوو ئەم پارتە بەردەوام بێت لە بەڕێوەبردنی وڵات، چونکە نەك هەر لەسەر ئاستی ناوخۆ، بەڵکو لەسەر ئاستی سیاسەتی دەرەوەشدا(ئەربەکان) بەرنامەیەکی جیاوازی هەبوو، کە بە ئاشکرا رایگەیاند بایەخێکی تایبەتی بە مەسەلەی هاوکاری سێ قۆڵی سوریا، ئێرانو تورکیا دەدات، بە تایبەت لە بواری هەڵوێست بەرانبەر بە کێشەی عیراق، هەروەها ئەوەشی راگەیاند کە ئامانجی سەرەکی(پارتی رەفاه) ئەوەیە پەیوەندییەکانی تورکیا لەگەڵ دەوڵەتە ئیسلامییەکان بە گشتیو دەوڵەتە دراوسێکانی بە تایبەتی خۆش بکات. لەم پێناوەشدا سەردانی هەریەك سوریاو ئێرانی کردو چەندین پەیمانی ئابووریو بازرگانی لەگەڵدا بەستن[٤٣].

لێرەشدا دەزگای سەربازی نەك هەر مەترسی لە سیاسەتی دەرەوەی (ئەبەركان) هەبوو، بەڵكو لەوەش دەترسا لە دواجار تەگەرە بخاتە بەردەم ڕەوتی عیلمانییەت لە ناوەوەی وڵات، بۆیە زۆری نەبرد لە ژێر فشاری ڕاستەوخۆی دەزگای سوپا،(ئەربەكان) ناچار كرا لە ٢٧ی شوباتی ١٩٩٧ دەست لە كار بكێشێتەوە[٤٤]. دواتریش هەر بەوەندە نەوەستان لە ٢١ شوباتی ١٩٩٨ بڕیاری هەڵوەشانەوەی(حزبی ڕەفاه) لە لایەن دادگای دەستوورییەوە درا، بە بیانووی ئەوەی مەترسی لەسەر سروشتی عیلمانییەت هەیە لە وڵاتدا[٤٥].

## ئەنجام

لە دووتوێی ئەم توێژینەوەیە دەتوانرێت ئەم خاڵانەی بووترێ:

١- لەگەڵ دامەزراندنی تورکیا نوێ لەسەر دەستی(مستەفا کەمال)و، هەنگاوەکانی بۆ چاکسازی، گورزێکی توند لە ئیسلام وەشێنراوە، بەڵام مێژووی تورکیا دوای دەسەڵاتی ئەو، ئەوە دەردەخات کە لە لایەن دەسەڵاتەوە ئەمسەرو ئەوسەرێك لەگەڵ تەوژمە ئیسلامییەکاندا کراوە، جارێك بە کرانەوە، بە تایبەت لەسەردەمی(عەدنان مەندەریس) لە پەنجاکانو، (تورگوت ئۆزال) لە هەشتاکان، جارێکی دیکەش تەنگەتاو کردنو ڕاوەدونان.

٢- پارتی(ڕەفاه) لە بەرنامەو کردەوەو پەیمانەکانیدا پتر بەرجەستەی ئیسلامی سیاسی کردووە نەك ئیسلامێکی ئسووڵی لە چەشنی بەرەی(ئیسلامی ڕزگاریخوازی لە جەزائیر) یان بزووتنەوە ئیسلامییەکانی(میسر)، یان(حیزبوللای) لوبنان.

٣- پارتی(ڕەفاه) لە سەرەتای دامەزراندنییەوە بەردەوام توانیوییەتی گەشە بە بەرنامەکانی بدات، لەم چواچێوەشدا هەنگاو لە دوای هەنگاو سەرکەوتنو دەنگی زیاتری لە هەڵبژاردنەکان بە دەست هێناوە، کە ئەوەش نیشانەی دواکەوتووی بەرنامەی پارتەکانی دیکەی سەر گۆرەپانی سیاسی تورکیا بووە بە بەراورد لەگەڵ پارتی(ڕەفاه)دا.

٤- دامەزراندنی حکومەت لە ٢٩ی حوزەیرانی ١٩٩٦ بە سەرۆکایەتی کەسێکی ئیماندارو بانگەشەکاری ئیسلامی لە تەك ئافرەتێکی سفووری وەك(تانسو جیللەر)، دیمەنێك بوو کە قۆناغێکی نوێ لە مێژووی تازەی حوکمڕانی لە تورکیا هێنایە ئاراوە، کە نەك لە پێش ئەو سەردەمە، بەڵکو دوای ئەو سەردەمەش تورکیا بە خۆیەوەی نەبینی.

٥- ئەگەرچی پارتی(ڕەفاه) لە ڕێی دیموکراسیو بە حەزی گەلو پشگیری خەڵك هاتە سەر دەسەلات، بەلام هەر لەگەڵ ئەوەی علمانییەکانو دەزگای سەربازی هەستیان بەوە کرد بەرژەوەندییەکانیان کەوتۆتە بەر مەترسییەوە بێ دوو دڵیو یەکڕاست پاڵەپەستۆیان خستە سەر دەسەلاتی ئەو پارتەو ناچاریان کرد لە حکومەت دەست لە کار بکێشێتەوە، بەمەش بە شێوەیەکی جیاوازتر لە پێشوو دەزگای سەربازی کودەتاییەکی دیکەی ئەنجامداو، ئەم کودەتاییەشی خستە ڕیزی کودەتاییەکانی دیکەی مێژووی نوێ تورکیایەوە.

## لیستی سەرچاوەکان

### کتێب

#### یەکەم: بە زمانی کوردی

بیار مصطفى سيف الدين، كێشەی كورد لە پەیوەندییەكانی ئەمریكا- توركیا، وەرگێڕانی: سەرمەد ئەحمەد، چاپی یەكەم، چاپخانەی هاوسەر، هەولێر، ٢٠٠٩.

حەمید بۆزئەرسلان، مێژووی توركیای هاوچەرخ، وەرگێڕانی: نەجاتی عەبدوڵڵا، چاپی یەكەم، هەولێر، ٢٠٠٩.

سامی شۆڕش، توركیاو ئەوروپا.. كورد لەو بازنەیەدا، چاپخانەی خانی، دهۆك، ٢٠٠٧.

سپێنسەر پز بویەرو براین كاتولیس، هاوپەیمانێتییە فەرامۆشكراوەكە" نوێكردنەوەی پێوەندییەكانی ئەمریكا- توركیا بۆ دەمەوەهاتنی تەحەدییاتەكانی سەدەی بیستو یەكەم"، وەرگێڕانی: ئاسۆ كەریم، چاپی یەكەم، چاپخانەی خانی(دهۆك)، ٢٠٠٩.

فەرۆز ئەحمەدو چەند نوسەرێكی تر، توركیای نەبەرد لەپێناوی مانەوەدا، سلێمانی، ٢٠٠٦.

گراهام فۆللەرو ئەوانی تر، جیۆپۆلەتیكی نوێی توركیا "ئاسیای ناوەند، وبەلقان، كورد، وەرگێڕانی، عەتا قەرەداخی، چاپخانەی ڕوون، سلێمانی، ٢٠٠٦.

محەمەد نورەدین، توركیا لەسەردەمی گۆڕاندا، وەرگێڕانی: ئازاد بەرزنجی، دەزگای چاپو پەخشی سەردەم، سلێمانی،١٩٩٧.

#### دووەم: بە زمانی عەرەبی

د. ابراهيم خليل احمد واخرون، تركيا المعاصره، مركز الدراسات التركيه، جامعه الموصل، ١٩٨٧.

د. ابراهيم خليل احمد و د. خليل علي مراد، ايـران و تركيـا دراسـة في التـاريخ الحديث والمعاصر، دار الكتب للطبعة والنشر، الموصل، ١٩٩٢.

د. ابراهيم خليل العلاف، نحـن و تركيـا دراسـات و البحـوث، الطبعـة الاولى، مركـز الدراسات الاقليمية، جامعة الموصل، ٢٠٠٨.

د. احمـد الموصـللي، موسـوعة الحركـات الاسـلامية في الـوطن العربـي وايـران وتركيا، الطبعة الاولى، بيروت، ٢٠٠٤.

د. جرجيس حسن، تركيا في الاستراتيجية الاميركية بعد سقوط الـشاه، الطبعـة الاولى، دون مكان طبع، ١٩٩٠.

فـيروز احمـد، صـنع تركيـا الحديثـة، ترجمـة: د. سـلمان داود الواسـطي و د. حمدي حميد الدوري، المطبعة العربية، بغداد، ٢٠٠٠.

مصطفى محمد الطحان، حزب العدالة و التنمية في تركيا رؤية في الداخل.(حصل على انترنيت www.google.com ).

محمد نورالدين، تركيا الجمهورية الحائرة، الطبعة الاولى، بيروت، ١٩٩٨.

ياسر احمد حسن، تركيا البحث عـن المـستقبل، الطبعـة الاولى، الـدار المـصرية اللبنانية، ٢٠٠٦.

نامەی زانکۆیی بڵاونەکراوە

یاسین صالح حەمە، رۆڵی ئۆپۆزسیۆنی سیاسیو کاریگەری لەسەر هەندێ لـە رژێمە سیاسییەکانی رۆژهەڵاتـی ناڤین" توێژینەوەیەکی شیکاری بەراوردکاریـە"، نامەی ماستەر، بڵاونەکراوە، پێشکەش بە ئەنجوومـەنی کۆلێـژی یاسـاو رامیـاری زانکۆی سەلاحەددین/ هەولێر کراوە، هەولێر، ٢٠٠٩.

## گۆڤار بە زمانی کوردی

ئیبراهیم خەلیل ئەلعەلاف، نەتەوایەتی لە جیاتی خەلافەت عەلمانییەت لە ڕووبەڕووبوونەوەی ئاییندا، وەرگێڕانی: کوردۆ کۆیی، گۆڤاری دۆستێی تورکیا، ژمارە(٦)، سلێمانی، ئابی ٢٠٠٧.

باران کایا، کودەتا سەربازییەکان ٥٠ ساڵ تورکیایان بەرەو دواوە برد، گۆڤاری دۆستێی تورکیا، ژمارە(٢) سلێمانی، ئەیلولی ٢٠٠٥.

د. نەوال عەبدولجەبار سوڵتان، ئایندەی ڕوبەڕوبونەوەی عیلمانیەت و ئیسلام لە تورکیا، گۆڤاری سەنتەری لێکۆلینەوەی ستراتیجی، ژمارە(٥٢)، سلێمانی، ئابی ٢٠٠٧.

## گۆڤار بە زمانی عەرەبی

د. ادريس بووانو، الاسلاميون الجدد في تركيا، البدايات والمكونات، التحولات والمعادلات، مركز الكاشف للمتابعة و الدراسات الاستراتيجية، القسم الثالث، كانون الاول، ٢٠١٠.

د. حنا عزو بهنان، تانسو تشيلر و موقفها من مشكلات تركيا الداخلية ١٩٩١-١٩٩٧، مركز الدراسات الاقليمية، جامعة الموصل. حصل على انترنيت(www.google.com).

د. محمد عثمان عبدالله، الاسلاميون والسلطة في تركيا: التجربة الاربكانية نموذجاً، مركز الكاشف للمتابعة و الدراسات الاستراتيجية، القسم الثاني، كانون الاول، ٢٠١٠.

ڕۆژنامەکان

دیارترین پارت و ڕێکخراوە سیاسییەکانی تورکیا، وەرگێڕانی: هێمن جەمال عەساف، ڕۆژنامەی برزاو، ژمارە(٣٧)، هەولێر، ٢ی ئاداری ٢٠٠١.

ئینتەرنێت

**Notes of Turkish political Thought. Michelangelo Guide ٢٠٠٦. www.fatih.edu.tr/mguid/PUB٢٢/٥.**

Dr.Tükkaya ATAÖV. THE PRINCIPLES OF KEMALISM.(www.historteache.net/Gobalsudies / reading/Ataturk-biography.pdf.

**www.cankaya.gov.tr/eng_html/demirel.html.**

**www.haberler.com/deniz-baykal/biyorafisi.**

**.www.mesutyilmaz.gen.tr**

## پاشكۆی ژمارە (١)

### ڕێژەی ئەو دەنگانەی پێنج پارتی یەكەم لە هەڵبژاردنەكانی ساڵی ١٩٨٩ بە دەستیان هێناوە(٤٦)

| ناوی پارت | هەڵبژاردنی شارەوانییەكان١٩٨٩ | هەڵبژاردنی نوێنەراتی١٩٩١ | هەڵبژاردنی شارەوانییەكان١٩٩٢ | هەڵبژاردنی نوێنەراتی١٩٩٥ |
|---|---|---|---|---|
| ڕێگەی ڕاست | ٢٥,١ | ٢٧,٠ | ٢١,٥٢ | ١٩,١٨ |
| نیشتمانی دایك | ٢١,٨ | ٢٤,٠ | ٢٠,٩٦ | ١٩,٦٥ |
| گەلی كۆمەڵایەتی(گەلی كۆمار) | ٢٨,٧ | ٢٠,٨ | ١٣,٤٩ | ١٠,١٧ |
| چەپی دیموكرات | ٩,٠ | ١٠,٨ | ٨,٨ | ١٤,٦٤ |
| ڕەفاه | ٩,٨ | ١٦,٩ | ١٩,٧ | ٢١,٣ |

## پاشکۆی ژمارە( ٢ )

## ئەنجامی هەڵبژاردنەکانی ١٩٩٥[٤٧]

| پارت | ٪ دەنگەکان | ڕێژەی کورسی ئەنجوومەن |
|---|---|---|
| ڕەفاە | ٢١,٣ | ١٥٨ |
| نیشتمانی دایك( ڕاسترەوە ) | ١٩,٦٥ | ١٣٢ |
| چەپی دیموکرات( چەپڕەو ) | ١٩,١٨ | ١٣٥ |
| گەلی کۆماری( چەپڕەو ) | ١٤,٦٤ | ٧٦ |
| بزاڤی نەتەوەیی( ڕاسترەوە ) | ١٠,٧١ | ٤٩ |
| دیموکراسی گەلی( کوردی ) | ٨,١٨ | - |
| بزاڤی دیموکراسی( لیبرال ) | ٣,١٧ | - |
| میللەت( ڕاستڕەو ) | ٠,٤٨ | - |
| لە دایکبوونی نوێ( ڕاستڕەو ) | ٠,٤٥ | - |
| کرێکاران( چەپی مارکسی ) | ٠,٢٢ | - |
| حزبی نوێ | ٠,١٣ | - |
| سەربەخۆکان | ٠,٤٨ | - |

(١) مستەفا کەمال. لە ساڵی(١٨٨١) لە سالۆنیك لە دایك بووە. ساڵی(١٩٠٥) کۆلێژی جەنگی لە ئەستەنبوول تەواو کردووە، بەشداری کردووە لە جەنگی یەکەمی جیهانی و فەرماندەی فیرقەی(١٩) سوپا بووە لە دەردەنیل. لە ماوەی نێوان ساڵانی(١٩١٩-١٩٢٢) سەرکردایەتی بزووتنەوەی رزگاریخوازی تورکی و جەنگی رزگاری کردووە. ناوبراو لە(١٩٢٣- ١٩٣٨) وەك یەکەم سەرۆك کۆمار رۆڵی کارای بینیوە لە دامەزراندنی تورکیای نوێدا. بۆ زیاتر زانیاری بروانە:

Dr.Tükkaya ATAÖV. THE PRINCIPLES OF KEMALISM. (www.historteache.net/Gobalsudies / reading/Ataturk-biography.pdf.

(٢) ئیبراهیم خەلیل ئەلعەلاف، نەتەوایەتی لە جیاتی خەلافەت عەلمانییەت لە رووبەرووبوونەوەی ئاییندا، وەرگێرانی: کوردۆ کۆیی، گۆڤاری دۆسێی تورکیا، ژمارە(٦)، سلێمانی، ئابی ٢٠٠٧، ل ٩٢-٩٤.

(٣) ئەمانە بریتی بوون لە چەند پارت و رێکخراوێکی سیاسی ئاینی کە بریتی بوون لە: (پارتی راپەرینی نەتەوەیی)؛ (پارتی پارێزگاری تورك) و؛(پارتی میللەت)..هتد. بۆ زیاتر زانیاری لە مەر چالاکی ئەمانە بروانە: فیروز ئەحمەد و چەند نوسەرێکی تر، تورکیای نەبەرد لەپێناوی مانەوەدا، سلێمانی، ٢٠٠٦، ل٣٤٩-٣٥١.

(٤) د. نەوال عەبدولجەبار سوڵتان، ئایندەی روبەروبونەوەی عیلمانیەت و ئیسلام لە تورکیا، گۆڤاری سەنتەری لێکۆلینەوەی ستراتیجی، ژمارە(٥٢)، سلێمانی، ئابی ٢٠٠٧، ل٨٩.

(٥) پارتی دیموکرات، لە ٧ی کانوونی دووەمی ١٩٤٦ لە لایەن دەستەبژێرێکی بۆرژواز دامەزرا کە لە پارتی گەلی کۆماری جیابوونەوە،(جەلال بایار). (عەدنان مەندەریس) و،(رەفیق کوالتان) لە دامەزرێنەرانی ئەو پارتە بوون. ئەم پارتە لە ساڵی(١٩٥٠) تا کودەتای ٢٧ی مایسی ١٩٦٠ لە تورکیا جلەوەی دەسەڵاتی گرتۆتە دەست. بۆ زیاتر زانیاری بروانە: د. ابراهیم خلیل احمد و د. خلیل علي مراد، ایران و ترکیا دراسة في التاریخ الحدیث والمعاصر، دار الکتب للطباعة والنشر، الموصل، ١٩٩٢، ص ٢٦٦.

(٦) پارتی گەلی کۆماری(جەهەپە)(CHP) کۆنترین رێکخراوی سیاسییە لە تورکیا کە لە ساڵی(١٩٢٣) لەسەر دەستی(مستەفا کەمال ئەتاتورك) هاتۆتە دامەزراندن، بەمەش تا ساڵی(١٩٤٦) تاکە پارتی سەر گۆرەپانی سیاسی تورکیا بووە. لە دوای هاتنی قۆناغی فرە حزبی سیاسی رۆڵی خۆی هەبووە، تا ئەوەی بە هۆی کودەتا سەربازییەکەی(١٩٨٠) رێگەی قەدەغەکردنی کاری سیاسی و ناوەکە کراوە، بەڵام دووبارە هاتۆتەوە سەر شانۆی سیاسی و، لە ساڵی(٢٠٠٧) تەوە بۆتە سەرەکیترین پارتی ئۆپۆزسیۆن لە تورکیا. سپێنسەر پز بویەر و براین کاتولیس، هاوپەیمانێتییە فەرامۆشکراوەکە" نوێکردنەوەی پێوەندییەکانی ئەمریکا- تورکیا بۆ دەمەوەهاتنی

تەحەدییاتەکانی سەدەی بیست و یەکەم"، وەرگێرانی: ئاسۆ کەریم، چاپی یەکەم، چاپخانەی خانی(دهۆك)، ٢٠٠٩، ل٢٢.

٧) د. نەوال عەبدولجەبار سولتان، سەرچاوەی پێشوو، ل٨٩.

٨) باران کایا، کودەتا سەربازییەکان ٥٠ ساڵ تورکیایان بەرەو دواوە برد، گۆڤاری دۆستی تورکیا، ژمارە(٢) سلێمانی، ئەیلولی ٢٠٠٥، ل١١٨.

(٩) نەجمەددین ئەربەکان، لە ساڵی(١٩٢٦) لە شاری سینوب لە دایك بووە، ساڵی(١٩٤٨) بڕوانامەی ئەندازیاری لە زانکۆی ئەستەنبوول بە دەست هێناوە، لە ساڵی(١٩٥٣) لە هەمان بوار لە ئەڵمانیا دوکتۆرای وەرگرتووە. تێکەڵ بە کاری سیاسی بووە ڕۆڵی کارای لە سەرکردایەتی ئیسلامی سیاسی لە تورکیا تا ساڵی(١٩٩٧)بینیوە. د. احمد الموصللي، موسوعة الحركات الاسلامية في الوطن العربي وايران وتركيا، الطبعة الاولى، بيروت، ٢٠٠٤، ص١٠٥. ئەربەکان ٢٧ی شوباتی ٢٠١١ کۆچی دوایی کردووە(توێژەر).

(١٠) ياسر احمد حسن، تركيا البحث عن المستقبل، الطبعة الاولى، الدار المصرية اللبنانية، ٢٠٠٦، ص٧٧؛ مصطفى محمد الطحان، حزب العدالة و التنمية في تركيا رؤية في الداخل، ص٢(حصل على انترنيت www.google.com ).

(١١) د. ادريس بووانو، الاسلاميون الجدد في تركيا، البدايات والمكونات، التحولات والمعادلات، مركز الكاشف للمتابعة و الدراسات الاستراتيجية، القسم الثالث، كانون الاول، ٢٠١٠، ص ٣٩-٤٠.

(١٢) د. ابراهيم خليل العلاف، نحن و تركيا دراسات و البحوث، الطبعة الاولى، مركز الدراسات الاقليمية، جامعة الموصل، ٢٠٠٨، ص ٣٨٤؛ فەرۆز ئەحمەد و چەند نوسەرێکی تر، سەرچاوەی پێشوو، ل٣٢٤.

(١٣) د. احمد الموصللي، المصدر السابق، ص ٢٧١-٢٧٢؛ ياسر احمد حسن، المصدر السابق، ص ٧٨.

(١٤) مستەفا بولند ئەجەوید، لە ٢٥ی مارتی ١٩٢٥ لە ئەستەنبوول لە دایك بووە، ساڵی(١٩٤٤) کۆلێژی ئەدەبیات زانکۆی ئەستەنبوول تەواو کردووە. لە ماوەی نێوان ساڵانی(١٩٤٦-١٩٥٠) لە چاپخانەی بالوێزخانەی تورکیا لە لەندەن کاری کردووە، لە(١٩٥٠) لە ڕۆژنامەی ڕۆژنامەی(ئۆلۆس) زمانحاڵی پارتی گەلی کۆماری وەکو نووسەر کاری کردووە. ساڵی(١٩٥٧) زەمالەی خوێندنی لە زانکۆی هارڤەرد وەرگرتووە، دوای گەڕانەوەشی ڕۆڵی کارای بینیوە لە سەر شانۆی سیاسی تورکیا بە تایبەتی حەفتاکان و نەوەدەکانی سەدەی بیستەم. ناوبراو لە تشرینی دووەمی(٢٠٠٦) کۆچی دوایی کردووە. بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە:

Notes of Turkish political Thought. Michelangelo Guide ٢٠٠٦. www.fatih.edu.tr/mguid/PUB٢٣/٥.

(١٥) د. محمد عثمان عبدالله، الاسلاميون والسلطة في تركيا: التجربة الاربكانية نموذجاً، مركز الكاشف للمتابعة و الدراسات الاستراتيجية، القسم الثاني، كانون الاول، ٢٠١٠، ص ١٠ و مابعدها.

(١٦) پارتی عەدالەت(داد)، لە ساڵی(١٩٦١) دامەزراوەو لەلایەن(سلێمان دیمیریل)، سەرکردایەتی کراوە، لە ساڵی(١٩٦٥) تا(١٩٧١) بە زۆرینەی دەنگ دەسەڵاتی تورکیا بە تەنیا گرتۆتە دەستو دواتریش لە کاری سیاسی بەردەوام بووە تا کودەتای ساڵی(١٩٨٠). دیارترین پارتو رێکخراوە سیاسییەکانی تورکیا، وەرگێڕانی: هێمن جەمال عەساف، ڕۆژنامەی بزاو، ژمارە(٣٧)، هەولێر، ٢ی ئاداری ٢٠٠١، ل ٥.

(١٧) پارتی بزووتنەوەی نەتەوەیی، رەگو ریشەی ئەم پارتە دەگەڕێتە بۆ(پارتی ئوممە) کە لە ساڵی(١٩٤٨) هاتبووە دامەزراندن، دواتر لە ساڵی(١٩٥٤) بوو بە (پارتی نیشتمانی جوتیاری)، بەردەوام بوو تا ئەوە لە شوباتی(١٩٦٩) بوو بە(پارتی بزووتنەوەی نەتەوەیی)، بەم شێوەیە ڕۆڵی هەبوو لەسەر گۆڕیانی سیاسی تورکیا. د. ابراهيم خليل احمد واخرون، تركيا المعاصرة، مركز الدراسات التركية، جامعة الموصل، ١٩٨٧، ص١٧٣

(١٨) محەمەد نورەدین، تورکیا لەسەردەمی گۆڕاندا، وەرگێڕانی: ئازاد بەرزنجی، دەزگای چاپو پەخشی سەردەم، سلێمانی،١٩٩٧، ل١١٠؛ فيروز احمد، صنع تركيا الحديثة، ترجمة: د. سلمان داود الواسطي و د. حمدي حميد الدوري، المطبعة العربية، بغداد، ٢٠٠٠، ص٣٨٢.

(١٩) د. ابراهيم خليل احمد واخرون، تركيا المعاصرة، ص١٧٥.

(٢٠) بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە: د. جرجيس حسن، تركيا في الاستراتيجية الاميركية بعد سقوط الشاه، الطبعة الاولى، دون مكان طبع، ١٩٩٠، ص ٤٧- ٥٨.

(٢١) باران کایا، سەرچاوەی پێشوو، ل١٢٢؛ حەمید بۆزئەرسلان، مێژووی تورکیای هاوچەرخ، وەرگێڕانی: نەجاتی عەبدوڵڵا، چاپی یەکەم، هەولێر، ٢٠٠٩، ١١٦ل.

(٢٢) د. ابراهيم خليل العلاف، نحن و تركيا، ص ٣٨٩؛ د. ادريس بووانو، المصدر السابق، ص٤٣.

(٢٣) تورگوت ئۆزال، لە ساڵی(١٩٢٧) لە مەلاتییە لە دایك بووە، ئەندازیارێکی بەناو بووەو لە زانکۆکانی ئەمریکا خوێندنی تەواو کردووە، لە ماوەی (١٩٨٣-١٩٨٩) بۆتە سەرۆك وەزیرانی تورکیاو ، لە (١٩٨٩-١٩٩٣)یش بە سەرۆك کۆمار، ناوبراو لە دوای ئەتاتورکەوە کاریگەری لەسەر سیاسەتی تورکیا هەبووە، بە شێوەیەك ماوەی نێوان(١٩٨٣-١٩٩٣) بە دەیەی ئۆزالیزم لە تورکیا دانراوە، لەبەر ئەوەی خەسڵەتی کەسایەتی کاریزمی وەکو ئەتاتورکی هەبووە. ئۆزال لە ١٧ی نیسانی ١٩٩٣ کۆچی دوایی کردووە. بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە: یاسین صالح حەمە، ڕۆڵی ئۆپۆزسیۆنی سیاسیو کاریگەری لەسەر هەندێ لە رژێمە سیاسییەکانی رۆژهەڵاتی ناڤین" توێژینەوەیەکی شیکاری بەراوردکاریە"، نامەی ماستەر، بڵاونەکراوە، پێشکەش بە ئەنجوومەنی کۆلێژی یاساو رامیاری زانکۆی سەلاحەددین/ هەولێر کراوە، هەولێر، ٢٠٠٩، ل ١٢٧.

(٢٤) پارتی نیشتمانی دایك، لە مایسی(١٩٨٣) بە سەرۆكایەتی(تورگوت ئۆزال)و كۆمەڵی لە هاوڕێیانی كە لە پۆستی حكومی دابوون هاتە دامەزراند، ئەمانە بە مەیلی ڕاستڕەوو ڕۆڵیان لە كودەتای ساڵی(١٩٨٠) ناسرابوون، بەرنامەی هەڵبژاردانی ئەم پارتە جەختی لەسەر كەرتی تایبەت وەك بنەمایەكی پەرەسەندی ئابووری توركیا و دەستێوەرنەدانی لە چالاكییە بازرگانیو پیشەسازییەكانی وڵات دەكردەوە، لە پاڵ هاندانی بیرۆكەی بازاری ئازادو گەشەسەندنی ئابووری. لە ئاستی دەرەوەشدا بە لایەنگریو پاراستنی ئاستێكی بەرزی گرێدان بوون بە ئەمەریكاو ڕۆژئاوا. بیار مصطفی سیف الدین، كێشەی كورد لە پەیوەندییەكانی ئەمریكا- توركیا، وەرگێڕانی: سەرمەد ئەحمەد، چاپی یەكەم، چاپخانەی هاوسەر، هەولێر، ٢٠٠٩، ل٣٩.

(٢٥) د. محمد عثمان عبدالله، المصدر السابق، ص١٩.

(٢٦) د. ادریس بووانو، المصدر السابق، ص٤٤.

(٢٧) پارتی ڕێگای ڕاست، لە ٢٣ی حوزەیرانی ساڵی ١٩٨٣ لەسەر پێشینەی(پارتی داد) هاتە دامەزراندنو بە پارتێكی(میانڕەو) ناسراوە. بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە: د.ابراهیم خلیل واخرون، تركیا المعاصرة، ص١٨٨.

(٢٨) د. محمد عثمان عبدالله، المصدر السابق، ص٢٠.

(٢٩) محەمەد نورەدین، سەرچاوەی پێشوو، ل٩٣.

(٣٠) د. محمد عثمان عبدالله، المصدر السابق، ص٢٠.

(٣١) د. ادریس بووانو، المصدر السابق، ص٤٤؛ محەمەد نورەدین، سەرچاوەی پێشوو، ل٧٦، ٨١.

(٣٢) د. ادریس بووانو، المصدر السابق، ص٤٥.

(٣٣) محەمەد نورەدین، سەرچاوەی پێشوو، ل٧٦، ٨٤.

(٣٤) د. نەوال عەبدولجەبار سوڵتان، سەرچاوەی پێشوو، ل٩٩ ؛ گراهام فوللەرو ئەوانی تر، جیۆپۆلەتیكی نوێی توركیا"ئاسیای ناوەند، وبەلقان، كورد"، وەرگێڕانی، عەتا قەرەداخی، چاپخانەی ڕوون، سلێمانی، ٢٠٠٦، ل ٥٦.

(٣٥) سلێمان دیمیرل، ساڵی(١٩٢٤) لە بنەماڵەیەكی بیرۆقراتی لە دایك بووە، بۆیە بزنزمان بووە بەر لەوەی سیاسیی بێت. ناوبراو شەش جار بۆتە سەرۆك وەزیران لە توركیا لە ماوەی نێوان(١٩٦٥-١٩٨٠). دواتریش لە كاری سیاسی لە توركیا تا ساڵی ٢٠٠٠ بەردەوام بووە. بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە:

www.cankaya.gov.tr/eng_html/demirel.html.

(٣٦) پارتی چەپی دیموكرات، ئەم پارتە لە تشرینی دووەمی ١٩٨٥ لەسەر دەستی(ئیسماعیل یەدین ئۆغلو) پارێزگاری بانكی ناوەندەی لە سەردەمی حوكمڕانی(بولند ئەجەوید) هاتە دامەزراندن، لە سەركردەكانی ئەو پارتە(شریهان) خان خێزانی(ئەجەوید) بوو. بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە: د.ابراهیم خلیل واخرون، تركیا المعاصرة، ص١٨٩.

(٣٧) دەنیز بایکال، بنەچەی بۆ ناوچەی کریت دەگەڕێتەوەو، لە ساڵی(١٩٥٩) کۆلێژی یاسای زانکۆی ئەنقەرەی تەواو کردووە. دواتر چۆتە هەمان زانکۆو ساڵی(١٩٦٣) بڕوانامەی دوکتۆرای وەرگرتووە، ناوبراو بەشداری کاری سیاسی کردووەو ڕۆڵی کارای بینیوە بە تایبەت لە ڕیزی(پارتی گەلی کۆماری). بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە:
www.haberler.com/deniz-baykal/biyorafisi.

(٣٨) حەمید بۆزئەرسلان، سەرچاوەی پێشوو، ل١٣٥.

(٣٩) محەمەد نورەدین، سەرچاوەی پێشوو، ل٨٦.

(٤٠) تاسنۆ جیللەر، لە ساڵی ٢٣ تشرینی یەکەمی ١٩٤٦ لە ئەستەنبوول لە دایك بووو دەرچووی زانکۆی پسفۆرە، هەروەها لە هەمان زانکۆ مامۆستای ئابووری بووە، ناوبراو لە ساڵی(١٩٩٠) هاتە ناو کاری سیاسیو دواتر بوو بە سەرۆکی(پارتی نیشتمانی دایك)،(جیلەر) یەکەمین ئافرەت بوو پۆستی سەرۆك وەزیرانی وەرگرت لە نێوان ساڵانی(١٩٩٣-١٩٩٥)، بەڵام چوونی بۆ ناو هاوپەیمانییەتی لەگەڵ حکومەتی(ئەربەکان) بووە سەرەتای کۆتایی ژیانی سیاسی ئەم ئافرەتە. بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە: د. حنا عزو بهنان، تانسو تشیلر و موقفها من مشكلات تركيا الداخلية ١٩٩١- ١٩٩٧، مركز الدراسات الاقليمية، جامعة الموصل. حصل على انترنيت(www.google.com).

(٤١) مەسعود یەلماز، ساڵی(١٩٤٧) لە ئەستەنبوول لە دایك بووە، خوێندنی دواناوەندی لە هەمان شار تەواو کردووە. ساڵی(١٩٧١) بەشی دارایی و ئابووری لە کۆلێژی زانستی سیاسی تەواو کردووە، بۆ خوێندنی باڵا چۆتە ئەڵمانیاو(١٩٧٢ - ١٩٧٤) خوێندنی تەواو کردووە، پاشان هاتۆتەوەو لە کۆلێژی زانستە کۆمەڵایەتییەکان خزمەتی کردووە. ساڵی(١٩٨٣) دەستی هەبوو لە دامەزراندنی(پارتی نیشتمانی دایك)و بە جێگری سەرۆکی ئەم پارتە هەڵبژێردراوەو لە وێوە ڕۆڵی کارای بینیوە لە سەر شانۆی سیاسی تورکیا. بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە:
www.mesutyilmaz.gen.tr.

(٤٢) د. احمد الموصللي، المصد السابق، ص٢٧٠.

(٤٣) بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە: محمد نورالدين، تركيا الجمهورية الحائرة، الطبعة الاولى، بيروت، ١٩٩٨، ص ٩٣ ومابعدها.

(٤٤) فەرۆز ئەحمەد، سەرچاوەی پێشوو، ل ٢٣٤- ٢٤٠؛ حەمید بۆزئەرسلان، سەرچاوەی پێشوو، ل١٢٨.

(٤٥) د. نەوال عەبدولجەبار سوڵتان، سەرچاوەی پێشوو ، ل٩٩ بەدواوە؛ سامی شۆڕش، تورکیاو ئەورووپا.. کورد لەو بازنەیەدا، چاپخانەی خانی، دهۆك، ٢٠٠٧.ل ٦٤-٦٥.

(٤٦) محەمەد نورەدین، سەرچاوەی پێشوو، ل١٠٠.

(٤٧) محەمەد نورەدین، سەرچاوەی پێشوو، ل ١٠٠.

# کوردستان و پەیمانا سایکس پیکۆ ـ سازانۆف

بێوار ئیدریس دەحلێنەوی

ئێک ژدژوارترین جەنگێن ل دەسپێکا سەدێ بیستێ رویدای، وتێدا زیان گەهشتیە زوربەیا دانشتییێن سەر رویێ ئەردی ب(جەنگێ ئێکێ یێ جیهانی)هاتە نیاسین، بوماوێ چوار سالا(١٩١٤–١٩١٨ز) ڤەکێشا، دناڤبەرا کومەکا دەولەتێن مەزن دا هاتبوو کرن.[١]

جەنگێ ئێکێ یێ جیهانی ل هاڤینا سالا ١٩١٤ێ دەسپێکر، ل دەسپێکێ هەفت دەولەتا پشکداری تێداکر، وببونە دوو کومەلێن هەڤدژ، کومەلا ئێکێ ژئەلمانیا، ئیمبراتوریەتا نەمسا –مەجر(دەولەتێن مەلبەندی))، کومەلا دووێ ژفرەنسا، روسیا، برێتانیا، سربیا ویەلجیکا(دەولەتێن هەڤالبەند)بوون.دگەل بەردەوامیا جەنگی گەلەك دەولەتێن دن پشکداری تێداکر وخودا دگەل ئێك ژکومەلێن ناڤبری.[٢]ئێك ژوان دەولەتا دەولەتا ئوسمانی بوو ل٤ ی چریا دووێ ١٩١٤ێ پشکداری دجەنگیدا کر خودا دگەل کومەلا ئێکێ، دەولەتا ئوسمانی ژبەر دوو ئەگەرا پشکداری دجەنگیدا کر، یائێکێ‌دائەو پەیمانا نهێنیا ل ئابا سالا ١٩١٤ێ یاکو دگەل ئەلمانیاکری جێبەجێ بکەت[٣]، یادووێ هێزێن ئوسمانی ل ٢٩ێ تەباخا ١٩١٤ێ گەشتێن روسیا ددەریایا رەشدا توپبارانکرن،[٤]ئەڤەژی بو سەدەما وێ یەکێ کو روسیا شەری دژی دەولەتا ئوسمانی براگەهینیت، وپشتی هنگی بسێ روژا برێتانیا وفرەنسا ژی دژی ئوسمانیا راوەستیان، کوردان ژی مل

بملێ دەولەتا ئوسمانی پشکداری دجەنگیدا کر" چونکە دەولەتا ئوسمانی وەسا بو میللەتێن موسلمانێن لژێر دەستهەلاتا خو راگەهاندبوو کو موسلمانن ویێ دژی کافرا دجەنگن.[٥]

سەرەرای هندێ ژی کو کوردا چ بەرژەوەندی دناف ئەڤی جەنگیدا نەبون" بەلێ وەکی هەر نەتەوەکێ دی یێ پشکداری دجەنگیداکری زیانێن مەزن ڤێ کەفتن .[٦]دەڤەرێن روژهەلاتا ئەنازول وروژئاڤایا ئیرانێ وباکورێ ئیراقێ–کو کورد تێدا دژین(کوردستانە)–بوونە گورەپانا جەنگی[٧]دناڤبەرا لەشکەرێ روسیا،ترکیا، ئینگلیزو ئەلمانیا دا، هەر ل دەسپێکا جەنگی تا بدوماهی هاتی.[٨]

هەر دماوێ چوار سالێن رویدانێن جەنگێ ئێکێ یێ جیهانیدا–وژبەر بەرژەوەندیێن ئیستعماری ودابەشکرنا عەردی ژبو بەرفرەهـ بوون وزەنگینیا دەولەتێن مەزن–چەند رێکەفتن وگرێبەستەك دناڤبەرا وان دەولەتاندا هاتنە بەستن وموركرن، بتایبەتی دووی دەمێ کو دەولەتێن هەڤال بەند هێرش دبرنە سەر سامانێ(ممتلكات)ێن دەولەتا ئوسمانی،هندەك نەخشەیێن نهێنی ژبو دابەشکرنا وی سامانی(ممتلكات)ان ددانان.

ژگرنگترین وان رێکەفتن و گرێ بەستێن دماوێ چوار سالێن جەنگێ ئێکێ یێ جیهانیدا–ژبو دابەشکرنا سامانێ(ممتلكات)ێن دەولەتا ئوسمانی–هاتینە بەستن و موركرن: رێکەفتناما ئەستەنبول ١٨ی ئادارا ١٩١٥، رێکەفتناما لەندن ٢٦ی نیسانا ١٩١٥، رێکەفتناما سایکس–پیکو ١٦ی ئەیارا ١٩١٦، ورێکەفتناما سان جان دی موریین ١٧ی نیسانا ١٩١٧ز بوون[٩].

لڤێرە مە دڤێت ل سەر رێکەفتنا سایکس–پیکو راوەستین" چونکە بابەتێ مەیە و ئێك ژوان رێکەفتنامایە کو بویە ئەگەرێ دابەش کرنا کوردستانێ، دگەرمە گەرما جەنگێ ئێکێ یێ جیهانیدا دەولەتێن سویندخواری یێن مەزن بتایبەتی

ئینگلیزو فرەنسا وروسیا ل هیڤیاویَ چەندێ بوون کو چارەنڤیسێ دەماهیک رۆژا جیهانیَ بگشتی و(رۆژ هەلاتا ناڤەراست)[١٠] بتایبەتی، ل دویف شیانا رێک وپێک بکەن وسنورێن دەسکەفتیێن هەر لایەنەکی بکێم و زور بئاشکەرایی دیاربکەن، ئەف چەندە کر داکو دەمێ سەرکەفتنێ دگەل هەڤرکێن خو بدەست خوڤە دئینن، چ دلمان وناکوکی دناڤبەرا وان بخو بخودا روینەدەن[١١]، ئەڤا کو پەیوەندی برۆژ هەلاتا ناڤەراست ڤە هەی گفتو گوییَ بشێوەکێ نهێنی ل سەر بکەن هەر لڤێ مێژوییَ دەست پێبکەت، بەلێ ئەڤێ چەندێ بو ماوەیەکی ڤەکێشا تا کو ئەف دەولەتە گەهشتینە رێککەفتنەکێ بناڤێ سایکس-پیکو[١٢]، کو رێککەفتنەکا نهێنی بوو دناڤبەرا (سایکس)ێ نوێنەرێ بریتانیا و(پیکو)یێ نوێنەرێ فرەنسا[١٣] و وەزیرێ روسی سازانوف ل ١٦ی ئەیارا١٩١٦ز.[١٤]

بگوتنەکادی، پشتی بریتانیا وفرەنسا زانی کو ئەلمانیا دجەنگێ ئێکێ یێ جیهانیدا شکەستی، پەیمانەکا نهێنی دەربارەی کاروبارێن داهاتوویێن رۆژ هەلاتا ناڤەراست مورکر، کو ب(سایکس-پیکو) هاتە نیاسین، هەروەسا دەمێ وەزیرێ دەرڤەیێ روسیا(سازانوف) هەست بڤێ پەیمانێ کری، ل٢٦ی ئاوریلا سالا ١٩١٦ز راگەهاند کو ئەو یێ رازیە ل سەر پەیمانا ناڤبری بمەرجەکی "کو ئەوژی مەلبەندێن باکورێ رۆژهەلاتا تورکیا بدەنە روسیا."[١٥]

ل ئادارا سالا ١٩١٦ز جورج-پیکو ومارک-سایکس گەهشتنە بترسبورغ پایتەختا روسیا داکو ئەو تشتێ لسەر رێککەفتین پێشکێشی قەیسەری بکەن، هەردو لایا بیرخستنەکا دیر ودرێژ ل دور بابەتی پێشکێشی وەزیرێ دەرڤە (سازانوف)کر، ودیازدە بەندێن وێدا هاتبوو کو تورکیا یا ئاسیا ل سەر پێنج دەڤەرا دابەش بکەن، دابەش کرنا وێ بڤی رەنگی بیت:[١٦]

١- ناوچا شین: کو ژدەڤەرێن رۆژ ئاڤایا سوریا ولبنـان دگـەل کیلکا وعنتـاب وئورفا وماردین ودیاربکر وهەکاری پێکبێت، هەردو لا ل سەر هندیێ رێککەفتن کو ئەف دەڤەرە ل ژێر کونترولا فرەنسا دابن.

٢- ناوچـا سـوور: ژبەشـیێ باشـوریێ ویلایـەتا بەغـدا دگـەل ویلایـەتا بەسـرا وهەردوو بەندەرێن حەیفا وعەکا پێك بهێت، وسەر ب ئینگلتەرا ڤە بیت.

٣- ناوچا قەهوایی: ژپشکا مایـا فلـستین پێکدهێت، ودبـن چـاڤدێرییا نیـف دەولەتیدابیت، وروسیا دگەل دەولەتێن رۆژ ئاڤا ل سەر رێکبکەڤن.

٤- ناوچا a: ژبەشیێ رۆژ هەلاتا سـوریا وبـاکوریێ ئیراقـیێ پێکـدهێت، وببیتـە ناوچەیەك ل ژێر دەست هەلاتا فرەنسا ڤە.

٥- ناوچـا b: ژئـوردن وئیراقـا ناڤەراسـت پێـك بهێـت، وببیتـە ناوچـەیەك دچارچوڤەییێ دەست هەلاتا برێتانیا دا.

خـالێن (١،٢،٤،٩) ژرێککـەفتنا برێتانیـا-فرەنـسا بپاشـەرۆژا کوردسـتانیێ ڤـە دگرێـدایی بـوون، واتـە دڤـان خـالادا بەحـسیێ دابەشـکرنا دەڤـەرێن کوردسـتانیێ هـاتبوو کـرن، بـوو نموونـە تێـدا هـاتبوو روسـیا دەسـت هەلاتـدارییا دەڤـەرێن کوردستانیێ (باشوریێ وانیێ وبدلیس)بکەت. کێشا کوردی دڤیێ پەیمانا نهێنیـدا نـە هاتبوو فەراموشکرن-بەلێ لجهیێ چارەسەرکرنا کێشا کوردی-هـزر ددابـەش کرنـا کوردسـتانا ئوسمـانی دا دکـر، دگـەل ڤـیێ چـەندیێ ژی مـارك-سـایکس دڤیـا کوردسـتانا باشـور بێخیتـە دبـن کـونترولا برێتانیـا وفرەنـسا ڤـە، وبنـاڤ لـبن دەستهەلاتەکا عەرەبی ڤەبیت.[17]

لازاریـف ل سـەر رێککـەفتنا سـایکس-پیکـو وبەنـدێن تایبـەت بپارچـە کرنـا کوردستانیێ ڤە دئاخڤیت ودیاردکەت کو فرەنسا دەڤەرێن کوردستانا رۆژ ئاڤـا یـا نوکە وکوردستانا سورییێ هەمی وپارچا باشـوریێ رۆژهـەلات ژ کوردسـتانا تورکیـا

ئێخستبونە دبن كونترولا خوڤە، روسیا ئەڤ پارچێن مایی ژكوردستانا توركیا وئەرمینیا رۆژئاڤا گرتبون، بریتانیا پارچەك ژكوردستانا ئیراقێ تا باشورێ كەركیك وپارچا باشورێ رۆژئاڤا یا كوردستانا ئیرانێ ئێخستبونە دبن كونترولا خوڤە، ئەڤ دەڤەرێن مابێن كوردستانێ دڤێ رێككەفتنێدا دابونە روسیا.[18]

لێ پشتی كو نوینەرێن هەردوو دەولەتێن فرەنسا وبریتانیا پێشنیارێن خو دانابنە پێش چاف ل دەف وەزیرێ دەرڤەی روسیا سازانوف وپشتی گفتو گویەكا درێژ، گەلەك بیرو بوچونێن نوی دەركەفتن ودژاتیەك دناڤبەرا پێشنیارێن واندا پەیدابو، سەرەرای كو هەردوو لا لسەر هندەك خالا رێككەفتن، بوو نموونە: فرەنسا دژی هندێ راوەستیا كو ئامێدیێ ورەواندوز بكەڤنە دناف دەڤەرا (a) دا، هەروەسا فرەنسا دژی دەست نیشانكرنا یاسایێن روسی-ئەوێن دبەرژەوەندی ودەسكەفتیێن فرەنسا دا ل وان دەڤەرێن بو روسیا دكەڤن- راوەستیا، هەرچەوابیت هەرسێ دەولەتێن ناڤبری رێككەفتن ل سەر ئەڤ خالێن دپەیمانا سایكس-پیكو دا هاتین.[19]

بڤی شێوەی وپشتی دابەشكرنا كوردستانێ دناڤبەرا سێ دەولەتێن ئیستعماریێن مەزن دا، هاتە دابەشكرن ل سەر سێ بەشا: بەشێ روسی، ئینگلیزی، وفرەنسی.هەژییە بێژین كوردستان دڤێ دابەشكرنێدا بایەخەكێ گەلەك مەزن دا بویە" ئەوژی ژبەر ئەڤان ئەگەرێن ل خوارێ:

أ- دیتنا نفتێ وبهایێ ئابوریێ دەڤەرێ.

ب- وەكی بەربەستەكێ بوول بەردەم تەماعی وڤیانا دەولەتا روسیا كو بەردەوام چاڤێ وان لوێ رۆژێ بوو دەستێ وان بگەهیتە دەڤەرێن ئاڤێین رۆژهەلاتا ناڤەراست.

ج– دابینکرنا گەیشتنێ بو وەلاتێ هندێ وخوارویا رۆژهەلاتا ئاسیا برێکەکا دیر ژمەترسی وزامن کرنا بەردەوام هاتن و چونێ.[20]

د– کوردستان دکەڤیتە دلێ رۆژهەلاتا ناڤەراست، وجهێ وێ یێ جیوپولیتکی[21] بویە ئەگەرێ هندێ کو دەولەتێن مەزن هەڤرکییێ ل سەر بکەن. هەر دیڤێد مەکدول دیاردکەت: دنەخشێ سایکس–پیکو دا دیار دبیت کو بریتانیا نەبتنێ گرنگییێ بکوردستانێ ددەت بشێوەیەکێ سەرەکی" بەلکو هزر دپاشەرۆژا کوردستانێ دا دکر بحکمێ جهێ وێ یێ ستراتیجی ل وەلاتێ دناڤبەرا دوو رویبارادا.[22]

وەسا ئەڤ پەیمانە هاتە بەستن ومورکرن" کو ئێك ژ مەترسی ترین پەیمانێن نیڤ دەولەتی بوو ژبو دابەشکرنا پارچەکا مەزن و هەستیار و زەنگین ژ رۆژهەلاتا ناڤەراست دناڤبەرا سێ ژ مەزنترین دەولەتێن ئیستعماری، ول سەر حسێبا پاشە رۆژ وهیڤی وئومێدێن گەلێ دەڤەرێ وبێی وان،[23] وئێك ژوان گەلا گەلێ کورد بوو(کوردستان)" کو بوویە قوربانێ پەیمانێن داگیر کەران وخالەکا سەرەکی بوو بو ئارمانج وهەڤرکیا هەر سێ دەولەتا: برێتانیا، فرەنسا، وروسیا.

[1]-كيوان ازاد انور، صفحات من التاريخ الحديث للشعب الكوردي، ترجمة:ثرشنط عبدالله، مجلة ثـتيظين العربي،عدد(١٢)، سليمانية، أب ٢٠٠٥،ص١٥١-١٥٢.

٢-ژبو ئەگەرێن رویدانا جەنگێ جیهانیێ ئێكێ وقوناغێن وێ، بنێرە: د.خليل علي مراد وأخرون، دراسات في التاريخ الاوروبي الحديث والمعاصر،الموصل،١٩٩٤، ص٢٢٧ ومابعدها " د.فاضل حسين ود.كاظم هاشم نعمه، التاريخ الاوربي الحديث ١٨١٥-١٩٣٩، بغداد، ١٩٨٢، ص١٦٢-٢٠٩.

[3]-ژبو پەیوەندییێن دەولەتا ئوسمانی دگەل ئەلمانیا وئەڤێ پەیمانێ، بنێرە: باسيل دقاق، تركيا بين جبارين، بيروت، ١٩٤٧، ص٢٧ ومابعدها.

[4]-د.هيثم خليل احمد ود.خليل علي مراد، ايران وتركيا دراسة في التاريخ الحديث والمعاصر، الموصل، ١٩٩٢، ص٢٢٥ ومابعدها.

[5]-سروه اسعد صابر، كوردستان من بداية الحرب العالمية الاولى الى نهاية مشكلة الموصل ١٩١٤-١٩٢٦ : دراسة تأريخية سياسية وثائقية، اربيل، ٢٠٠١، ص٣٧.

٦-د.حامد محمود عيسى، المشكلة الكوردية في الشرق الاوسط منذ بدايتها حتى سنة ١٩٩١م، القاهرة، ١٩٩٢، ص٢٧.

٧- م.س.لازاريف، المسألة الكوردية (١٩١٧-١٩٢٣)، ترجمة: عبدي حاجي، بيروت، ١٩٩١، ص١٧.

[8]-بو پتر پێزانین ل سەر كوردا دجەنگێ ئێكێ یێ جیهانیدا، بنێرە:د.كەمال مەزهەر ئەحمەد، كوردستان لە ساڵەكانی شەری یەكەمی جیهاندا،بەغدا، ١٩٧٥، ل٥١ وپشتی وێ، جليلي جليل وأخرون، الحركة الكوردية في العصر الحديث، ترجمة:عبدي حاجي، بيروت، ١٩٩٢، ص٨٧-١٠٠" د. بلەج شيركو، القضية الكوردية: ماضي الكورد وحاضرهم، مصر، ١٩٣٠، ص٥٩ وما بعدها.

[9]-بو ڤان پەیمانا بنێرە: جورج لنشوفسكي، الشرق الاوسط في الشؤن العالمية، ترجمة: جعفر خياط، بغداد، ١٩٦٤، جزء الاول، ص١٠٣ وما بعدها" د.هيثم خليل و...، المصدر السابق، ص٢٢٨-٢٢٩.

[10]-رۆژ هەلاتا ناڤەراست: ئەڤ زاراڤە نەیێ كەڤنە، ل دەسپێكا سەدێ بیستێ ول سالا ١٩٠٣ز هاتیە بكار ئینان ، بو پتر پێزانین، بنێرە: هوگر طاهر توفيق، دور الصحافة الكوردي في تطوير الوعي القومي الكوردية ١٨٩٨-١٩١٨، دهوك، ٢٠٠٤، ص١٧.

١١-د.احمد عوسمان ابوبكر، كوردستان لەپەیمانی سایكس-پیكو وسازانوف-پالیولوگ دا، گوڤاری رۆژی كوردستان، ژمارە(٨)، بەغدا، مایس، ١٩٧٢، ل٥٠.

[12]-هەمان سەرچاوە،ل٥٠. وئەو رێككەفتناما تایبەت بدەڤەرێن كوردیڤە ل توركیا(كوردستانا باكور) دگوتنێ رێككەفتناما سازانوف-باليولوغ، بنێرە: هەمان سەرچاوە، ل٥٠.

[13]-م.س.لازاريف وأخرون، تاريخ كوردستان، ترجمة: د.عبدي حاجي، دهوك، ٢٠٠٦، ص١٨٢؛ سەعيد مەموزيني، بەركوڵێك لە مێژووی كوردو كوردستان، هەولێر، ٢٠٠٧، ل٢٥٧.

١٤-سمير ئاكرەيي، كوردستان: لماذا كل العالم صامت؟، اربيل، ٢٠٠٧، ص٥٠. هەژيیە بێژين روسيا خو ژڤێ پەيمانێ ڤەدكێشيت پشتی شورەشا چريا بەری ١٩١٧ز ل روسيا. المصدر نفسه، ص٥٩.

[15]-د.عبدالرحمن قاسملو، كوردستان وكورد: لێكۆڵينەوەيەكی سياسی وئابووری، وەرگێرانی: عبدالله حسن زادە، چاپی دووەم، هەولێر، ٢٠٠٦، ل٤٨.

[16]-د.كمال مظهر احمد، حقائق جديدة عن معاهدة سايكس-بيكو في ضوء الوثائق الروسية، مجلة افاق عربية، عدد(٢)، بغداد، تشرين الاول، ١٩٧٧، ص٣٩.

١٧-واتە كوردستانا باشور بكەڤيتە لـژێر كونترولا بريتانيا وفرەنساڤە" لێ بكەڤيتە دناف سنورێن دەست هەلاتداريەكا عەرەبی دا، بو پتر پێزانين ل سەر ڤی بابەتی، بنێرو: د.سعد بشير اسكندر، من التخطيط الى التجزئة سياسة بريطانيا العظمى تجاه مستقبل كردستان ١٩١٥-١٩٢٣، السليمانية، ٢٠٠٧، ص٦٥-٦٦. ژبو چارەنڤيسێ عەرەبا دپەيمانا سايكس-پيكو-سازانوف دا و وان وەعدێن داينە حسێن مەكماهون، بنێرە: كارل بروكلمان، تاريخ الشعوب الاسلامية، ترجمة: نبيه امين فارس ومنير البعلبكي، بيروت، ٢٠٠٠، ص٦٠١ ومابعدها.

١٨-بنێرە پەرتوكا وی، تاريخ ....، ص١٨٢-١٨٣.

[19]-د.كمال مظهر احمد، حقائق ....، ص٤٠.

٢٠-ئەحمەد سەيید عەلی بەرزنجی، سايكس-پيكۆ وترازاندنی جەمسەری كێشەی كوردی باشوور، سليمانی، ٢٠٠٧، ل٣١.

[21]-ژبو شلوڤە كرن ل سەر جهێ كوردستانێ يێ جيوپوليتكی دمێژويا نوێدا، بنێرە: هوگر طاهر توفيق، قومية بلا عنوان أو اسباب عدم تأسيس دولة كوردية ١٨٨٠-١٩٢٥، اربيل، ٢٠٠٦، ص٥١-٦١.

[22]-بنێرە پەرتوكا وی: تاريخ الاكراد الحديث، ترجمة: راج ال محمد، بيروت، ٢٠٠٧، ص١٩٦.

[23]-د.كمال مظهر احمد، حقائق ....، ص٤٠.

# کەریم خانی زەند

شوان یوسف حسـن

## پێش گوفتار

مێژووی وولآتی پان و بەرینی ئێران هەر لەدوای شەڕی چالدێرانی ١٥١٤ز و دابەشبوونی کوردستان بەسەر هەردوو ئیمپراتۆری سەفەوی و عوسمانی، کاردانەویەکی خراپی هەبوو لەسەر کوردستان و هۆزو میرنیشینەکوردیەکان بەگشتی بە نەمانی سەفەوی و هاتنی نادر شای ئەفشار، ئەو بارو دۆخە شپرزەیە زیاتر هەڵدەچوو، تا ئەو کاتەی بۆ یەك جار ئێران دەکەوێتە نەتەوەیەکی جیاواز لەتورك کە ئەویش زەندەکانن،شایانی باسە کوردیش لەم نێوانەدا بێ بەش نەبوو لەو هەموو بارودۆخە نا سەقامگیریە،وە بێ گومان کەوا گەلی کور هەر لە کۆنەوە چەندین کەلە پیاوی لێهاتوو ئازاو دەسەلآتداری بەتواناى تێدا هەڵکەوتووە، کەوا کەوا ڕۆلێکی باشیان بینیوە لە دروست کردنی چەندین دەسەلآتی کوردی وە لەو ڕێگەیشەوە ڕۆڵیان بینیوە لە برەودان و وەدەرخستنی شارستانیەت و نیشاندانی مەردایەتی گەلـــی کورد، جا ئێمە ئەتوانین بڵێین یەکێك لەو دەسەلآتدارە ناودارو لێهاتووانە کەریم خانی زەند بوو،هەرچەندە بەنەتەوە کورد بوون بەلآ نوێنەرایەتی دەسەلآتی ناوەندی ئێرانیان کرد، لێهاتوویی کەریم خان فاکتەرێکی سەرەکی بوو بۆ هاتنە سەر دەسەلآتی، دوای چەندین کوشت و کوشتاری هێزەکانی ئەفغان و نادر کەریم خان دەتوانێ فەرمانڕەوایەتی ئێران

بخاتە ئەستۆی خۆی و حکوومەتێکی کوردی دابمەزرێنێ و تاکە کەس بوو لەمێژووی وڵاتی ئێران کە ناوی لەخۆی نەنا(شا) ناوی لەخۆ ناجێگر.

زەندەکان نزیکەی نیو سەدە بەوپەڕی بەهێزیەوە فەرمانڕەوایەتی وولآتی پان و بەرینی ئێران دەکەن و،بەبێ جیاوازی نەتەوەیی و مەزهەبی و هیتر، کۆمەڵێك ڕووداوی لەڕ هەڵگرتبوو لەماوەی دەسەلآتیدا، شارستانیەت لەو پەڕی پێشکەوتندا بوو ئارامی و ئاسایش بەو وولآتە شڵەژاوە دەبەخشێ کە چەندین ساڵ بوو خەڵکی لەدەست داگیرکەران و شایەکانی ئێران دەیان ناڵاند خۆشیان نەدیبوو،هەتا لەکۆتایدا سەرکردەی کورد کەریم خان لەبەر تەمەنی کورتی نەی توانی درێژە بەو فەرمانڕەوایەتیە ڕەوایە بدات و تاکو بەهاتنی قاجارەکان فەرمانڕەوایەتی زەندیەکان لە ئێران کۆتایی پێدێت.لەو لێکۆڵینەوەیەدا هەوڵ دراوە بە شێوەیەکی گشتی ڕووداوەگرنگەکانی کوردستانی ڕۆژهەڵات لەسەردەمی فەرمانڕەوایی زەندیەکان لە ڕووی مێژوویی و سیاسی و و ئابووری و شارستانیەت بخرێتە بەر باس و لێکۆڵینەوە.

توێژینەوەکە لە پێشەکیەك و دەروازەیەك و چوار تەوەرە پێك هاتووە دواتریش بەئەنجامی باسەکە و چەند وێنەو نەخشەیەك کۆتایی پێ دێت.لە دەروازەکە بارودۆخی ئێران لەنیوەی یەکەمی سەدەی هەژدە لەدوای شەڕی چاڵدێران تا مردنی نادر شای ئەفشار دەخرێتە بەر باس و لێکۆڵینەوە.تەوەرەی یەکەم کە لە دوو لق پێك دێت هۆزو تایفەی زەندو ژیاننامەی کەریم خانی زەند خراوەتە بەرباس.تەوەرەی دووەم کە لە دوو لق پێك دەرکەوتنی کەریم خانی زەند لەسەر شانۆی سیاسی ئێران و سنوورو ڕووبەری فەرمانڕەوایی کەریم خان دەخرێتە بەر لێکۆڵینەوە.تەوەرەی سێ یەم لە چوار لق پێك دێت ئەویش لە

لایەنی شارستانیەتی حکوومەتی زەندم کۆڵیوەتەوە کە باس لە لایەنی ئابووری کشتوکاڵ و بازرگانی و ئاوەدانکردنەوەو دادوەری کراوە.

تەوەرەی چوارەم کە لە دوو لق پێك هاتووە سیاسەتی کەریم خان و لاوازبوون و هەرەسهێنانی فەرمانڕەوایەتیەکەی کەریم خانی زەند لە ئێران باسکراوە،کە هەڵوێستی کەریم خانی زەند بەرامبەر بەمیرنیشینەکوردیەکان خراوەتە بەرباس و لێکۆڵینەوە.

وە بەسود وەرگرتن لە چەندین جۆرە سەرچاوە لەزمانەکانی جیا جیا و تەنانەت سود وەرگرتن لە ژمارەیەکی بەرچاو سەفەرنامە و گەڕیدە ئەورپییەکان بۆ نموونە وەك: "کارستن نیپور"ی ئەڵمانی بەزمانی فارسی کە سوودێکی زۆرم لێ بینیوە چونکە لەسەردەمی کەریم خان لە ئێران ژیاوە سەرچاوەیەکی دەگمەنە. و " ویلیەم فرانکلین"ی ئینگلیزی و " ریچ" و "مێجەرسۆن" بەزمانی کوردی کۆمەڵێ کتێبی گرنگی مێژوویی ئەو سەردەمە وەك (قەڵای پەری) ئارشاك سافراستیان بۆ ئەوەی بابەتەکەی پێوە دەوڵەمەند بکرێت.

بەکارهێنانی نامەی ماستەری وەك (نیعمەت شهاب) لەژێر ناوی(کوردستانی رۆژهەلاَت لەسەردەمی فەرمانڕەوایی زەندیەکان١٧٥١-١٧٩٤ ) بەزمانی کوردی، وەچەندین سەرچاوەی گرنگ وەك :جان.ر.پێری.لەژێر ناوی "کەریم خانی زەند مێژووی ئێران لەنێوان ١٧٤٧-١٧٧٩"بە زمانی کوردی و کتێبی نایابی وەك : محمد ئەمین زەکی "خولاسەیەکی تاریخی کوردو کوردستان)و صالح قەفتان " مێژووی گەلی کورد لەکۆنەوە تاکو ئەمرۆ" چەندین گۆڤاری کوردی کە سودێکی زۆرم لێ بینیون، هەروەها ژمارەیەکی بەرچاو لە کتێبی عەرەبی بەکار هاتوون بۆ دەوڵەمەند کردنی لێکۆڵینەوەکە بەکار هاتوون، وەهەروەها بەسود وەرگرتن لە تۆڕی ئینتەر نێت بۆ ناسینی کەسایەتیەکان و لەوکاتانەی کە زۆر پێویست بوون

و وەرگرتنی هەندێك وێنەو بەڵگەنامە کە لێکۆڵینەوەکەی پێ دەوڵەمەند بوون.هەرچەندە کەم و کوڕی و نەبوونی سەرچاوەی ڕەسەنی ئەو سەردەمە بەڵام تارادەیەك توانیومانە کۆمەڵێك وێنەو بەڵگەنامە بخەینە نێو لێکۆڵینەوەکە.

بێ گومان ئەو جۆرە نووسینە هەڵبژێردراوانە ئەگەر بێت و شێوازێکی زانستی و ئەکادیمیانە بێ هەرگیز بێ کەم و کوڕی و گرفت نابێ، و لە کۆتایدا هیوادارم توانیبێتم کەمێك لە بوارەکانی ژیانی کەریم خان و بارودۆخی ئێران بە لە نیوەی یەکەمی سەدەی هەژدەهەم و لایەنە شارستانیەتەکانم بە تێگەیشتنێکی ڕەوا خستبێتە ڕوو، بۆ ئەوەی تاکـــی کورد لە هەر شوێنێك بێت شارەزاییەکیان هەبێت دەربارەی ئەو سەرکردە کوردە کە فەرمانڕەوایەتی وڵاتی پان و بەرینی ئێرانی لە کرد بو جوانترین شێوازی فەرمانڕەوایی کە بەماوەی سەردەمی نوێ ی ئێران نێوی چۆتە لاپەڕەکانی مێژووی ئێران.

## دەروازە

### بارودۆخی ئێران لە نیوەی یەكەمی سەدەی هەژدەهەم

سەرەتا گەر بێتوو بڕوانینە مێژووی وولآتی پان و بەرینی ئێران لەدوای جەنگی (چاڵدێران)[1] و شكستی شا ئیسماعیلی سەفەوی،دەبینینین سنووری ئەو ناوچە فراوانە بۆتە مەیدانی ململانێ و شەڕوكوشتار لە پێناو وەرگرتنی تاج وتەختی پاشایەتی لەو وولآتە و داگیركردنی خێرو بێری وولآتەكە،.گەرچی شایەكان لەپێناو دەركردنی بێگانە دەجەنگان بەلآم دیارە كە هیچ هێمنی و ئارامیان بەگەلی ئێران نەبەخشیوە جگە لەكوشت وكوشتارو تالانو برۆ لەپێناو مانەوەی دەسەلآت و تاج وتەختی پاشایەتیان. بەپێ ی ئاماژەكردنی سەرچاوە گرنگە مێژووییەكانی ئێرانی و بیانی مێژووی ئێران و بارودۆخی ئێران لە دوای ڕووخانی ئیمپراتووری سەفەوی(١٥٠١–١٧٢٢ز)،مێژوونووسان بە یەكێك لە تاڵترین و ناوازە ترین ڕووداوی مێژووی ئەم وولآتە لەقەلەم دەدەن،لاوازی دەسەلآتی شایە لاوازەكانی سەفەوی لەلایەك و نەبوونی كەسانی زاناو شارەزاو حەكیم لەلایەكی تر بوونە هۆی ئەوەی فەرمانرەوایەتی پان و بەرینی ئێرانی سەردەمی سەفەوی لەئەنجامی هێرشێكی كت و پڕی یەكێك لە هۆزە هەلگەڕاوی ئەفغانی بۆهەتا هەتا تووشی داڕووخان دەبێت، وە دواتر بە بەدیاركەوتنی میر (ممحمود)كوڕی وەیسی دوای شەڕی(گوڵناباد)لە٢ی ئۆكتۆبەری١٧٢٢ز بەدەست ئەفغانە هێرش كەرەكان و داگیركردنی ئیسفەهانی پایتەختی ئەوكاتەی ئێران و دەسەلآتی سەفەوی لەناو دەچێت و تێكەل بەمێژوو دەبێت،میر محموود زۆر وورد بین بوو لەسیاسەتدا دوای داگیركردنی ئیسفەهان بوە خاوەنی شەرعی فەرمانرەوایەتی ولآت وپاڵپشت بە هێزێكی زۆر زەبەلاح سیاسەتێكی مام ناوەندی گرتەبەر[2]. زۆری پێ نەچوو وەلآتەدراوسێكان لەسەرووپانەوە ڕووسیاو عوسمانی هەلی زێرین وەرئەگرن بۆ

هاتنە ناو سنوورەکانی ئێران،ئەتوانین بڵێین سەدەی هەژدەهەم بارودۆخێکی ناهەموار بوو.شەڕی درێژخایەنی عوسمانی و سەفەوی کارێکی زۆری کردبووە سەر ناسەقامگیری وولآت،بەشێوەیەکی گشتی ئێران لەماوەی حەفتساڵ ونیوەی فەرمانڕەوایەتی ئەفغانەکان (١٧٢٢–١٧٢٩)ز لەوپەڕی خراپی دابوو کاریگەری شەڕوکوشتار بوە هۆی ئەوەی کەگۆشتی مردووەکانیان بخۆن[٣]. گومانی تێدا نیە بەهۆی نەبوونی هێمنی لەوولآت وا لەدەولەتانی دەرەوە دەکات تەداخوول بکەن و دەست بخەنە ناو کاروو باری سیاسی وولآت،بۆنموونە هەر لەنێوان ئەم ساڵانەدا ئەفغانەکان نەیانتوانی حوکمڕانی تەواوی ئێران بکەن،دواترهێزێکی دی هاتەگۆڕێ شاتهماسبی دووەمی میراتگری بێ تاج وتەخت پەیمانیکی سیاسی لەبەهاری١٧٢٣ز، لەگەڵ رووسیاو عوسمانی بەست، سەبارەت بە چۆنیەتی دابەشکردننی ناوچە سنوریەکانی (گەیلان،مازەندەران،گورجستان،ئەرمەنستان،شیروان،ئازەربایجان،کوردستان قەزوێن،ئەردەوێل) یان دابەشی یەکترکرد،بەئاسانی لەناوخۆیان پێك دەهاتن ودانیان بەکردەوەکانی یەکتر دادەنا[٤]. ئەو کاوڵکاریەی ئەفغانەکان هەموو کشوەری ئێرانی گرتەوە بەشێوەیەکی وەهابووکە خەڵکی بێزاربون لە ولآت و خاکی خۆی [٥].

لەو دەسەلآتە تازەو داواکاری تەختی پاشایەتی سەفەوی کە خۆی دیتەوە لە (تەهماسبی دووەم)[٦] وێڕای هەبوونی هەندێ هێزی ناوخۆیی تر لێرەدا دەتوانین بلێین ئەو بارودۆخە و نەخشەی سیاسی ئێران لەو ماوەیەدا پێکدەهێنێ کە لەلای مێژوونووسان بە (ماوەی داگیر کاری ئەفغانی ١٧٢٢–١٧٢٩) ناسراوە، بەوە ولآتی ئێرانی دابەشی دوو ناوەندی سیاسی جودا بوو : ئەویش سەفەوی و ئەفغانی بوو. لەدەسەلاتداردنی ئێران بۆیە لەئەنجامدا (شاتەهماسبی دووەم)یان

لەدەسەلات هێناخواروە کە(شای عباسی سێیەم)لە(١٧٣٢- ١٧٣٧)کرایە شای ئێران.

دوای ئەم هەموو بارو دۆخە نالەبارەی ئێران یەکێك لەتاقمی دەسەلاَت پەرستانی ئێران وخوازیارانی فەرمانڕەوایەتی سەفەوی بەدەردەکەوێت ئەویش (نادر)ی ئەفشار بوو کەیەکێك بوو لەسەرکردە هەرە بەتواناکانی سەردەمی ئەفغانیەکان،داگیرکردنی فەرمانڕەوایەتی لەلایەن نادر و تێکۆشان و هەوڵی پاشای ئەفشار بۆ لادانی مەزهەبی شیعە و دانانی چەشنێك مەزهەبی سوونی لەجێ ی،ئەمە کە بوو بووە یەکێك لەتوخمەکانی نەتەوەیی و کۆنباوی حوکمەتی سەفەوی،دژایەتی نواندنی بیروڕای گشتی و بێ باوەڕی حکوومەتی عوسمانی نادر بەرەو ڕووی تێکشکان بۆوە،سەرکەوتنی پەلامارەکانی نادرشا بێ گومان سیستەمێکی ئیمپراتوریەتی بەرەو گەشەی ئاسایی لە چەشنی دەسەلاَتی تەیموورلەنگ،بەمردنی نەزۆك مایەوە [٧]. بنەماڵەی نادر لەسەردەمی شا عەبباسی سەفەویدا باریانکرد چوونە خاکی خوراسان و لەناوچەی (ئەبیوەرد) دامەزران،نادر لەساڵاَلی ١١١٠ ش، لەقەلاَی دەشتگورد و دەرەگەز لەدایك بووە بەناوی باپیریەوە ناونرا(نادر)، وردە وردە گەورەیی و سەرداری و فەرمانرەوایی لێ دەبینرا جوولەو هەلسوکەوتی نادر وەك مرۆڤێکی ئاسایی نەبوو زاڵ بوو بەسەر گەلێك لەو خێلی ئەوخاکە،لەشەڕکردندا بەناو بانگ بوو زوو زوو بانگهێشتی کۆمەکیان لێ دەکرد بۆ شەڕ،دواتر وەردە وردە هێز وجەماوەر پەیدا دەکات و ناودار دەبێت دە بێتە خاوەن هێز [٨]. سەبارەت بە ساڵی لە دایك بوونی نادری ئەفشاری رەزا زادە شفق دەڵێ : لەبەرواری ٢٨ی محرم ی ١١٠٠هیجری لەدایك بووە وە لە ٢٤ شوال ١١٤٨ واتەلە چل ساڵی تاجی پاشایەتی لەسەر نا وە لە ١١٦٠ هـ دەکوژێ [٩]. دیارە دەسەلاتی ئەفغانەکان بەسەر

ئیسفەهاندا کەم خایەن بوو بەڵام لەهەمان کاتیشدا خوێناوی بوو لەڕاستیدا هەندێ لە کوردەکان لایەنگیری ئەفغانەکانیان دەکرد لە هەندێ شەڕدا،وەك سەرکەوتن لەشەڕی (اندیجان) بەسەر تورکەکان لە١٧٢٦ دا ڕوویدا داوێڕای ئەم سەرکەوتنانەش لەساڵی پاشتردا لە ١٧٢٧ئەفغان بۆ ئەوەی دەسەلاتی خۆی بپارێزێ و مانەوەی درێژخایەن بێ ناچاربوو هەموو ناوچەکانی ڕۆژاوای ئێران بە کوردستان و لوورستانەوە تەسلیم بە تورکەکان بکات [١٠].

لە لاپەڕەکانی پێشوو ئاماژەمان بە دەرکەوتنی نادر کرد کە ڕۆلێکی گرنگی بینی لە دەرکردنی داگیرکەران، دوای ئەوەی کەزانیمان نادر خەڵکی زۆری لە خۆ کۆکردبووە وە ئەو یەکێك لە شاخەکانی خۆراسانی هەڵبژاردبوو و کردبوویە پەناگەی خۆی، لەوێشەوە دەستی کرد بە فراوان کردنی دەسەلاتی خۆی لەو ناوچانەدا، نادر بەتوندی دژی ئەفغانیەکان دەوەستا وە ڕۆلێکی گرنگی بینی لە دەرکردنی ئەفغانەکان و بەدەست هێنانەوەی ئەو ناوچانەی کە ئەفغانەکان و ڕووسەکان و عوسمانیەکان کەداگیریان کردبوو، نادر بە شەڕانگێزی و فراوانخوازی ناوبانگی دەرکردبوو، فراوانخوازیەکانی نادر هەتا عیراق و ناوچە کوردیەکان وەك کەرکوك و ناوچەکانی دەورووبەری بوو، ویستی بەرەو بەغداش بڕوات بەڵام لەبەر بوونی ڕاپەڕین دژی دەسەلاتی ناوەندی گەڕایەوە ئێران. بێ گوومان ئەو فراوانخوازیانەی نادر دەیکرد ببوە بارگرانی بۆ سەر ژیانی خەڵکی ئێران، چونکە بەڕێوەبردنی ئەو هێرشانەی کە نادر ئەنجامی دەدا لەسەر شانی ئەو خەڵکە بوو [١١]. بەگشتی نادری ئەفشاری لە ١٧٣٧ ز کوشتارێکی زۆری لە کوردی بەختیاری و فەیلی کرد چەندەها مال و عەشایری نارده خوراسان،دوای ئەوە(کەریم خانی زەند) چووە ناو لەشکری نادر ئەوی رقی لەنادر بوایە رەوانەی خوراسانی دەکردن جگە لە کوشت و کوشتار، بەگشتی نادر لەکاتی هێرشەکانی

بۆ عێراق ئەو کوردانەی نەهاتبانە ڕیزی ئەو ڕقەبەرایەتی نادریان بکردبا ئەوا دەی ناردنە خوراسان و یان دەیان کوشتن وەك کوردەکانی (چەمشکەزەك، لوورستان و بەختیاری و موکریان و شارەزوورو تالش و (زەنگەنە) بەلآم تالشیەکان چوونە ڕیزی نادر، نادر کە لە سەر تەختی پاشایەتی دانشت دۆستایەتی نواند کە حکوومەتی ئێران و عوسمانی کە هەردوولا حکوومەتی ئیسلامن بەلآم چەند بەندێکی دانا: یەك لەو بەندانە ئەوە بوو کە مەزهەبی جەعفەری بەمەزهەبی پێنجەم بناسرێ و هەردوو حکوومەت دیلەکان بەبێ فرۆشتن بەر بدەن [12]. بێ گوومان ئەفغانیەکانیش وەك ئەفشاریەکان دەستێکی زۆریان هەبووە لەو ململانێ و شەڕانەی کەلەخاکی ئێراندا کراوە لەسەر کورسی دەسەلاتدا، شەڕوو کوشتارو خوێن ڕشتن بەرنامەی دارێژراویان بوو، هەموو جۆرە سیاسەتێکیان بەکار ئەهێنا لە پێناو مانەوە یاخوود درێژ بوونەوەی دەسەلآتیان، کەواتە دەتوانم بلێم پێش ئەوەی کەریم زەند بێتە سەر دەسەلات ناوچەکە لە ژێر ململانێ و کاریگەری ئەفشاری و ئەفغانیەکان دا بوو، وە دەسەلآتی ئەوسای وە بوونی دەوڵەتی عوسمانی وە پەل هاوێشتنی بۆ ئێران لەولاوە یەکێك بووە لە هۆکارەکانی نەبوونی ئارامی و ئاسایشی ناوچەکە [13]. بێگومان ناوچە کوردیەکان لەو ماویەدا ناوچەی ململانێ بون لە نێوان هێزە داگیر کەرەکان،خاکی ئێران و هەروەها دەسەلآتی تەهماسب و داگیرکاری ئەفغانەکان وە تاکی کورد و هێزی کوردیش لەو ماوەیەدا ڕۆڵی بەرچاوی هەبوو لە ئاراستەکردنی ڕووداوەکان چونکە ئەفغانەکان و عوسمانیەکان و تەهماسبیش کوردیان بەکاردەهێنا بەڕاددەیەك ژمارەیەکی بەرچاو لە کورد لەهێزەکانیاندا بوونی هەبوو [14].

دەرکەوت کە وەدەرکەوتنی کەسایەتیەکی وەك نادر شتێکی باش بوو لەم کاتەدا چونکە ئێران پێویستی بە ڕزگارکەرێك هەبوو، هەرچەندە نادر کە

کەسایەتیەکی دڵ ڕەق و بێ بەزەیی بوو بەڵام لەهەمان کاتیشا ترسێکی زۆری بە زۆربەی وولاتانی دەورووبەر گەیاند. سەرەڕای ڕزگارکردنی وەڵاتی ئێران لەدەست بێگانەکان، بەلام نادر هیچ کاتێ نەی توانی هێمنی و ئارامی بۆ خەڵکی ئێران مسۆگەر بکات، ئەگەرچی نادر شا بەدرێژایی ماوەی خۆیدا (١٧٣٦-١٧٤٧ ز) توانی حکومەتێکی نوێ لە ژێر ناوی دەسەلآتداریەتی ئەفشاریەکان دابمەزرێنێ و هەوڵ بدا بۆ جێگیر کردن و سەپاندنی دەسەلآت بەسەر هەڵگەڕاوانی ناوخۆیی، بەڵام بە پێ ی ئاماژە پێکردنی زۆربەی لێکۆڵەرە مێژوویی یە ئێرانی و بیانیەکان، بەشێوەیەکی گشتی ئەم سەردەمە نالەبارە بریتی بوو لە شەڕوو کوشتن و تالانو برۆیی و ترس و خراپی بەردەوام ئەوە لەئەنجامی سیاسەت سەربازیەکانی نادر شاە بەسەر خەلکی بێ تاوانی ئێراندا سەپێنرابوو، دوای تاپۆکردنی تاج و تەختی پاشایەتی نادر بۆ پڕکردنەوەی خەزێنەی دەولەت نادر شا قەرار دەدات هێرش بکاتە سەر هیندوستان و فراوانخوازی لە دەرەوەی ئێران و ناوچەکانی هەرێمە کوردستان و و ناوچەی جزیرە،وە لەسالی ١٧٣٩ توانی لە شەری بەناوبانگی (کرنال) دەست بەسەر (دەهلی)ی پایتەختی ئەوکاتەی ئێران دابگرێت، وە بەردەوام بەزۆر ڕاکێشانی کوردانی ئێران و هۆزەکان بۆ ناو سوپاکەی بەمەش هۆزەکان ناڕازی دەبوون و بێزار دەبوون لە دەسەلآت، هەروەها بەردەوام شۆڕش و خۆپیشاندان لە ئێران لەلایەن جەماوەر دژی دەسەڵاتی ناوەندی سەریهەڵدەدا،بەگشتی گرینگیدانی نادر بە بواری سەربازی و کاروباری لەشکری و لەلایەك شەڕو هێرشە یەك لەدوای یەکەکانی بۆ سەر هەلگەڕاوانی ناوەخۆ و داگیرکەرانی بیانی ببونە هۆی درووست بوونی لەشکرێکی بەهێزوو دڕندانە.هەربۆیە دوای ڕاوەدوونانی سوپای دەوڵەتانی ڕووسیا و عوسمانی تاکو کوژرانی نادر شا هیچ یەك لەو دوو دەوڵەتە غیرەت و

جورئـــەتی دەســـتدرێژی کردنـــە ســـەر ســـنووری ئێرانیـــان نـــەبوو، ئەگەرچـــی پەیوەندیـــەکانی نادرشـــاو وەلاتـــی عوسمـــانی چـــەندین پەیماننانـــەی ئاشـــتی لەنێوانیانـــدا هـــەبوو بـــەلاّم شـــەڕوو شـــۆڕی نێـــوان لەشـــکری عوسمـــانی و ئێـــران لەناوچەکانی باکوورو باکووری رۆژاوادا تا سەرەتای ئەیلوولی١٧٤٦هەر بـــەردەوام بوو[١٥]. نادر لەگەڵ عوسمانیەکان،لەکاتی هێرشی نادر بۆ سەر بەغدا و کوژرانی سەرکردەیەکی عوسمانی لەم هەڵمەتە و دوای شەڕێکی درێژ خایەن لەگەڵ نادر عوسمانیەکان ناچار دەبن لە ١٧٣٩ ز دان بە پاشایەتی نادر بنێن و لەگەڵی پێك بـێن لێـرەدا هەوڵـــەدەن بـــۆ بەدەســـت هێنـــانی مەرامـــەکانیان، دواتـــر پـــەیمانی(کـوردان)[١٦] یـان بەسـت لـەنێوان نادرشـاو دەوڵـەتی عوسمـانی زیـاتر پەیماننامەکە لایەنی مەزهەبی بوو[١٧]، هەر لەم ساڵەدا لـەنێوان هـەردوولادا دوای ئەو هەموو ئەو شەڕو کوشتارو وێرانکارییە، گەیشتنە ئـەو رایە کـە سـنوورەکان جارێکی تر بگەڕێنەوە بۆ پەیمانی (زەهـــاو)[١٨][١٩].بەلاّم زۆری پـێ نەچوو دوای گەڕانەوەیەکی نادر بۆ مەشەد و دامرکانەوەی راپـەڕیوان ڕووبـەڕووی جولانـەوەی ئەوسای(خەبووشان)(قووچان)،بەلام بەپیلانێکی سەرکردەیەکی سوپاکەی خـۆی لـەحوزیرانی سـاڵی١٧٤٧لەخێمەکـەی دەکوژرێـت و هـەر ڕۆژێـك دوای کـوژرانی نادرشای ئەفشار سوپاکەشی تێك دەشکێنرێت [٢٠].

هەر بۆیە لەدوای نەمانی نادر شای ئەفشار یەکێ لە دیارترین ئەو سەرکردەیەی کە دەسەلاّتی لەخاکی ئێران دا گرتە دەست ئەحمەد خانی ئەبداڵی بوو، ئۆردوگاکانی نادر شا دەرووخێنێت لە ئۆکتۆبەری ١٧٤٧ ز پاشای ئەفغانستان تاج و تەختی پاشایەتی وەلاّتی پان و بەرینی ئێرانی لەسەر نا بناغەی فەرمانڕەوایەتی دەورانی و ئەفغانستانی تازەی ڕۆنا [٢١].دوای کوژرانی نادر شا لە ساڵی ١٧٤٧ز ەوە ئیدی سنووری (عوسمانی –فارسی)هێندە شەڕو

جەنگی خوێناوی بەخۆیەوە نەبینی، ئەگەر بێت و سەیری بارو دۆخی ئەوکاتی کوردەکان بکەین جیاواز بوو لە بارو دۆخی ئێران دوای نادر، کوردەکان هەم دیسا غەدرو کوشتاریان لیّ دەکرێت. بۆ نموونە کوردستان لەناوەخۆیدا لەناو جەنگێکی براکوژی گەورەدا دەژیا، کوردستان وەك و یاریەك بوو بە دەست میر و بەگە کوردەکان. دوای مەرگی نادر شا ململانیّ ی ناوەخۆیی دەسەلاتدارانی فارس لەسەر کورسی حوکمڕانی باشترین دەرفەتی بۆ والی بەغدا هێنایە پێشەوەو، والی بۆ لێدانی بابانەکان و سەرکوت کردنیان و بەکەیفی خۆیان یاریان بەمیرنیشینە کوردەکان دەکرد، والی کوشتارێکی زۆری ئێزیدیەکانی کرد ئەوجارە لەگەلّ دەسەلات بەدەست گرتنی کەریم خانی زەند ئیمپراتۆریای فارس گۆڕو تینی پێکدا دایەوە و لە ١٧٧٣ز پەیوەندیەکانی عوســـمانی و فارسی توندو تیژ تر بـــوون [٢٢].

بیّ گومان دوای نەمانی نادرشا ئەم جارە یاریەکە دەست پیّ دەکات لەسەر جێنیشینایەتی و تەختی پاشایەتی ئێران، بەمەش گەندەلّی و بیّ سەرو بەری لابالّی بەسەر وەلاتدا کێشا. میراتگرانی نادر تەنها خۆراسانیان بەرکەوت و مەشهەدیشیان کردە پایەتەختی خۆیان ئەفغانەکانیش توانیان سەربەخۆیی خۆیان دابین بکەن و وە سەرکردەکانی هۆزی بەختیاری و زەند هەولّیاندا کەوا دەسەلاّتی ئێرانی لە خواروو و خۆرئاوا درووست بکەنەوە، بۆیە دوای نادر لە وەلاّتدا هەر نەتەوەیەك گەرەکی بوو دەولەتێك درووست بکات، دواتر درووست بوونی دەولەتێك بە بەناوی دەولّەتی زەنـــد بەسەرۆکایەتی کەریم خانی زەند توانیان ئەسفەهان و مازەندەران لەژێر دەستی قەوقاز تورکەکانی سەر بەڕووسیا بهێننە دەرەوە بەمەش یەك ڕیزی خۆراوای ئێرانی سازکردەوە کەلە کەنارەکانی

دەریای قەزوێنەوە بەرە ناوچەکانی کەنداوی عەرەبی هەڵدەکشا و شیرازی کردە پایەختی خۆی [٢٣].

دوای نادرشا کە فەرمانڕەوایە خۆجێ یەکانی خاکی ئێران دووبارە دەستیان کردەوە بە تەقەلای سەربەخۆیی بۆ پێکهێنانی حکومەت بەناوی خانەی خۆیانەوەوە[٢٤]. لەناو ئەمانەدا سەردارانی کورد لەناو هەموویان زیاتر هەوڵ و تەقەلایان داوە بۆ ئەم مەبەستە،جا یەکێك لە کەسایەتیە ناودارەکانی پیاوانی ئەوکات دەرئەکەوێ ئەویش (کەریم خان) ی زەند بوو متمانەی بەخۆ هەبوو حکومەتێکی کوردی پێکبهێنێت [٢٥].کەریم خان لەو کات و ساتەدا تا ڕادەیەك شارەزایی هەبوو لە شێوازی حوکم کردن و زانیاری تەوتوی ئێران چونکە کەسایەتیەکی لێهاتوو بوو هەردەم لە لەشکردە کانی نادر بەژداری شەڕی کردبوو خاوەن هێز و سوارەی خۆی بوو، ناوبانگی تەواوی هەبوو لەسەردەمی نادری ئەفشـــاری.

تەوەرەی دووەم

- هۆزو تایفەی زەندو ژیاننامەی کەریم خانی زەند

أ/ هـــــۆز و تایفەی زەند

بەگشتی سەبارەت بە تایفەی زەند زۆربەی هەرە زۆری ئەو مێژوونووسانەی لەبارەی مێژووی زەندی لێکۆڵینەوەیان کردووە ڕێك کەوتن کە ئەو هۆزە کۆمەڵێك تاقمی خۆ بژێوی مەڕدار بوون کە لە مەزار و لەوەڕگاکانی داوێنی زاگرۆسەوە هاتبوونە گوندەکانی پەری و کومازان لەنزیـــك مەلایەر،زەند هۆزێکی کوردی ڕۆژهەلاتی کوردســـتانە، لە (١٧٥١ز –١٧٩٤ن) حوکمی رۆژئاوای ئێرانیان کردووە،وە لەبنەماڵەی لەکن "نادرشا" لەسالی ١٧٣٢ز دا ئەوانی لە

زێدی باوو باپیرانیان لەچەقی کێوەکانی زاگرۆسەوە بۆخۆراسان راگوێزاوە، بەڵام پاشان کە نادر شا دەکوژرێ ئەو زەندانە بەسەرکردایەتی "کەریم خانی زەند " بەشەڕو لێهاتویی خۆیان دەتوانن ڕێگای خۆیان پاك بکەنەه بۆزێدی خۆیان بگەڕێنە،کە دواتر بە ووردی باسی لێوە ئەکەین کە ئێستاش لە زۆر لە ناوچە کوردیەکان زەندی و لەکی هەن و شۆرەتیان زەندی یە.

سەبارەت بە هۆزی زەند مێژوونوسان باس ئەکەن کە (زەند) هۆزێکی لەمێژینەی کوردە مێژوویەکی کۆنی هەیە لە ئێران، بەسەرداری کەریم خانی زەند بوونە دەسەلآتداری هەموو ئێران حوکمەتێکیان دامەزراند بەناوی حکوومەتی زەند لەئێران. وە فەرمانڕەوای بەناوبانگیان (کەریم خان) و (لوتف علی خانی زەند) (صادق خانی زەند )بوو [٢٦].

لەماوەی نێوان (١٧٥٢-١٧٩٥)دا بنەماڵەیەکی پاشایەتی گەورەی کورد بەسەرۆکایەتی کەریم خانی زەند لەئێران لەئێراندا درووست بووە [٢٧].

وەهەروەها هۆزی زەند بریتیە لە پێنج تیرە (تایەر، خان، محمد، صالح ئاغا، غەنی، عەلیان) کەریم خان فەرمان ڕەوای ئێران لە تیرەی (عەلیان) ە، وە بەشێکن لە لەك و هۆزی لووری گەورە [٢٨].

وە لەڕووی مەزهەب و زمانەوە عەلی تەتەر دەڵێ: (هۆزی زەند هۆزێکی کوردی یە لەناوچەی نێوان کورد و لووڕدا ئەژین، لەڕووی مەزهەبەوە شیعەن وەك هەموو کوردانی باشووری ڕۆژهەلآتی کوردستان، لەڕووی زمانەوە بەشێوەیەکی کوردی قسە ئەکەن) [٢٩] . لە گەشتنانەی نیبور هاتووە دەڵێ : لەکاتی ڕۆیشتنم بە دەرەوەی شاردا کۆمەڵێك کوردم بینی گفتوگۆم لەگەڵ دەکردن و زمان و داب و نەریتی خۆیان جیاواز بوو وە پاراستبوویان و خەریکی

شوانکارەیی بوون بەلاّم کۆمەڵێك ووشەی عەرەبی و فارسیان تێکەڵ بزمانی خۆیان کردبوو و قسەیان پێ دەکرد[٣٠].

سەبارەت بەنیشتەجێ بوونیان زەند هۆزێکی کوردی ناسراون لەرۆژئاواو خوارووی ئێران نیشتەجێ بوون، دواتر کەریم خانی سەرکردەی ناسراوی زەندیەکان دەتوانی ئەو باروودۆخە نارێکە بقۆزێتەوە کە وولآتی تەنیبۆوە، ئیجا دەسەلآتی گرتە دەست بەسەر هەموو بەشەکانی ئێران [٣١].

زەندیەکان لەنێوان (هەمەدان و مەلایەرە) دا دەژیان لەناوچەیەکدا کەجاران (ئیغار) یان پێ گووتووە ئەژیان، ئەمانە لەزەمانی نادر شادا لە شاخەکانی زاگرۆسەوە بۆ خۆراسان راگوێزران، بەلاّم پاش مردنی نادرشا هەم دیسان گەرانەوە بۆ وەتەن و زێدی خۆیان [٣٢].صالّح قەفتان دەڵێ : (کەریم خان سەر بەهۆزی زەندە وە هۆزی زەندیش تیرەیەکە لەخێلی لەك کە ئێستا لە هەرێمی (پشتکۆ) دا دەژین)[٣٣]. (loورەکان)[٣٤] لەسالآنی (١٧٤٩-١٧٩٥) فەرمانرەوای گشت ئێران دەگرنە دەست وەك باسمان کرد کە زەندیش تیرەیەکی سەر بەهۆزی لەك بوون لە ئەسڵدا لەگوندێکی دەورووبەری (مەلایەر) شوانکار بوون، هۆزی زەند لەگەڵ هەندێ هۆزی تری لوور و بەختیاری بەفەرمانی نادر شای ئەفشاری بەرەو دەرگەزەی خۆراسان راگوێزران، بەلاّم نادرشای ئەفشاری کەڵکی لەهێزوو توانای ئەوان وەرگرت وە کردنیان بەسەرباز کەیەکێك لەو کەسایەتیە دیارانەی کران بەسەرباز کەریم خانی زەند بوو [٣٥].سەبارەت بە هۆزی لوور کەزێدو خاکیان لە ئیسفەهانەوە تا سنووری عەرەبستانی ئێران (خۆزستان و لە هەمەدان و جەمسەری خاکی عێراقی عەجەم دوە تا سنووری عێراقی عەرەب کێشراوە بەشێکیان بە تێپەربوونی زەمانە و سەردەم لە قەزوێن و شوێنی تر نیشتەجێ بوون [٣٦]. بەگشتی وا دەرکەوت کە ئەو کوردانە گشتی بە

شوانکاریەوە خەریك بوون دواتر بە هۆی کۆمەڵێك هۆکاری ژیانیان و ڕاگواستنی سیاسی یەوە پەرتەوازە بوون و بڵاو بوونەتەوە لەوناوچانەدا نیشتەجێ بوون،هەندێك کە بەفەرمانی نادر شاوە لابەلابوون و بوو بونە سەرباز لە کوشت و کوشتار بەکاردەهاتن لەلایەن سەرکردە بێ ڕەحمەکان و بێ بەزەیی یەکان، کەڵکیان لێ وەردەگرتن نادر پەیوەندیەکانی خۆی لەگەڵ کوردەکای بەختیاری و زەند و لور باش کردبوو ئەوە لەکاتی هەبوونی پەلامار دان وتەنگانەدا بۆ بەرژەوەندی خۆی کوردەکانیش ناچار دەچوونە بەر فەرمانی نادر،وە ئەبێ ئەو ڕاستیەش بزانین لە هەموو سەرەمە جیاجیاکانی مێژوو کوردەکان دڵ نەرم بوونە لەگەڵ بێگانە هەر بۆیە ئەو جۆرەش چاوەڕوانکراو بوو.

هۆزی زەند لەدوای هێرشی شاعەباسی سەفەوی (١٥٨٧–١٦٢٩) بۆسەر لوورستان ڕاگوێزرابوون بۆ دەوروبـــەری (مەلایر) دەرئەنجام پاش دەیەها ساڵ ئاوارەی هۆزی زەند لەناوچەی قەڵای (پەری) و (کمازان) نیشتەجێ بوون وە بۆ گەرمیان دەچوونە (پەڕو پەرێز). لەوکاتەدا (زەند کەلهووری،زنگەنە، مافی، باجەلان) بە لەکـــی کوردستان دەژماردران کەلەلایەن نووسەرانی ئێرانی و بیانی ئی وانیان بەکورد دادەنا [٣٧].

زۆر لەسەرچاوەکان ئاماژە بەوە ئەکەن کەوا لەك لە بنەڕەتدا (لوورە) بووینە، بەڵام وردە وردە لە دوایدا بوونەتــە کورد، هەروەها هۆزی لەك هەبوو زەندیش بەیەکێك لە لقەکانی ئەو هۆزە دادەنرێت بەناوی هۆزی (وەند) ناوداران. شێوازی لەکی هەمان شێوازی باشووری کوردستانە ئەمڕۆ هەموو هۆزی کوردی لەکی بە کورد دادەنرێن [٣٨].

کەریم خانی زەند ڕۆلێکی بەرچاووی بینی لە سەرهەڵدان و تەشەنەکردنی ئەم خێڵە وەك باسمان کرد یەکێك بوو لە پیاوە هەرە ناودارەکانی هۆزی زەند وەك ئاماژەمان بەوە کرد کە هۆزی زەند کە لقێك بوو لە هۆزی لەك، هۆزی لەکیش یەکێکە لەو هۆزە کوردانە کە هەمیشە کۆچەری بوون وە لەنێوان خانەقین و پشتکۆی و کرماشان وە گەیلان و قەسری شیرین و شیراز لە هان و جۆدا بوون(٣٩).پاش مردنی عەلی مەردان خان کە والی بوو لە سەردەمی نادر شا بە بڕیاری ئەو (بابا خانی چاپشلۆ) بەفرو فێل کە بووە سەرۆکی (لوور) وە ئەویش مەهدی خانی زەند و هاوڕێکانی بەدیل گرت (٤٠).

وادەرکەوت کە هۆزی زەند ولەك و لوور زۆر لێك نزیك بوونە بە نەتەوە هەمیشە خۆیان بە خاوەنی یەکتر زانیوە، وە بەداخەوە ئەم سەردەمە لەبەر بوونی فشاری سیاسی نادرشا چەندین جار بەزۆر خۆیان دەکردە سەرۆکی هۆزەکان وە باسمان کر کە بابا خانی چاپشلۆ بەزۆر بووە سەرۆکی لوور، خەڵکانی ئەو هۆزانە هەر بەزۆری دەهێنرانە نێو سوپا وێڕای سوکایەتی پێکردن و لەناو بردن و لا بەلاکرنی ماڵ و مناڵیان و پەرتەوازەکردنیان، ئەو جۆرە کردارە لەو سەردەمە باو لەبەر ئەوەی نەبوونی سەرکردەو یەك نەگرتن کارەساتی وای لێدەکەوێتەوە کوردەکانیش هەر یەەو بوو بووە لایەنگیری یەکێکی تر هەندێك لە ئێران و هەندێك لایەنگیری عوسمانی بوون و بێ گومان ئاکارەکامی کوردیش بشێوەیەکی باش نەبووە لەگەڵ ئەو دەوڵەتەی کە لە ژێر دەستی ئەوە هەمیشە کێشەی ناوخۆیی و تایفەییان هەبوو جا لە ئەنجامدا ئەنجامەکانی بەشێوەیە لێدێت کە لە سەرەوە ئاماژەمان پێکرد.

ڕەفتارەکانیان نامرۆڤانە بوو سەریان دەبڕین و سوکایەتیان پێ کردن و بەشێوەیەکی نامرۆڤانە،وەئەوانەی کەمانەوە بۆ ناوچەی خۆراسان دووریان

خستنەوە [٤١]. وە هەروەها ئەوانەی کە دوورخرابوونەوە بۆ ماوەیەکی زۆر پازدە سالآن لەو شوێنێك مانەوە کەناوچەی (دەرگەزی ئەبیوەرد)[٤٢] بوو [٤٣].دوای مانەوەیان لەو ناوچەیە هەر ئەبیوەرد نیشتە جێ بوون و ڕەگی خۆیان داکوتا و دواتر هەر لەو شوێنە (دەرگەز) مانەوە و نیشتەجێ بوون [٤٤].لە سەرەتادا لە هۆزی زەند دووبرا هەبوون بەناوی (ئیناق) کە باوکی کەریم خان بوو وە (بۆداق) سەرکردایەتی ئەو هۆزەیان دەکرد.دافی برا بچووکی باوکی کەریم خان بوو باوکی ئەسکەندەر خان و و زەکی خان بووە لە دوایدا کەریم خان و صادق خان ی برای کەریم خان سەرکردایەنی هۆزی زەندیان دەکرد [٤٥].کەریم خان سەرۆکی عەشیرەتی لوور بوو کە لەمەڵبەندی زەند دەژیان گرنگترین ئەو عەشیرەتانەی کە بەزمانی کوردی قسەیان دەکرد لەسەدەی (١٨) عەشیرەتی زەند بوو، ئەو عەشیرەتەی تەختی پاشایەتی ئێرانی هێنایە دەست خۆی، لەخورەم ئابادیش واتە پایتەختی لوورستان ژمارەیەك لە عەشیرەتە کوردی یەکان پێشوازی یەکی گەرمیان لەکەریم خان کرد [٤٦].

یەکێ لە نەریتەکانی زەند ئەوە بوو کە ژنیش لەکاتی شەڕدا بەشداریان دەکرد یارمەتی مێردەکانیان ئەدا. ئەوش ئەوە دەگەیەنێ کە ژنانی سەردەمی کەریم خانی زند گیانی خۆیان بەخت دەکرد و ماڵ و منالّی خۆیان جێ دەهێشت بۆ ئەوەی یارمەتی پیاوەکانیان بدەن و هانیان بدەن لەکاتی جەنگدا،بێ گومان ئەو کردەوانەی ئەوان دەیان کر دبەزۆرەملێ بوو بۆ ئەوانەی ستەمیان لێ کرا ژیانیان تاڵ بوو بوو وەك ئاماژەمان بە چۆنیەتی ڕەفتارەکان کرد کە چۆن سوکایەتیان بەووخەڵکە دەکرد دڵی ئەو هۆزە کوردانەیان پڕ ڕق و کینە کردبوو وەك بلێ ی گرێیەکیان لەسەر دڵی ئەو ستەم لێ کراوانە درووست کردبوو هەر بۆیە لە دوایشدا تۆڵەی خۆیان دەکەنەوە و خۆیان دەبن بە فەرمانڕەوایەتی

لەسەرووبانەوە ئەوان بە پێچەوانەوە ڕەفتاری نامرۆڤانەیان لەگەڵ كەس نەكردووە، ئەوانە هێندە دڵ پڕ بوونە چاوەڕوانی هەلێكیان دەكرد تا تۆڵەی باب و باپیرانیان بكەنەوە كە بوونە قوربانی ئەو ستەم كەرانە بێ گومان كەریم خان یەكەم كەس بوو كە توانی هەلی زێرین وەرگرێ و بارودۆخەكە ڕێك دوای مردنی نادرشای ئەفشـــار بقۆزێتەوە. ئەگەر بێتتو بە وردی سەرنج بدەین دەبینین كە چۆن كورد لەم نێوانەدا بۆتە قوربانی بۆتە تۆپێك بەدەست هەردوولا ئێرانی و عوسمانی لە لاپەڕەكانی پێشووش ئاماژەمان بە كوردەكان كرد كە چۆن بوونە لەگەڵ یەكتری و لایەنگیری یەكردنیان كەم بووە بەجۆرێك خۆیان لەگەڵ سیاسەتی ئەو سەردەمە گونجاندووە.

## ب/ ژیـــاننامەی كەریم خان

لە مێژووی وولاتی ئێران كەسایەتیەكی ناوداری كورد وەدەردەكەوێت كە یەكێك بوو لە كەسایەتیەكی هەرە بەتوانا و قارەمان كە ناوی خراوەتە لاپەڕەكانی مێژووی ولاتی ئێران، لە سەردەمی ئەو دا باروو دۆخی ئێران بەرەو ئارامی ڕۆشتووە و ئەمن و ئاسایش وئارامی بە و وولاتە بەخشیوە،لەماوەی دەسەلاتی خۆی توانی باشترین شێوەو سیستەمی دەسەلاتی دابمەزرێنێ لەلاپەڕەكانی دواتر باس لەچۆنیەتی وەرگرتنی دەسەلاتی ناوبراو ئەكەین .

سەبارەت بەوناوی كەریم خانی زەند مێژوونووسان باسیان كردووە دەڵێن، كەریم خانی زەند كوڕی (ئیناق)[٤٧]ە لەساڵی (١٦٩٩ز-١١١٢ك) لە دێ ی (پریە)[٤٨] لەناوچەی مـــەلایەر چاوی بەدونیا هەڵهێناوە، وەهـــەروەها هیچ مێژوونوسێك ناوی باپیریان نەهێناوە بۆیە ناوی باپیری نازانرێ و نازانرێ كە كێ یە [٤٩].وە هەروە ها ســـەبارەت بە ساڵی لەدایك بوونی مێژوونوســـان بۆچوونی

جیاوازیان هەیە کـــەمال مەزهەر لە کتیبەکەیدا دەڵێ یان لەســـاڵی ١٧٠٤ یان ١٧٠٥ لەدایك بووە [٥٠] . لەڕاستیدا کەســـایەتی کەریم خان ڕەفتارەکانی نەزۆر توندو نەزۆر نەرم بوو، واتە مرۆڤێکی ناوەنجی بوو، لەهەمووژیانی دا بەگیانی سووك و ئازای و ناوبانگی ســـەند بوو، وەخۆی لە هەڵەشـــەیی و لەخۆبایی لە پایـــەی بڵند ئەپاراســـت، وەمرۆڤێـــــکی زۆر بێ فیـــز بووە، ئەوندە بـــاش بووە کە هەکەسێ داوای لێبوودرنی بکردبـــوایە ئـەوا ڕەتـــی نـــە دەکردەوە، وەیـــەکێ لـەخوڕەوشـــتەکانیشـــی دڵ پـــاك و چاکـە خـــواز بووە [٥١] .

هـەروەها بـە یـەکێك لـە ئـازاترین و بـەناوبانگترین کـەس دەژمێـژردرێ لـەناو تایەفەی زەند، کە لەو پەڕی دڵ نەرمی و میهرەبانی و لێبـووردە بـووە، وە هـیچ کاتێ فریو خـواردووی ژیـانی دوونیـا نـە بـووە وە هـەروەها هـیچ کـاتێ سیفاتی نیشتیمانی بوونی خۆی فەرامۆش نەکردووە [٥٢].وادیـارە هـەبوونی کەسـایەتیەکی ئاوا لـەو کـات و ساتەناسکەدا دەگمـەن بـوو، ئێـران لـەو سـەردەمەدا پێویـستی بەکەسـێکی وا بـووە کـە بتـوانێ ئێـران لـەو باروودۆخـە ناهـەمووارە ڕزگاربکـات چونکە ئەو هەموو شەڕو کوشتارە زەرەرەکەی بەخەڵکی گەیان هـەمووی لەسـەر حیـسابی خـەڵکی بـوو، جـا لـەدوای وەرگرتنـی دەسـەلاتی نـاوبراو بـەهۆی ئـەو دڵسۆزی و دڵ نەرمی و دادپەروەرانەیەوە دەتوانێ دڵی خەڵکی بۆ خۆی ڕابکێشێ بێ گومان هەر واش دەرچوو سەردەمی کەریم خان بەجوانترین سـەردەمی ئێـران ناو دەبرێ و لاپەڕەکانی چۆتە مێژوو.

ئەگەر بێتوو سەیری لاپەڕەکانی مێژووی کەریـم خان بکەین زۆر لایەنی کەسایەتی و پیاهەڵدانی کەریم خان دێتە بەرچـاو، ئەوە ش ئەوە دەگەیەنێت کەوا کەریم خانی زەند بەهۆی ئەم خووو ڕەوشتە بەرزانەی کە هەیبوو لەلایەن گەلەکەیەوە جێگای ڕێزوو خۆشەویســی بوو هەر بۆیە بە باشە مێژووەکەی

تۆمارکراوە و تەنها کەریم خانە کە لەسەردەمی ئەودا ئاشتی و ئاسایش بەرقەرار بووە وەك ئاماژەمان پێ کرد کە هەرچەند بوو نادر شا توانیبووی ئێران لەچنگ بێگانەدا رزگار بکات بەلآم هیچ کاتێ نەی توانیبوو ئارامی و ئاسایش بەرقەرار بکات بۆ وڵاتەکەی خۆی نەك هەر نادر شا جگە لە کەریم خان هەموو شایەکان نەیان توانی ئارامی بەوڵات ببەخشن ئەوش ئەوە دەگەیەنێ کە کەریم خان پیاوێکی لێهاتوو و چاکترین بووە [٥٣].وە مرۆڤێك بووە خاوەن بیرو بۆچوونی رێك و پێك بووە، وەزۆر دڵپاك بوو، وورد بووە لە ئیشو کارەکانی.وە بەهۆی ئەو رەوشت بەرزیەی توانیبووی هەموو کەس قەرزارباری خۆی بکات، وەسەرکردەکان بۆ سەرکەوتنی کەریم خان هەمیشە یارمەتیان داوە، وە پیاوێکی زۆر بوێر و تێ گەشتوو بووە، وە لەماوەیەکی کەمدا توانیویەتی هەموو خەڵکی ناوچەکانی دەورووبەری کردووە بە لایەنگیری خۆی، کەریم خان بەتەماای هەموو ئێران بوو، ئەی ویست بیکات بە کیشوەرێکی یەك حکومەتی کورد و ئاری [٥٤] .

وە هەروەها لەلایەنی سەربازی کەریم خانی زەند سەربازێکی چاو نەترس بووە وە بە قارەمانێکی لێهاتوو لەمەیدانی شەڕ دەناسرا، وەلەلایەکی ترەوە بە مرۆڤێکی دڵ نەرم بووە کەسێکی بەخشندە و میهرەبان بووە [٥٥] .وە دەبارەی تەمەنی کەریم خانی زەند زانیارەکی ئەوتۆ نیە بەلآم بە گوتەی :گ.اولویە کە گەڕیدەیەکی فەرەنسی بوو لەساڵی ١٧٩٦ز، واتە ١٧ساڵ پاش مردنی کەریم خان اتە ئێران جا بەگوتەی ئەو گەشتیارە دەڵێ:کەریم خان حەفتاو سێ ساڵ ژیاوە، بەلآم بەگوتەی گەشتیار ویلیەم فرانکلین ی ئینگلیزی کە لەساڵی ١٧٨٦ ز هاتیتە ئێران دەڵێ: تەمەنی هەشتا ساڵ بووە کە کۆچی دوایی کردووە [٥٦]. بێ گومان ئەو لایەنانەی کەریم خان کە باسمان کرد هەمووی

ببونە مایەی نێو بانگ ڕۆشتن، بەئازایەتی و مەردایەتی بەناوبانگ بوو بۆیە لە هەموو شوێنێك ناوبانگی ڕۆشتبوو [٥٧].وە زۆر لە گەریدەکان باسی سەردەمی کەریم خانیان کردووە بۆ نموونە (ویلیەم فرانکلین) کەلە سەردەمی جعفر خانی برای کەریم خانی زەند گەشتێکی بۆ ئێران کردووە لەگەشتەنامەکەی خۆی باس لەوە دەکات و دەڵێ ((ئەگەر نازناوێکی گەورە بدەن بە شایەك ئەوا دەبێ بەدڵنیایی دەبێ کەریم خانی زەند بێت)) بەوشێوەیە کە تا وەك و ئەمڕۆش شوێنەواری کارەکانی کەریم خان دەبن بە بەڵگەنامەیەك بۆ ئەم وتەیە، بێ گومان ئەو دڵنەرمیەی کەریم خان لە ترسا نەبووە بەڵکو هەرخۆی وابوو وێرای ئەوەش لەکاتی جەنگدا بێ بەزەیی بوو لەکوشتاردل بەڵان نەك سوکایەتی پێکردن.

باســـی کەسایەتی و لێهاتوویی کەریم خان بکەین هەر کەمە، چونکە کەریم خانی زەند کە سایەتیەکی دەگمەنە لە مێژووی ئێراندا، وە هەروەها ئێستاش خەڵکی ووڵاتی ئێران شایەدی کارە چاکەکانی کەریم خان دەدەن لە هەموو بوارێك [٥٨].دیارە ئەو ڕێگەیەی کەریم خان بۆ دامەزراندن و پارێزگاری کردنی هێزو دەسەڵاتی خۆی بەکاری هێناوە هەوڵێکی دڵنیایی داوە بۆ ئەوەی هێزێکـــی باش دروست بکات، وە هەرگیز بەلای ئەوەدا نەبووە کە بەهۆی تـــالان و برۆ وە خـراپـەو کوشــتار دەســـەڵاتەکەیـــی و ســـوپاکەی قایـم بـکات [٥٩].بێ گومان کەریم خان وەك پاشاکانی پێش خۆی نەبووە بە پارەو سەروەت و سامان و و ماڵبڕینی خەڵکی خەڵکی بۆ خۆی ڕابکێشێ و دەسەڵاتی درووست بکات، بەڵکو کەریم خان لەماوە ١٩ ساڵی دەسەڵاتی خۆیدا بە باشترین شێوە سیستەمی دەسەڵاتی دامەزراند و تەنانەت لە مـــاوە فەرمانڕەوایەتیە پـــاکەکەیدا پلرمەتی هـــەژاران و خەڵکی بەگشـــتی داوە و و دادوەری بەکـــار

هێناوە [٦٠].وە لایەنی زانستی و خوێندنی کەریم خان سەرچاوەکان ئاماژە بەوە ئەکەن کە کەریم خان خوێندەواری نەبووە نەی دەتوانیّ بنووسێت، چونکە هەر لە منداڵی یەوە نەچۆتە خوێندن و حوجرە بۆ خوێندن، هەرچەندە خوێندەواریشی نە بووە بەلاَم کەسێکی بە ئەزموون و بگرە باشتریش لە خوێندەوارێك ڕەوان بێژ بووە و کاروو بارەکانی وولاَتی بە شێوازێکی مۆدێرن بنیات ناو بەرێوەی دەبرد، وە لە سوار چاکیدا کەم وێنە بووە هەیبەتێکی دیاری هەبوو وە لەڕووی مەشقی سەربازی زۆر چالاك و پێشکەوتوو بوو وەهەروەها بەر لە دەسەلاَت گرتنی خودی کەریم خان و سوارەکەی بەناو بانگ بوو، هەمیشە بانگهێشتی تۆڵەسەندنەوەیان لیّ دەکرد.هەر وەك و باسمان کرد لێهاتوویی کەریم خانی زەند لە بواری سوپاو پیلانەکانی وای کرد کە بتوانیّ بەرامبەر هەر بزووتنەوەیەك یاخود سوپایەکی تر بەرەنگاری بکات، بۆ نموونە کە هەر لە سەرەتای پەرەگرتنی دەسەلاَتی کەریم خان زۆرانبازیەکی زۆریان لەگەلّ کرد وەك لەلایەن میر علی خانی (تەکللو)[٦١] کە لەلایەن شارۆخ میرزاوە کرابووە حاکمی (هەمەدان)[٦٢] بەلاَم کەریم خان بەسەریدا سەرکەوت چەندین تۆپی تۆپخانەکانیان تێك شکاند ئەوەش نیشانەی بەهێزی کەریم خان بوو چونکە لەشکری تەکەللو زۆر گەورە بوو [٦٣].دیارە لێهاتوویی کەریم خان لەجەنگدا جۆرە گرنگیەکی بەخشیبوو بەتایفەی زەند تا چاوی ناوبراویان لیّ دیار بوایە نەیان دەتوانی خراپی بەرامبەر بەزەدەکان بکەن ئەوەش ئەوە دەگەیەنیّ کە کورد شوێنێن دیار بو لەو سەردەمە هەرچەنە لە پلەکانی دواوەش بوون تا کەریم خا ن بوو بە فەمانڕەوایی ئێران ئینجا بەتەواوەتی وەدیارکەوتن لەسەر شانۆی سیاسی ئێران.

## تەوەرەی دووەم

## دەرکەوتنی کەریم خانی زەند لەسەر شانۆی سیاسی ئێران

### أ/ کەریم خان و وەرگرتنی دەسەلآت لە ئێران

سەردەمی فەرمانڕەوایەتی زەندەکان لە ئێران لایەنی سیاسی و تاڕادەیەکیش ئابووری و کۆمەڵێك پەیوەندی دەرەکی بەخۆیەوە بینی، بۆیە ئێمە لێرەدا هەوڵ ئەدەین تیشك بخەینە سەر پەیوەندیەکان وچۆنیەتی هاتنە سەردەسەلآتی زەندەکان و پیوەندی میرنشینە کوردیەکان دەوڵەتی عوسمانی و دەورووبەری.

شەڕی دوورو درێژ خایەنی نێوان عوسمانیەکان و سەفەویەکان کارێکی زۆر خراپی کردبووە سەر هەدوو لا ئەو بارووددۆخە ناهەموارەش شپرزەییەکی ئەوهای درووست کردبوو کە گەلانی ژێردەستەی ئەم دوو دەوڵەتە یەکجار بێزار ببوون، لەلایەکی تری خۆرهەلآتەوە ئەفغانەکان دەستیان کردبوو بەداگیرکردنی ئێران و لەم کاتە ناخۆشانەشدا کە نادر شا توانیبووی بەزۆرداری لەئێران ئیمپراتۆریەتێکی بەهێز پێکەوە بنێ، ئەوە وای کرد دوای کوژرانی نادر ڕێگە خۆ بێ بۆ کەریم خان کە دەسەلآت بگرێتە دەست [٦٤]. کۆتایی سەدەی حەڤدەو سەرەتای سەدەی هەژدە نیشانەکانی لاوازی و بێهێزی لە دەوڵەتی سەفەوی زیاتر وەدەرکەوتن، لەئەنجامی خراپی باری ناوەخۆی ولآت بەهۆی هاتنە سەر دەسەلآتی ژمارەیەك شای لاواز لەفەرمانڕەوایەتی و زیاد بوونی ڕەگەزی بێگانە لە نێو سوپادا، کە ڕێگا خۆشکەر بوو بۆ دەست خستنە نێ وکاروباری دەوڵەت، ئەوە سەرەڕای بەردەوامی ململانێ یە دەرەکیەکانی دەوڵەت لە بەرەی ڕۆژهەلآت و ڕۆژاوا کە باری ولآتی قورستر کردبوو، بۆیە ئەفغانەکان ئەو هەڵەیان قۆستەوە و لەبەرەی ڕۆژهەلآت هێرشیان کردە سەر دەوڵەتی سەفەوی و دەستیان بەسەر ئیسفەهان داگرت، و ماوەی نێوان (١٧٢٢-١٧٣٦ز) فەرمانڕەوایەتی ئێران

بکەن [٦٥]. شیاوی باسە لەکۆتاییەکانی حوکمڕانی ئەفغانەکان سەرکردەیەکی سەربازی هاتبوە مـەیدان ئەویـش نادر شای ئەفشار بو، کەتوانیبوی لە ز١٧٣٦ کۆتایی بەدەسەلاٌتی ئەفغانەکان بهێنێ، بەلاٌم وەك ئاماژەمان پێکرد دواتر بەدەست هەندێ لەهۆزەکەی خۆی لەناو خێمەکەی کوژرا [٦٦].لێرە بەدواوە بارودۆخێکی نالەبار هەموو ئێرانی گرتبوەوە،چونکە سەرانی سوپای نادر کەوتبونە ململانێ بۆ وەرگرتنی دەسەلاٌت، لێرەدا بەزۆر ناوچەکانی رۆژهەلاٌتی ئێرانی خستە ژێر دەسەلاٌتی خۆی [٦٧].لێرەدا وەدەرکەوت کە کەریم خان چۆن توانی بوار بۆخۆی برەخسێنێ لەناو ئەو هەموو کێشە سیاسی ناوخۆو دەرەکیانە دەرچێت و بەتەواوەتی خۆی ئامادەکردبوو بۆ بەدەست هێنانی ئەو مەرامە سیاسی یەی کە چەندین سالٌ کورد لەدەست ئەو زۆردارانە دەیان نالاٌند، ئەوەش هەم دیسا دەگەرێتەوە سەر کارامەیی کەریم خان کە توانی ولاٌت لە دەست نەیاران رزگار بکات.

لەگەلٌ ئەوەشدا ناوچەکانی تری ئێران لە ئاژاوە بێ بەش نەبوو لەوانە کەریم خانی زەند، لەسالٌی ١٧٥٠ و عەلی مەردان خان کە سەرۆکی بەختیاریەکان بوو لەناوچەی ئەسفەهان و ئازاد خانی ئەفغانی لەناوچەی ئازەر بێجان و محمد حوسێن خانی قاجار لە هەرێمی ئیستەر ئاباد و مازەندەران کەوتنە خۆ بۆ راکێشان و و کێش کردنی باری ولاٌت لە بەرژەوەندی خۆیان [٦٨].

لەو سەردەمە ئێرەیی بردن بە پۆستی دەسەلاٌت شتێکی باو بوو لەنێوان سەرۆك هێزەکان و خێلەکان هەر بۆیە ئەوکات کەریم خان ناوچەی (جولفا) ی لەژێردەست دا بوو لەگەلٌ خەلکی ئەو ناوچەیە زۆر باش و میهرەبان بوو ئەوەش بووە هۆی ئێرەیی بردنی عەلی مەردان خان بەرامبەر بەو پایە بەرزەو هەلوێستی خەلٌکی بۆ کەریم خان [٦٩].

لەو کات و ساتەدا کە ئەفغانەکان لە لە قەزوێن ما بوونەوە دەیانتوانی شەڕێکی قورس بکەن بەرامبەر بە ڕکەبەرەکانیان وپێش خۆیان خاوێن بکەنەوە و دوژمن دەربپەڕێنن، بەڵام لەو لاوە کەریم خان لە ئیسفەهان دەستی بە لەشـــــکرکێشی کردو بەرەو فراوانکردنی دەسەلاتی خۆی لەشکری بەرەو پێشەوە ڕۆشت [٧٠].

بەوجۆرەش ناکۆکی درووست بوو لە نێوان کەریم خان و عەلی مەردان خان، کەریم خانیش سووپایەکی بەهێزی هەبوو بەهۆی بەهێزیەکەی توانی شکست بە عەلی مەردان خان بهێنێ و خۆی ببیێت فەرمانڕەواو دەسەلاتی گرتەدەست.بەو جۆرە ململانێ لەسەر دەسەلات بەردەوام بوو بەلام کەریم خان کۆتایی بپێ هێنا، هەرکە هاتە سەر دەسەلات شیرازی کردە بنکەی فەمانڕەوایی خۆی، لەبەر ئەوەی لانکەی زنجیرەی هەخامەنیشی و ساسانیەکان بوو، بەهۆی هێزێکی گەورە لەقارەمانانی کورد و بەختیاری و عەرەب، زاڵ بوو بەسەر دوژمنانیدا بەو جۆرە بیست و هەشت ساڵ دەسەلاتی ئێرانی گرتە دەست بەشێوەیەکی دادپەروەرانە و زۆر ڕێك و پێك کاروو باری ئێران بەڕێوەدەبات [٧١].

وادیارە ئەو ناکۆکیەی نێوان کەریم خان وعەلی مەردان خان لەسەر دەسەلات بوو ئەوە ش ئەوە دەگەیەنێ کە هەرکەس خۆی بە شیاوتر دەزانی بۆ سەردەسەلات بۆیان دەرکەوت کە کەریم خان دەیەوێت هەموو ئێران بگرێتە دەست و وە ناکۆکی ئەفغانەکان لەگەڵ دوژمنەکان زۆر سەخت بوو بەلام دیارە کە کەریم خان هیچ کات نەترساوە بەرامبەر بە دوژمنە سەرسەختەکانی ئەوکاتی سەردەمی زەندەکان.

بەوجۆرە هەرچەندە کەریم خان هەندێ لە نەیارانی بن برکردن بەلام ڕۆژ بەڕۆژ ڕکەبەرەکانی لەسەر دەسەلات زیاتر دەبوون دژایەتی کەریم خانیان دەکرد

بەبۆچوونی خۆم ئەوە دەبوویە هۆیەك بۆئەوەی زۆر درەنگ کاروبارەکانی بەڕێوەبەریێ و وولات یەکبخات.

لەدوای مردنی عەلی مەردان خان دوو دوژمنی بەهێز مابوون دژایەتی کەریم خایان دەکرد لەسەر دەسەلات (ئازاد خانی ئەفغانی و محمد حسن خانی قاجاری) بوون لەسەر تاج و تەختی پاشایەتی شەڕیان بوو، کەریم خان ڕووی کردە ئەسەدخان و لەنزیك قەزوێن بەرەنگاری بۆوە، کەریم خان بەشێوەیەك شکا کە نەك بووە هۆی ئەوەی کەوا دەست لە ئیسفەهان هەلگریێ بەلکوو وازی لە شیرازیش هێنا [٧٢].

دوای ئەوە کەریم خان بەرەو ناوچە شاخاویەکانی نێوان حەوزی فارس و کەنداوی فارس نزیك دۆلی (کرمسیر) لێرەدا بارودۆخی کەریم خان زۆر زەحمەت بوو بەلام کەریم خان خۆی کردە لایەنگری (روستم سولتان) حاکمی (گەشتی) داوای یارمەتی لێکرد لەدژی ئازادخان، دواتر بەهەر شێوەیەك بێت سوپای ئەسەدخان ڕووبەرووی رۆستەم بوونەوە دواتر بەسەر ئەسەدخان زالبوون و سوپاکەی تێکشکاند و زۆریان لێ کوشتن و هەلاتن [٧٣].لەدوای لەدەست دانی شیراز کەریم خان هێزێکی زۆرچاکی کۆکردەوەو بە زۆر شیرازی خستەوە ژێر دەستی خۆی، لەو هەل و مەرجەدا ئازادخان بۆ ڕووبەڕوو بوونەوەی کەریم خان داوای یارمەتی لە والی بەغدا و فەرمانڕەوایەتی گورجستان کرد بەلام یارمەتیان نەدا، لەدوایدا ئازادخان گەڕایەوە لای کەریم خان و لێرەشدا کەریم خان بەجۆرێك لەگەلێ دوژمنی خۆی ڕەفتاری کرد شەرمەزاری کردبوو ووردە ووردە بوونە برادەر لەگەلێ یەکتر [٧٤].

وادیارە بەو جۆرە ململانێ یە خەلکی تووشی دلێ ڕاوکێ بوون بۆ پەسەند کردنی یاخود پشتگیری کردنی لایەنە سیاسی یەکان کەریم خان لەسەر دەسەلات

ئەوەندە دوژمنی زۆر بوو لەهەموو لایەکی وڵات هەیبوو، هەرکەس بۆخۆی هێزێکی پێك هێنابوو دژایەتی دەکرد بێ گومان ئەو جۆرە دوژمنکاریە ڕێگای گرتبوو لە بیرکردنەوەی خەڵکی بۆ ئەوەی کە لایەنگیری لە کەریم خان بکەن بێ هیوایی خۆشبوونی ووڵات باڵی بە سەراسەری ئێران کێشابوو،ئتبووری هێندە لاواز بوو بوو داهاتوویان نەدەبینی کە ووڵات بچێتە بارێکی ئاسایی و ژیان دردوست کردن تەنها دەنگ و باسی شەڕو کوشتار هیچی تر بەدی نەدەکرا لەو وڵاتە.

دوای خۆ بەدستەوەدانی ئازادخان ئەوەی مابۆوە دوژمنی هەرە بەهێزی کەریم خان محمد حەسەن خانی قاجاری بوو ئەوە هۆزێکی تورکی قاجار بوو لەکاتی لەکاتی تەیمووری لەنگ لە سوریاوە هێنرابوونە ئێران یەکێك بوون لەو حەوت هۆزانەی کە شا (ئیسماعیلی یەکەمیان) هێنا بووە سەر تەخت، وەك و کۆسپ لەبەردەم کەریم خان وابوو دەبوو ڕوو بەڕووی ببێتەوە دواتر ڕوو بەڕووی یەکتر بوونەوە، سەرەتا تەرازووی هێز بەلای سوپای محمد حوسێن خانی قاجار دا شکایەوە، بۆیە کەریم خان گەڕایەوە ناوچەی تاران بەمەبەستی خۆ تەیارکردن، لێرەدا قاجارەکان دەستیان بە فراوانخوازی کرد و هێرشیان بردە سەر شیراز لە ١٧٥٧ز گەمارۆیدا، دواتر سەرنەکەوت و هەڵاتن (٧٥).

محمد حسین خان بەسووپایەکەوە کەلە شیراز هەلآت لەو کاتەدا (شێخ عەلی خان) کەسەرکردەیەکی ئازای هۆزی زەند بوو هەلی کوتایە سەر باروو بارخانەی سوپای قاجار و تێکی شکاند ئینجا لێرەدا خەڵکەکە هەمووی هاتن یارمەتی کەریم خانیان دا لێرەدا لەبەر برسیەتی و هەڵمەت و ئازایی سوپای کەریم خان و سوپای قاجار کە دڵسۆزی محمد حسن خان نەبـوون، بـەلآم بـەم هۆیـانەوە

سوپای قاجار شـیرازەی تێـك چـووبوو و شـکان و محمد خوسـین خان بەدەستی

شـێخ عـەلی خان کـوژرا [٧٦].

لێرەدا ئەگەر بێت و ئێمە بە ووردی سەرنج بدەینە ئەو هەوڵ و تەقەلایانەی کەریم خان و هۆی لێهاتوویی و ناوبانگی کەریم خان وای کردبوو هۆز و سەرکردەکانی ناوچە جیاجیاکان هەمووی بەهانای کەریم خان دەهاتن و یارمەتیان پێشکەش دەکردن ئەوەش بەگشتی لەو کاتو ساتەدا کەریم خان بە براوە دیار بوو خەڵکی و سەردکردەکان لەداهاتو کەریم خانیان لەبەرچاو بوو کە دەسەڵاتی تەواو دەگرێتە دەست لە تەواوی ئێران هەر بۆیە ئەوانیش سەیری داهاتووی خۆیان دەکرد و خۆیان لـە کەریم خان نزیك دەکردەوە ئەوە پێژەوانەی سەرەتای فکرەی کەریم ان بوو کە تازە دەیەویست ئێران ڕزگار بکات وەك لە لاپەڕەکان پێشوو ئاماژەمان کرد کە کەس نەی دەتوانی بڕیارێکی یەکلایی کەرەوە بدات چونکە بەچاو سەیری هەر کامێکت دەکرد دەت وت سەردەکەون.

محمد حەسەن خان شیرازی بەجێ هێشت و گەڕایەوە بۆ ئەسفەهان دواتـر لـە ئەسفەهانیش خـۆی نەگرتـەوە لەبـەر ئـەوە بەسـوپای هێزەکـەی خـۆی گەیاندە مازەندەران و نەی توانی لەوێ بمێنێتەوە [٧٧].

سەرکەوتنی سوپای کەریم خان لەو شەڕەدا ڕێگا خۆشکەر بوو بۆ کەریم خـان تـا دەسـەڵاتی بگەڕێنێتـەوە ئەسـفەهان و ئەناوچـانەی لـە دەسـتی دابـوون و بیانخاتەوە بازنەی قەڵـەمڕەوی خـۆی لـە سـاڵی ١٧٥٧ز، بـەڵێ کـەریم خـان بـەو جۆرە بـە یەکـەم پلـەی ئـاواتی خـۆی گەیـشت و فەرمانڕەواییـەکی سـەربەخۆی دامەزراند و ئیدارەی زەندەکانی جێگیر کرد.

دوا بەدوای ئەو سەرکەوتنە کەریم خان گەڕایەوە ئەسفەهان وە لەوێ خەڵکی پێشوازیان لێکرد و پێ ی شاد بوون ، بەم جۆرە زۆری پێ نەچوو هەموو ناوچەکانی جاران هاتنەوە ژێر دەسەلاتی، لێرەدا کەریم خان بەیەکەم پلەی ئاواتی خۆی گەیشت، حکومەتی سەربەخۆی درووست کردووە، لەدوای ئەو ڕووداوانە ووردەووورده ئیدارەی جێگیر بووە وە لەدوای ڕێخستنی ئیش و کاری قەلەمڕەوی، بەبیری تیژی سیاسی خۆی زۆرچاك زانیبووی کەتاکو بەسەر محمد حسین خانی قاجاردا زاڵنەبێت لە پاشەڕۆژدا دەوڵەتەکەی قایم نابێت، لەبەر ئەوە بەسەرکردایەتی (شێخ علی خان) سوپای ناردۆتە سەر مازەندەران، وەلێرەدا شێخ عەلی خان سوپای ناردۆتەسەر مازەندەران شێخ عەلی خان زۆرگرنگ بووە بۆ کەریم خان ، گەیلان و ئازەربایجان کەوتۆتەژێر حوکمی کەریم خانەوە [٧٨].

وادیارە دوای سەرکەوتنە یەك لەدوایی یەکانی سەربازی و شەڕ و کوشتاری بەردەوام بۆ جێگیر کردن و چەسپانندی دەسەلات، دوای بەوای دەست بەسەرداگرتنی هەر ناوچەیەك حاکمێکی باوەڕپێکراوی دادەنا بۆ ئەوەی باروودۆخی ناوچەداگیرکراوەکە سەقامگیربکات و پەرەی پێدات .

لەدوایدا لەشەڕی (قەرە چیمەن) دا فەتح عەلی خان ی سەرۆکی هۆزی ئیسفەهان شکاو و بەدیل گیرا و فەتح علی خان زۆر ڕێزی لێگیرا، وەلەدوایدا دەرکەوت کە ئەو پیاوە لەگەڵ هەندێ سەرداری تر خەریکی پلان دانان بوون بۆ لەناوبردنی کەریم خان وەلەدوایدا هەموویان لەناو بران، لەدوای ئەو هەموو سەرکەوتنانە ئیتر دەسەلات کەریم خان بەتەوای لەئێران جێگیر بوو [٧٩].

بەو شێوەیە کەریم خان توانی حکومەتی زەند دابمەزرێنێ، کەریم خان بە باشترین سیاسەتمەداری حەکیمانەی ئەو سەردەم دادەنرێ توانی بەسەر هەموو

هۆزە جیا جیا کان و دوژمنە سەرسەختە ڕێگرەکانی بەردەم دەسەلآت وەرگرتن سەرکەویَ و سەرکوتیان بکات و فەرمانڕەوایەتی ولآتی پان و بەرینی ئێران بگرێتە دەست [٨٠].

وادیارە لێرەدا بەرە بەرە خەڵکی ئەتوانن بڕیاری خۆیان بدەن و لە کەریم خان نزیك ببنەوە چونکە سەرکەوتنەکانی ناوبراو وای کرد جۆرە هیوایەك بە گەلەکەی ببەخشیَ نە تەنها هۆزی زەند بەڵکو کەریم خان جیاوازی تایفەو نەتەوە و مەزهەبی نەدەکرد بۆیە خەڵکی تێکڕا بەهاتنی ئەو دڵخۆش بوون لە ئەنجامیشا هەر وادەرچوو کە توانی ولآت بەرەو پێش بەریَ لە زۆربەی لایەنەکانی ژیان.

بەو شێوەیە فەرمانڕەوایەتی کەوتە دەست کەریم خان و وە ماوەی دەسەلاتی کەریم خان لە ١٧٥٢ ز تا ١٧٧٩ ز بوو کە بەجوانترین وەرزو تەمەنی مێژووی گەلی کورد بوو [٨١].

کەریم خانی زەند باوەڕی تەواوی جەماوەری بەدەست هێنا نازناوی (شا) ی لەخۆ نەنا نازناوی وەکیل (جێگری) لەخۆنا ئەوەش ئەوە دەگەیەنیَ کە کەریم خان مرۆڤێکی ئاسایی نەبوو، دەگمەن بوو لەو سەردەمەدا کە بتوانیَ ئەو ئێرانە شلەژاوە کە لەهەموو لایەك قات و قوری و برسیەتی بەسەریدا دا هاتبوو بەجۆرێك کە وای لێاها تبوو کەس کەسی لەبرسا نەدەناسی هەرکەس بۆخۆی دەژیا بەلآم بەهاتنی کەریم خان ئەو باروو دۆخە هێور دەبێتەوە کە دواتر ئاماژە بە حکوومەتی کەریم خان و لایەنەکانی تر ئەکەین کە چۆن گۆڕانێکی کتووپڕی بەسەر تەواوی ئێران دێت.

ئەو لێهاتوویی و سیاسەتە زیرەکانەی کەریم خان بوو تەواوی ئێران شانازی بەکەریم دەکرد و وە زۆرێك لە خەڵکان شانازی بەچۆنیەتی هاتنە سەر دەسەلآتی کەریم خانەوە ئەکەن و هەروەها کوردیش بەگشتی و لوورەکان

بەتایبەتی شانازی پێوە ئەکەن و کە پاش کۆتایی هاتنی فەرمانڕەوایەتی میدیا کەریم خان یەکەم ورد بووە کە فەرمانڕەوایەتی وولآتی پان و بەرینی ئێرانی گرتۆتە دەست و کەریم خان بوو بووە فەرمانڕەوایی گشتی وولآتی ئێران [٨٢].

دیار بوو هەر کە کەریم خان بوو حاکمـــی ئێران، لەلایەن سولّتانی عوســمانی (عەبدولحەمیدی یەکەم)[٨٣] ەوە کاغەزێکی بۆ نێردراو بەپاشای ئێرانی ناسی و ئەو عەقدو پەیمانەی کەلەکاتی (نادر شا) کرابوو بۆی تازە کردەوە، بۆ میری میرانی سنووری نووسی کە ئەو پەیمانە ڕابگرن چاودێری دراوسێیەتی بکەن [٨٤].

کەریم خان شاری شیرازی کردە پایتەخت و لەسەرەتادا ناوی (وکیل الدولە) ی لەخۆنا، دواتر (وکیـل رعیە) جارجاریش (وکیل خلائق)، کەریم خان نەی دەویست پیّ ی بوترێ شا لەسەر بنەمای ئەوەی کە " شا ئیسماعیلی سیّ یەم " شا بووە و ئەم جێگری بووە. تا دوای مردنیشی نەی ویستووە نازناوی شا هەلّگریّ [٨٥].

وادیار بوو کە زۆر لەهۆزە بچووکەکان و هەندیّ لە پیاوە گەورەکان پشتگیریان لە کەریم خان دەکرد وەك (بۆداغ خان) لە ئاخیری سەدەی هەژدەو سەرەتای سەدەی نۆزدە دەژیا هەر زوو پشتیوانی لەبنەماڵەی زەندی کرد کە یەکێك لەوان کەریم خانی زەند بوو [٨٦].

ب / ســـنوورو ڕووبەری فەرمانڕەوایەتی کەریم خان

هەرکە واتای ڕاستەقینەی جوغرافیای و سیایسی ئێران کەوتە دەست حکوومەتی زەندی، لە ڕاستیدا هەمان ئێرانی سەردەمی سەفەوی بوو کە هروژمی ئەفغانی و تورك و ڕووس و داگیرکردنی تەختی پاشایەتی بەدەستی نادر و هەوارکردنی ئیمپراتۆریەتی بەتێکرا نەیانتوانی لەبابەت گۆڕین و هەڵگێرانەوەی ئەو بارودۆخەدا سەرکەوتنێك وەدەست بێنن، بەلآم ئەوەی بەلای ئێمەوە زیاتر

گرینگ و پێویستە ناسینەوەی وولاتێکە کە بەدەس کەریم خانەوە بەرێوەدەچوو، باسەکە بەجوغرافیای قەلەمرەوەی وەکیل دەست پێ دەکەین.دەکرێ بگوترێ پانتایی جوگرافیای فەرمانرەوایی کەریم خانی زەند بریتی بوو لە و هەرێم و ناوچانە : لار، کرمان و بەشی رۆژهەلاتی (عێراقی عەجەمی)[٨٧] و بەشێك لەناوچەکانی زاگرۆس و کەنارەکانی کەنداوی فارس و و باکووری باکووری رۆژئاوای ئێران و ئازەربایجان و کوردستان [٧٨].

دەتوانین بلێین زۆربەی هەرەزۆری کات و ساتی حکومەتی کەریم خان بریتی بوو لەشەر و ناکۆکی و هەولدان بۆچەسپاندنی دەسەلات و هەروەها دابین کردنی جۆرە هێمنایەتیەك لەوولات بوون، وەك پێشتر باسمان کرد لەدوای نادر شاو تێك چوونی دەسەلاتی ئەفشاریەکان وولاتی ئێران بەتەواوەتی تێك چوو بو،بۆیە لەو هەل و مەرجەدا کەریم خان لە ئامادەباشی دابوو بۆ زال بوون بەسەر نەیاران و هێور کردنەوەی بارووددۆخەکە،هەولی کەریم خان لەسەرەتادا ئەوەبوو دەیویست هەندێ ناوچەی فارس داگیر بکات و رزگار بکات، بەپێ ی سەرچاوەکانی سەردەمی کەریم خان دوای رێك و پێك کردنی کاروباری ناوچەکانی فارس و کرمان و ناوچەکانی بەختیاری، لەسەرەتای ١٧٦٠ ز رووی لە ئازەربایجان کرد و توانی مەراغەو سەلماس داگیربکات [٨٩].لەسالی ١٧٧٥ هێزەکانی کەریم خان لەچەندلاوە هێرش دەکەنە سەر عێراقی عارەبی وکوردستان،سیاسەتی کەریم خان دەربارەی فارس زیاتر بەلای داگیرکردنی بەصرەوە دەچوو،چونکە بەصرە شوێنێکی ستراتیژی گرنگ بوو دواتر بەرەوکەرکوك و هەندێ گوندی داگیر کرد،بەلام هەر زو تێداکشایەوە سالێك زیاتر سوپای فارس ئابلووقەی خستبوە سەر بەصرە،لە١٦ی نیسانی ١٧٧٦ بەصرەی داگیر کرد [٩٠].دوای چەندین جار کێشمەکێش لەگەل قاجارەکان بەلام بۆ دواین جار کێشەی قاجارەکان لەلایەن

كوڕەكانی محمد حەسەن خانی قاجاری سەری هەڵدا بۆیە سوپای زەند بەسەركردایەتی زەكی خان لەسالأنی (١٧٧١-١٧٧٤)ز توانیان بەتوندی قاجارەكان تێك بشكێنن ژمارەیەكی زۆریشیان لێ بەدیل بگرن،هەرچەندە ئەو سەركەوتنانە زۆری نەخایاند چونكە سەرئەنجام ئاغا محمد خانی تاكە میراتگری قاجارەكان دوای نزیكەی پەنجاساڵ چاوەڕوانی توانی تۆڵەی كوشتنی باب و بنەماڵەكەی وهەروەها ئاوارە بوونی پاشماوەی هۆزی قاجار لەبنەماڵەی زەندیەكان بكاتەوە [٩١].

بەشێوەیەكی گشتی كەریم خان دوا بەدوای چەندین ساڵ ئەو هەوڵ و تەقەلا و گۆڕانكاری و كوشت و كوشتاری زۆر و تێكۆشان توانی سەرجەم دوژمنان و نەیارانی خۆی لە مەیدانی دەسەلأت وەدەر بنێت و ببێتە فەرمانڕەوای وڵاتی ئێران [٩٢]. ئەوی لەو هەل و مەرجە جێگای سەرسوڕمانە هەوڵ نەدانی كەریم خانی وەكیلە بۆ دەست بەسەر داگرتنی هەرێمی خۆراسان ئەویش لەبەر ئەوەی هەمیشە خۆی بە قەرزاری ئەمیرو لەشكەری پێشووی خۆی (نادر شای ئەفشار) دەزانی بەپێ ی داب و نەریتی كۆن ڕێزێكی تایبەتی بۆ پاشەواری نادر شا داناو خۆی تێ نەگەیاندوون تا لە ژیان مابوو، هەرێمەكانی خوارووی دەریای قەزوێنیش واتا (گیلان) و (مازەندەرانیش) بێگومان دوای نەمانی مەحەمەد حەسەن خانی قاجاربوونەبەشێك لە دەسەلأتی خانی زەند [٩٣]. بێ گومان زۆربەی هەرە زۆری لەشری كەریم خانی زەند لە عەشیرەتی لەك و زەند بوون وە هەروەها هەندێك لە گەنجانی شارەكان لەپشتی كەریم خان بوون كەریم خان هیچ جیاوازیەكی لەنێو ئەو سەربازانە نەدەكرد دادپەروەرانە لەگەڵیان دەجووڵایەوە [٩٤].ئێرانیەكان هەیشە لایان وایە كە سەردارانی كەریم خان هەمیشە هانیان داوە تا لەشكر بكاتە سەر خۆراسان، چونكە برەوی دەسەلأتی

لەو هەرێمە دەبوو بە هۆی بالآدەستی حکومەتەکەی لەتەواوی ئێرانا ئەگەرچی پیاوێکی ئازاو بێباك بوو، بەلأم عەیش و نۆشی شیرازی لەو گیرو گرفتانە بەباشتر دەزانی و هەمیشە بێ مەیلی خۆی سەبارەت بەو گەلانە بەرزە فرانەیە ئاوا پاساو دەدایەوە و دەیگوت گەمارۆیەکی پرمەترسی و درێژ خانیەنی قەلأگان، وەختایەك چاو لە ئاکامەکەی بکەی جگە لەچەند قەلە ڕەشێك کە هیچ شتێکیان تێدا نامێنێ [٩٥].

دکتور پەروێز لە کتیبەکەی دا نووسیویەتی دەڵێ : ســــوپای کەریم خـان لـە شیراز چل و پێنج هەزار سـەربازی هـەبوو، لەسـوپاکەیدا چـەندین جـۆر ڕەگـەزی تێدا بەدیار دەکەوت (دە هەزار سەرباز خـەڵکی عێراقـی عەجـەم بـوون، شەشـە هەزار پیاوی فارس بوون، بیست و چوار هەزار نەفەر لە هۆزی لـەك و لـوور بـوون سێ هەزار لە هۆزی بەختیاری بـوون، وە هـەروەها چـوار سـەد سـەباز تفەنگـچی بـوون و تـیرو کەوانیـشیان بـەکار دەهێنـا کـەریم خـان شـمشێریـشی بەکـــار دەهێنا، چەندین نەفەریش خزمەتکار بوونە،وە دەڵێ وەختێ کـە کـەریم خـان لـە شـــوێنێك ئامادە دەبوو هەشـــت هـەزار سـەرباز ئامـادە دەبـوون [٩٦]. زۆربـەی سەربازەکان کەمەر بەندی ئاسن یان زنجـیر لەبـەردابوو بـۆ ئـەوەی گوللـەو تـیرو کەوان کاریان تێنەکات لەکاتی شەڕدا [٩٧].

## تــــــــەوەرەی سێ یەم

## لایەنە شارستانیەتەکان و حکوومەتی زەند

### أ/ژیانی ئـــــــــابووری

بێگومان بەر لەسەرەتای درووست بووونی حکومەتێکی تازە، سەرەتا ئەمنیەت و ئاسایش بەرقەرار دەکرێ ئیجا لایەنەکانی دیکەی ژیان،بەم جۆرە لەسـەردەمی

فەرمانڕەوایەتی کەریم خانی زەند لایەنی ئابووری و ئاوەدانکردنەوەی زۆری پێشکەوتنی بەخۆوە بینی، هەرچەندە ئەو بابەتە نووسینی زۆری دەوێ وە لەهەمان کاتیشدا لەبەر کەم و کورتی سەچاوەکان ناچار دەبین بەشێوەیەکی گشتی باس لە بارودۆخ و شێوازی دەرەبەگایەتی و باری ئابووری کوردستان بکەین و لێ ی بکۆڵینەوە چونکە وادیارە لایەنی ئابووری و بازرگانی و لایەنەشارستانیەتەکان بەگشتی زۆر گرنگن بۆ ژیانی ڕۆژانەی خەڵکی و درێژ بوونەوەی دەسەڵاتی ئەو کەسەی کە ئەو وڵاتە بەڕێوە دەبات. ئەو بارووذۆخە نالەبارەی کە لەسەردەمی نادر شاوە لەدوای کوژرانیشی کە لە ئێران دروست بوو بوو، لایەنی ئابووری و بازرگانی بەشێوەیەکی زۆر بەرەو دواکەوتن چوو بوو، وە کاتێ کەریم خان دەسەڵاتی گرتە دەست دوای دامرکاندنی نا سەقامگیری،هەستی کرد دەبێ پەرە بە ئابووری بدات و بەرەو پێشی ببات،وەگەورەترین هۆکاری گەشەسەندنی ئابووری و بڵاوبوونەوەی ئاسایش بووکە لەئەنجامی هەوڵی کەریم خانەوە هاتبووە گۆڕێ [٩٨]. لەپێش سەردەمی کەریم خان ئەوروپا لەبەر گۆڕانکاری ناوەخۆ زۆر گرنگی بە بازرگانی ئێران نەدا، بەڵام ئەتوانی بڵێین لەسەردەمی کەریم خان وەك بازرگانی ناوەخۆ کشتوکاڵی ئێرانیش بەرەو پێش چوو، کە ئێران کەوتبووە ئەپەڕی خۆشی و گەشەسەندنەوە خاوەن موڵك وبەرووبوم بەشێکی زۆریان بە حکوومەت ئەدا سەربەخۆ بوون و خاوەن سەروەتی خۆیان بوون [٩٩]. وە بەشێوەیەکی گشتی دانشتوانی کوردستانی ڕۆژهەڵات لەنیوەی یەکەمی سەدەی هەژدە لەمانە پێك هاتبوون : خەڵکی نیشتەجێ، ئەوانەی بە جۆری سەرەکی کشتوکاڵیان دەکرد " نیوە نیشتەجێ : ئەوانەی کشتوکاڵ و ئاژەڵداریان پێکەوە دەکرد " ئاژەڵ بەخێو کەرانی کۆچەر : ژمارەی ئەو جوتیارانەی هەرگیز ئاژەڵداریان بەخێو

نەدەکرد گەلێ کەم بوو، تەنانەت، گوندی نیشتەجێ تەواویش مێگەلێکی بچووکی هەبوو و لەوەڕگا بچووکەکانی لادێ، ڕێگەیان نەدەدا زیاتر ئاژەڵ ڕابگرن، هەروەها هەبوونی شاخ و ڕووبارو ناوچە کشتوکاڵیە گرنگەکان هەلێکی باشی رەخساندبوو بۆ کشتوکاڵ و ئاژەڵداری و هۆکارێك بوو بۆ بەرز بوونەوەی ئابووری، ژیانی ئابووری زۆربەی زۆری دانشتوانی میرنیشینانی کوردستانی ڕۆژهەلات بە ئاژەڵداری و کشتوکاڵ بەستترابوو[100]. صالح محمد ئەمین دەڵێ بەشێکی گەورەی بە ڕەوەندایەتی مابۆوە[101]. لەو هەل و مەرجەدا خەڵکی وردە وردە بژێویان باشتر بوو، کەریم خانیش خزمەتێکی زۆری خەڵکی دەکرد و بواری بۆ خەلکی دەرەخساند بۆ کشتوکاڵ کردن و ئاژەڵداری[102].

سەرچاوە مێژوویەکانیش گەواهی دەدەن کە هەرچی ئابووری زەندیەکانە لەسەر کشتوکاڵ و ئاژەڵداری بەن بووە، ئەو ئاژەڵداریە بەچەشنی کۆن تیادابلاوە، بەلام کاتێ (کەریم خانی زەند) شیرازی کردە پایتەختی دەسەلاتەکەی، لەڕێگەی کارگێڕی و حوکومڕانەکانی بەردەستی گرنگی دا بە مەسەلەی کشتوکاڵ کردن، ئەوەش لەڕێکەی دابەشکردنی زەوی و زار و پەیداکردنی کرێکارو تۆو چاك کردنەوەی ڕایەڵەی ئاو دێری، هەروەها خۆی چاودێری کۆکردنەوەی بەرهەم و داهاتی دەکرد[103]. بۆیە لەسەردەمی کەریم خاندا کشتوکاڵ بەشێوەیەکی یەکجار زۆر بەرەو پێش چوو گەشەی زۆر زیاتری سەند بەجۆرێك دەغل و دانەوێڵەو توتن و تریاکی کازروون شەرابی شیراز و میوەی وشك کراو هەم بۆ ناوەخۆو هەم بۆ دەرەوە بەرهەم دەهێنران[104]. نیبور دەڵێ : کەریم خان سکەی بەناوی خۆیەوە لێدا بوو : وە داهاتی بنەماڵەیەی خانەدانی حەوت نەفەری لەو سەردەمەدا ئەگەر یەك نەفەر ئیشی بکردبایە لەیەك ساڵدا نزیکەی دە تومەنی کۆ دەکردەوە واتە پێنج سەد مارك زێڕ بەو مەبلەغە

دەیتوانی بەشێوەیەکی سادە بژی بەراحەتی [١٠٥]. ئەگەرچی میرنشینی ئەردەڵان و بنەماڵەی زەندیەکان، هەردووکیان لە ڕووی ئاستی ئابووریدا خاڵی هاوبەش و جیاوازیان هەیە، هەردووولا ئاستی ئابووریان لەسەر کشتوکاڵ و ئاژەڵداری بەند بووە بەتایبەت میرنشینی ئەردەڵان بەڵام هیچ پەیوەندیەکی گۆڕینەوەی شمەك و ئاژەڵداری لە نێوانیان دا ڕووی نەداوە، ئەوەش لەبەر خراپی پەیوەندی سیاسی و سەربازی لە نێوانیان بەجۆرێك گرژی کەوتۆتە نێوانیان، ڕەنگدانەوەی هەبووە لەسەر پەیوەندیە ئابووریەکانیشیان [١٠٦].وە بێ گومان ئەو ئاڵۆزیە پەیوەندیەی سیاسی نیوان زەند و ئەردەلان کاردانەوەیەکی خراپی کردبووە سەر هەردوو لا و سەر رەوتی ئابووری و بازرگانی لەنێوانیان ئەم کارتێکردنەش ئەنجامێکی نەرێ ی هەبووە، هیچ کامێکیان سودی ئابووری و بازرگانی کۆمەلآیەتی و ڕۆشنبیریان لە یەك نەکردووە.بەشێوەیەکی گشتی باج و سەرانە هەبوو لەسەر خەڵکی، وتیاران لەسەریان بوو بە دووجۆر پیتاك بدەن بە دەوڵەت یەکەمیان دەبێ سێ یەك لە بەرهەمی ساڵانەیان بدەن بە حکوومەت یان خاوەن زەوی دووەم : ئەوانەی تەمەنیان لە نێوان بیست تا پەنجا ساڵ بوو دەبێ سەرانە بەدەوڵەت بدەن، پیاوانی ئایینی و خانەدانەکان لەسەریان نەبوو باج بدەن [١٠٧]. کەریم خان ی باجی لەسەر ئەرمەنەکان سوك کرد چونکە بازاڕی ئێران لەدەست ئەرمەنەکان بوو [١٠٨].پرویز رەجەبی لەکتیبەکەیدا ئاماژەدەکات و دەڵێ: گرنگترین و باشترین شت لە کشتووکاڵی گەنم و برنج و جۆ بوو، جۆ بۆ ئەسپ و ولآخ بەکار دەهات ' گەنم دەکرا ئارد هەر ماڵێك و تەنووری خۆی هەبوو ڕۆژانە نانیان درووست دەکرد [١٠٩].

دانیشوانی کوردستانی ڕۆژهەلآت بەشێوەیەکی گشتی وێڕای کاری کشتوکاڵی و ئاژەڵداری بەپێ ی سروشتی ناوچەکە وجۆری پێداویستیەکانی ژیانی ڕۆژانە و

هەروەها وەك نەریتێکی کۆن کە بەمیرات بۆیان بەجێ ماوە: لە پیشەگەری و هونەری دەستی جۆراوجۆریشدا تا رادەیەکی زۆر وەستاو کارامە بوونە، جۆری پیشەو چۆنیەتی کاری پیشەگەری لەکوردستانی رۆژهەلاتیش هەروەك هەرێمەکانی تر پێوەندیەکی چڕو پڕی لەگەل سروشتی ناوچەکە و پێداویستی ژیانی رۆژانەی دانشتواندا هەبوو.هەرچۆنێك بێ لەناو عەشیرەتەکاندا پیشەسازی وەك دارتاشی و ئاسنگەری و جۆلایی و کەپەن و رایەخ و چنینی جل و بەرگیش باو بووە، ئەوان دەیان توانی شت ومەکی خۆیان لە رێگەی گەرمێن و کوێستان یا لە دەورووبەری هەوارگە بفرۆشن (ئالَ و گۆڕی) پێ بکەن وە لەبەرامبەریشدا پێداویستیەکانی ژیانی رۆژانەی پێ ی دابین بکەن [110]. لەهەمان کاتیشدا پیشەگەری تری هەمەجۆر زۆر بوو وەك:، شمشێر،تیروکەوان ومەتالَ و گورز و رمب و زرێ و کلاو خود هەرچی ئامرازی شەڕە درووست دەکرا، وەك بەرهەمی کارخانەکانی مەراغە و قەزوێن و کرمان : وە گرنگترین بەرهەمەکانی کارگاکانی شیراز بون لوولەی تفەنگی پلیتەدار و سەرنێزە و دەمەشمشێری پایتەخت لەسەرانسەری کەنداوی فارس بازاڕی گەرم بوو [111]. ئەو خەنجەرانەی بەکاریان دەهێنا مۆریان لەسەر بوو [112].وە جوانترین شووشە لەو سەردەمەدا بەدی دەکرا کە رەگاو رەنگی خۆی دەنواد وك دەفرو قوتوی شوشەیی بۆ خواردنەوە بەکاردەهات [113].لەماوەی فەرمانڕەوایی زەندیەکان شاری (خوێ) لە رووی بەرهەم هێنان و دروست کردنی حەریر، گولاوو عەتر،گرینگیەکی یەکجار زۆرو بەهەمان رادەش کاریگەریەکی دیاریشی لەسەر باری ئابووری ولاتی ئێراندا هەبووە، وە بەدرێژایی چەندین سەدەی رابردوو رایەخ و کەپەن و پیستی ئامادەکراوی خێلی زەنگەنە و هەروەها چینینی رەشمالی گەورە کە بەرهەمی پەنجەی چنانی هونەرمەندی خێلەکانی زوولە و جەموور و تورکاشوەندی

کرماشـانە گرینگیـەکی تایبـەتیان بـە بەرهەمـە پیـشەسازیەکانی ئـەم ناوچـەیە بەخشیوە [114].کوردستانی (سنە) یەکێ لە حەوت شارە گرنگەکانی ئێرانە، کە لە رووی بەرهەمهێنان و پیشەی تەون و چنینی فەرش هەڵگری ناونیشانێکی بەرزە، رایـەخی سـنە لـە ئـەورووپا زۆر جـێ ی پەسـەندە،وە بـە پـێ ی "بارتۆڵـد"[115]: فەرش و رایەخی کرماشان هەر لـە کۆنـەوە داواکـاری زۆری هـەبووە[116].گومـانی تێدا نیە بەهۆی نەبوونی ئارامی وئاسایش و سەرهەڵدانی شـەڕو کوشـتار لـەدوای کەریم خانی زەند کاریگەریەکی زۆری کردە سەر باوو دۆخی ئـابووری کوردسـتان و بۆیە دەکرێ بڵێین لایـەنی پیـشەگەری لەکوردسـتانی رۆژهـەڵات لەسـەردەمی زەندیەکان بوارێکی باشی بۆ نەرەخسا تا زیاتر بەرو پـێش بـچێت بـەڵام باسمـان کرد کە توانیویانە هەموو پێداویستیەکانی ژیانیان تـەرخان بکـەن و لـە ئەوپـەڕی خۆشگوزەرانیدا بمێننەوە و بە ئاسوودەیی گوزەربکەن و کشتو کاڵ بکەن.

ب / بازرگانـــــــــی

لەوانەیە هۆکاری گرینگی دانی کەریم خان بە ئەمنیەت و ئاسایشێکی پتەو، بۆ بەهێزکردنی بازرگانی ئاڵ و گۆڕی پەیوەندیەکان لە رێگای بازرگانی پتو بکـات و وڵات بەرەو پێش بەرێ، وە هۆکاری درووست کردنـی شـوێنی حەوانـەوەی زۆر و رێگـای سـەرەکی و شـوێنە سـەختەکان و درووسـت کردنـی پـرد و چـاکردنەوەی رێگاکان کە لە دوایدا باسی لێوە دەکەین، یەکێ لەهۆکارەکانی ئەو کارانەی رێگـا خۆش کردن بووە بۆ ئاسان کردنی پەیوەنـدی هاتووچـۆی بازرگـانی. جـا ئێـستا ئێمە ئەوە دەخەینە روو کە کەریم خان چۆن چۆنی گرنگـی بـە لایـەنی بازرگـانی داوە لەگەڵ وولاّتانی دەورووبەرو ناوەخۆدا.ئەگەرچی کارگە گەورەو ناوەندەکانی بازرگـانی :ئێـرەوان و گەنجـە، تفلـیس. مـەرو، مەشـەد و هـێرات کەوتبوونـە

دەرەوەی بازنەی دەسەلاتی وەکیل دیسان پەیوەندیان لەگەلْ پاشماوەی خاکی ئێران دانەبڕاو بوو، ریْ خۆش بوون و گەشەی بازرگانی لەپایتەختی کەریم خان دەگەڕایەوە سەر لێهاتوویی کەریم خان سەبارەت بە برەوی بازرگانی، وەك گێڕاویانەتەوە ئەو دوکان و شوێن حەوانەوایانەی کە کەریم خان درووستی کردبوون مانگانە کریْ یەی کەمیان دەدا، هاوردەکان و هەناردەکان نزیکەی لە سەدا حەوت بوو، بازرگانە ئوڕووپییەکان سەدا سیْ بان لەسەر بوو [117].کونسولی فەرەنسا لەبەغدا لەنامەکەیدا کە لە سالْی ١٧٦٢ز بۆ پاریسی ناردبوو، لەبارەی کەریم خانەوە دەنووسیْ "لەژێر ڕابەرایەتی کەریم خان کە خاوەن دەسەلاتێکی کەیی و ئاکارێکی زانایانە، وادیارە ولاْت ڕووی کردۆتە گەشەکردن و و توشی هێمنایەتی و دامەزراوی بووە، ئاسایش و هێمنی جێگای ئاژاوەو شەڕو هەرای گرتۆتەوە "وە پاشان ئەینوسیْ: (ڕێگاکان ئەمین بوونەتەوە،بازرگانی دەستی پێکردۆتەوە زۆرکاروان لە بەغداوە دەچنە ئێران،وە(١٥-٢٠)هەزار مالْی ئێرانی پەنابەریان بۆ عێراق هێنابو ئێستا بەرەبەرە بۆ نیشتیمانی خۆیان دەگەڕێنەوە)[118].کەریم خان بۆ گەشەسەندی هاتووچۆی بازرگانی دەرەوە دوو هەنگاوی نا:یەکەمیان لەگەلْ ئاسایشی ناوخۆ هەولْیدا ئاسایش لەخەلیجی فارس ڕێکبخات دووەم: بۆندی بازرگانی ڕێکخست بەتایبەتی لەگەلْ ئینگلیستان [119]. شاری تەورێزیش سەرەڕای ئەوەی کە یەکێك بوو لەناوەندە هەرە گرینگەکانی گەیاندن لەگەلْ ولاْتانی ڕوسیاو عوسمانی بۆ گواستنەوە وئالْ و گۆڕکردنی هەموو جۆرە کالاْیەك لە باکووری ڕۆژاوای ئێران لەهەمان کاتیشدا یەکێك بووە لە لەناوەندە گرینگەکانی کڕین و فرۆشتنی دیلەکانی (گورجی) هەروەها جام و شوشە بۆ دەرەوەش هەناردە دەکرا [120]. بەو جۆرە ئێران سەرگەرمی بازرگانی و بەرووبوم ناردن و هەموو لایەك خەریکی بوون بازاڕ گرووو تینی پێدرایەوە دیارە

ئەو چەشنە تەشەنە جۆرێکە لە ڕێنسانس چونکە بەتەواوەتی جیاوازی هەبوو بە بەراورد لەگەڵ سەردەمانی پێش کەریم خان.

وەپەیوەندی بازرگانی لەگەڵ زۆربەی وڵاتاندا هەبوو وەك: هیندستان زۆر لەو شتانەی کە لە هندەوە دەهاتنە ناو خاکی ئێران پارچە قوماش (مەلمەل،پەشمی) و (شەکری لاهور و بەهارات)،لەگەڵ کەل و پەلی چینی قاپ و قاچاخ، لە ڕووسیا (چەرم) لەگەڵ قوماشی (لۆکە) دەهات،لە هۆڵەندا پارچەی (مەخمەل و ئەتلەس) و پێستی حەیوان دەهات بۆ درووست کردنی پێڵاو جۆری ئاوێتە کردن بەکاردەهات.لەتورکیا هاوردە کەم بوو بەڵام لە عێراق پەیوەندی بازرگانی خۆش بوو ئازووقەدەهات وەك برنج [121].گژوگیای خۆرسکی و پزیکی و پیشەسازی و سامانی سروشتی وەك "گەزۆ، بنیشت، کەتیرە، گیا سالمە هەروەها پێستی سمۆرەی ئاوی ئەوان بازرگانیان لە کوردستان پێ کراوە، کەتیرە (سمغ) بایەخێکی تایبەتی هەبوو لە کاروباری بازرگانیدا، ئاڵ و گۆڕی شت و مەکیش لەناو عەشیرەتە کۆچەرەکان بەڕادەیەکی بەرچاو گەشەی کردبوو،هۆی سەرەکیش هەبوونی بەرهەمی (شیرو گۆشت و پەنیر و پێست و خوری و کەرەسەی خاویان زۆر هەبوو بەو هۆیە ئاڵ و گۆڕی بەردەوامیان پەیدا کردبوو[122].لەکۆتایدا دەکرێ بگوترێ کوردستانی ڕۆژهەڵات بەدرێژایی سەدەکانی ڕابردوو وێڕای دابین کرنی پێداویستیەکانی ناوخۆیی هاوکات کۆگایەکی گەورەی دەخل و دای وڵاتی ئێرانیش بووە کە هەمیشە لە کاتی تەنگانە و پێویستی و تەنانەت لەشەڕو ئاشتیشدا ڕوویان تێکردووە، دەبێ ئەوش بزانین کە هەمیشە کۆمپانیای بریتانی هیندی ڕۆژهەڵاتی هەمیشە هەوڵی پتەوی پەیوەندی بازرگان داوە لەگەڵ ئێران بەڵام بە ئەنجام نەگەیی یە لەبەر دابڕانی پەیوەندیەکانی هەردوولا[123]. کەریم خان ڕێگەی بە دامەزراندنی کارگەیەکی

ئینگلیسی دا لە بوشهر لەساڵی ١٧٦٢ ز ئەمە وای کە پەیوەندی کەریم خان لەگەڵ وولاتانی تر بەهێز بێت لە ڕووی بازرگانیەوە [١٢٤].کەریم خان بۆ کۆنترۆل کردنی ڕێگا بازرگانیەکان لە دزو جەردەکان لەلایەن حکوومەتی کەریم خانەوە کۆنترۆل دەکرێ بۆ بازرگانان تەنانەت ئەوناوچانەی لەژێر کۆنترۆلی حکومەتی کەریم خان دابوون [١٢٥].کەواتە وا دەرکەوت بەدرێژایی فەرمانڕەوایەتی زەندیەکان کوردستانی ڕۆژهەلات تا ڕادەیەکی بەرچاو داواکاریە ئابووریەکانی خەڵکی جێ بەجێ بکات بەلام بازرگانی کوردستان بەشێوەیەك بەرهەمهێن نەبووە ئەوەی لەگەڵ ولاتانی دەرەوە کردوویەتی هەمووی بەیارمەتی دەسەلاتدارانی (فارس و تورك و عەرەب) بووە، جا بۆیە پێشکەوتنێکی بەرچاوو بەردەوام بەخۆو نابینێ، بێ گومان کەریم خانی زەند ڕۆلیێکی گرنگی بینی لە پەرەپێدانی ژێرخانی ئابووری بۆ ولاتەکەی هەلسوکەوتی لەگەڵ خەڵکی گونجاو بووە، خەڵکی لەسەردەمی ناوبراودا لەخۆشیدا ژینیان بەسەر بردووە، تاڕادەیەك دەتوانین بڵێن سەردەمی کەریم خانی زەند لەماوەی دەسەلاتی فەرمانڕەوایەتی ئەودا بە سەردەمی نوێ بوونەوە ناودبرێ لە زۆربەی بوارەکان بەتایبەت ئابووری.

## ب/ لایەنی ئاوەدان کردنەوە

لە فەرمانڕەوایەتی کەریم خان جگە ئازادکردنی شارەکان و بەرگری کردن لەشار و گرینگی دان بە لایەنی کشتوکاڵ و بازرگانی، گرنگی بە لەچەندین لایەنی تری ژیان دا لێرەدا گرنگی بە وەکیلایەتی خۆی دەدات جا ئێمە زیاتر ئەم بابەتە بەگشتی دەخەینە ڕوو کە لە ڕووی ئاوەدانکردنەو وڕازاندنەوەی پایتەخت، بە دروستکرنی ڕێگاو بانەکان و قەلاو شوێنەوارەگرنگەکان دەخەینە ڕوو کە کەریم خان لە ماوەی حوکمڕانی خۆیدا درووستی کردوون بۆ مەبەستی جۆراو جۆرو

ڕاکێشان و درێژە پێدانی فەرمانڕەوایەتیەکەی لە ئێران و ئەوانەش هەموو بەڵگەیەکی ئاشکران لەسەر بوونی حکوومەتێکی جوامێرو بەدەسەڵات.بەر لە بەدیارکەوتنی کەریم خان هەر لەسەردەمی شاعەباسی گەورەوە کە گرنگی بە پایتەخت دراوە و چەندین باڵەخانەو قەڵاو شوێنی گرنگ بنیات نراوە تا هاتنی کەریم خان بەم پێ یە کەریم خانیش پاش چەندین ساڵ کە لەساڵی ١٧٦٥ز پێ ی نایە شیراز و توانی لێرەدا وەك یەکە حوکمڕانی بەشی هەرە زۆری ئێران دەست بکات بە نویٚ کردنەوەو ئاوەدان کردنەوەی پایتەختی هەڵبژێردراوی خۆی، یەکەمین خاڵ سەرنجی کەریم خانی ڕاکێشابوو چۆنیەتی هەل و مەرجی قەڵا و شوورەی شار بوو، چونکە لە سەردەمانی ئاڵۆزی هاتنە سەردەسەڵاتی کەریم خان بەتایبەتی لەسەر دەستی ئەفغانیەکان و نادر شا لە ئیراز دوو منارەیان لە کەللەی خەڵکی دروست کربوو[١٢٦].بەو جۆرە یەکەمین هەوڵی کەریم خان دوای کردنە پایتەخت، بڕیاردانی ئاوەدانکردنەوەی سەرتاسەری شیراز کە وڵاتێکی کاوڵ و وێران بوو، بۆ ئەوەی حکوومەت و پایتەختەکەی پتەوو بەناوبانگ بێت و خەڵکی بخاتە خۆشگوزەرانیەوە [١٢٧].کەریم خان بۆ پاراستنی پایتەخت دوازدە بنکەی چاودێری سەربازی لە دەورووبەری شار دامەزراندو شارەکەی لە ٩ دەروازەوە کردە شەش دەروازە کە بریتی بوون لە دەروازەی (اسفهان، سعی، قەسابخانە، شاداعی،کازروون و باغی شا [١٢٨].بۆ مەبەستی قایم کردنی شار جگە لەو بنکە سەربازیانە دوارێکی سەخت و پتەوو قایمی لە دەوری شیراز درووست کرد کە بیست و پێنج پێ بەرز بوو دە پێ پان بوو، وەلە پشت دوارەکە خەندەقی درووست کردوو لەگەڵ بنکە چاودێرەکان پەیوەستی کرد، ئە کارە لە بەهاری ١٧٦٧ز دەستی پێ کردوو لە ١٧٦٨ ز تەواوو بوو دوای ساڵێك

.هەروەها دوای ئەوە (ارگ)[130] قەلاّ و قەسری لە قۆڵی باکووری شیراز بنیات نا، وە تا ئێستاش ئەو قەلاّ یە قایم و پتەو بە پێوە ڕاوەستاوە [131].[129]

ئەرگی کەریم خان لە ژێر ناونیشانی شوێنی حەوانەوە یاخود شوێنی ژیانی وەکیل درووستی کرد بە (ارگ کەریم خان ناوی چۆتە لاپەڕەکانی مێژووی ئێران درووست کردنی ئەو قەلاّیە لە نێوان ساڵانی ١٧٦٧-١٧٦٨ز ئەنجام درا، وەباشترین و کارامەترین وەستاو کرێکارو هونەرمەند و کاشی کارو وێنەگرانی پارێزگاکان هێنرابوون بۆ درووستکردنی [132].

ئەو وەستاو کرێکارانە لە دەرەوەی شیراز هێرابوون، هەڵبژاردنی کەرەستەی پێویست وەك (بیجادە)[133] (مەرمەڕ) وە هەروەها چەندین جۆری تری بەردی جوان کە لەکانگاکانی یەزد و تەورێز هێنران، دیوەخانی کەریم خان کەوتبووە لای باکووی ڕۆژهەلاّتی مەیدانی قەلاّکەوە، چەندین هۆڵی تایبەت بۆ زوڕنا ژەنەکان ئامادە کرابوو کە هەموو سبەینان و ئێواران دەبوایە بیان تووراندبا، وە لە سوچێکی مەیدانەکە حەمامێکی تایبەتی وەکیل درووست کرابوو [134].

هەر لەشیراز چەندین مزگەوت و بازاڕی گەورەی درووست کرد کە بنمیچی ئەو بازاڕو قەلاّیانە زۆر قایم بوو تاکو ئێستا بازاڕەکان وەك خۆیان ماون [135].

ئەو بازاڕە گەورەیەی کە بە فەرمانی کەریم خان درووست کرا هاوکات لە گەڵ قەلاّکەی بنیات دەنرا،بازاڕەکە لە قەلاّکە نزیکە، شوێنەواری هەڵکەوتەیە لە خشتی سور ساز کراوە بنمیچی بەتاق و گوڵ و کەوانە نەخشێنراون، درێژیەکەی نزیکەی نیو میل دەبێ پانیەکەشی پانزە مەتر دەبێ، شەوانە کەچراکانی پێ دەکرێن دیمەنێکی زۆر جوانی هەیە چەندین کاروانسەرا کە بریتی بوو لە چایخانەو بارخانە و نوسینگەی بازرگانی پێك هاتبوو کە بەفەرمانی وەکیل بنیات

نران، ئەو کاروانسەرایانەش لە دەروازکانیش درووستی کردبوون بۆ گەشتیاران و بازرگانان [١٣٥].

لەو کات و ساتەدا کەیم خان سەرگەرمی ئاوەدانکردنەوەی شیراز بوو، لەمەرکەزی شاردا حەمامێکی تایبەت و گەورەی درووست کرد نزیك قەلاّکەی خۆی ئەوە بەناوی حەمامی وەکیل ناو نرا کە هەر بۆخۆی سوودی لێ وەردەگرت [١٣٦].

ڕەنگە باشترین شوێنەوای بەجیّ ماوی کەریم خان مزگەوتی وەکیل بیّ کە بازاڕوو باخەکانی پێکەوە بەستاوەتەوە، ئەو مزگەوتە هەر ماوەیەك دوای درووست کردنی ارگ ی خۆی بنیاتی نا لە شوێن مزگەوتێکی کۆن و لێرەدا شیراز بەشاری گوڵەکان ناسرا [١٣٧].

ئەو مزگەوتە یەکێکە لە جوانترین و سەرنج ڕاکێشترین شوێنەوارەکانی کەریم خانە کە گرنگیەکی تەواو بە شیراز دەبەخشیّ، ئەویش هەر بە دەستوورو فەرانی کەریم خان درووست دەکریّ [١٣٨].بەگوتەی فرانکلین : وەکیل لەچوارچێوەی ئەو مزگەوتە بیری درووست کردنی خانووبەرەی جوانی هەبوو. کە قەراربوو فەقیّ و مەلا و پیاوانی ئایینی و دەروێش لیّ ی دابمەزرێنیّ بەلاّم بواری نەبوو، بەلاّم خانەقای (شامیر هەمزە) شی سازکرد، کە ڕەحیم خانی کوڕی لەویّ نێژرابوو. [١٣٩].

هەروەها زۆر باخ و باخچەی ڕەنگاو ڕەنگ و سەرنج ڕاکێشی هەبوو وەك باخی (نصر) کە چەند بینایەیەکی تێدبوو بۆ میوانداری دەرەوە،کە کەریم خان وەسیەتی کردبوو لەو باخە بنێژریّ بە بیناکە دەوترا (کلاو فەرەنگی) سەرەنجام هەر لەوێش نێژرا [١٤٠].

جگە لەو باڵەخانانە وەکیل چوند پرۆژەیەکی ئاوو ئاوەڕۆی درووست کرد، ڕێگاو بانەکانی خۆش کرد پەرەی بە شوێنی حەوانەوەی کاروانـەکان دا. چەندین گۆڕی پـیاو چاکانی نـۆژەن کردەوە و گرینـگی بە نوێکردنەوەی تـاق و دیوارەکۆنەکان دەدا (١٤١).

ئـەوەی لێـرەدا ڕوون و ئاشـکرایە ئامـانجی کـەریم خـان نـویٚ کردنـەوەی پێشکەوتنی شاری شیراز بووە یەکێك لە باشترین و بەرچـاوترین شـوێنەوارەکانی کەر یم خان سازی کردوون زۆربەی بینەران سەرنج دەدەنە شێوازی بنیـات نـانی قەلاّو باڵەخانەکان و توندی بیایەکان و شێوازی کارکردنی وەسـتاو کرێکارەکـان، هەرچەندە چەندین جار بەر شالاّوی هێرشی نـادر شـاو ئاغـا محمـد خـانی قاجـار کەتووە، بەلاّم بە هۆی کارامەیی و فکـرەی کـەریم خـان ئـەم خزمەتگوزارانـە بـە باشی خۆی ڕاگرتووە و بەلاّم کورتی تەمنی ژیانی کەریم خـان بـواری نـەدا زیـاتر پەرە بە شاری شیراز بـدات،لەهـەمان کاتیـشا لـەماوەی دەسـەلاّتەکەیدا چـەندین شوێنەواری گـرنگ تـا ئێـستا مـاون و بەڵگـەدارن، بـیٚ گومـان بـەهۆی لێهـاتوویی کەریم خان و بـەرزی پلـەی ئـابووری و ئـەمن و ئاسـایش تـوانی ولاّتـی خـۆی بـە چـــاکترین شێواز و لەپەڕی بەهێزی بەڕێوە بەریٚ.

ب/ دادگـــــــەری

دەربارەی مێهرەبانی، ساکاری، دلاّوایی و ڕۆحی دادپەروەرانەی وەکیل قسەو باسێکی یەکجار زۆر هەن،.بیٚ گومان بیرکردنەوەی وەکیل بە بەراورد لەگەڵ فەرمانڕەواکانی پێش خۆی و دوای خۆشی زۆر جیاوازن، لەبەر تایبەتمەندیە چاکەکانی ناوبراو وەکیلێکی چاك بوو کە خەڵکی ولاّتەکەی بە ڕاستی ڕێزیان لیٚ دەنا و خۆشیان دەویسست، وە ڕەنگە زۆرێك لەم داستانە لە ڕۆژگاری ئێمەدا بکەونەبەر شەپۆڵی نا ڕەزامەندی یان لایەنگرانی قاجارەوە بە هەڵبەستراوی لیٚ

زیاد کراو دابندرێن و ناڕاستی بخەنە لاپەڕەکانی مێژووی زێرینی کەریم خان، بەڵام بێ گومان زۆرەملێ و بێ ڕوحمیەکانی نادر شا و ئاغا محمد خانی قاجار پلەی پیاو چاکی کەریم خانیان بەرز کردۆتەوە، زۆرێك لە کارو چاکەی کەریم خان هەن لەگەڵ بەڵگەنامەکانی مێژوویی یەکتری دەگرنەوە کە ئۆباڵ بۆ داوەری نەوەی دوای وەکیل دەکێشن، جا لێرەدا ئەوەی لای ئێمە گرنگە بەگشتی دڵ نەرمی و جووڵانەوەو دادوەریانەی کەریم خانی زەندە بەرامبەر بە خەڵکی و مەزهەبەکان.

کەریم خانی زەند لەقسەکردندا ڕەوانبێژێکی بێ هاوتا بووە، سێرجان مالکوم چەندین داستان و نموونەی دڵپاکی وەکیل دەخاتە ڕوو،وەکیل زۆر ڕقی لە دوو ڕوویی و ڕیابازی هەڵدەستا [١٤٢].هەرچەندە کەریم خان خوێندەوار نەبووە بەڵام زۆر لێهاتوو بوو لە شێوازی قسکە کردن و مامەڵەکردن، لێبووردەیی ناوبراو گەیشتبووە ئەندازەیەك کە زۆرجار کە تاوانباران ئەیانزانی هیچیان بۆ ناکرێ خۆیان ئەهاوێشتە لای، دادپەروەری و حەکیمایەتی کەریم خان لەگەڵ توندو تیژی زەی خانی برای ڕێك و پێکیەکی جوانی خستبووە ئێرانەوە [١٤٣].

بەو جۆرە کەریم خان گرنگیەکی زۆری دا بە لایەنی دادپەروەری بۆ ڕاگرتنی ڕژێمی کۆمەڵایەتی هەرچی پێویست بووە بەجێ ی هێناوە فەرمانڕەوایەکی بیرتیژو گیان سوك وئازاو دوور ئەندێش بوو [١٤٤].وە یەکێ لە داب و نەریتی کەریم خان ئەوە بوو کە هەموو ڕۆژێ چەند کاتژمێرێکی بۆ بیستنی شکایەتی خەڵکی تەرخان کردبوو [١٤٥].

زۆر حیکایەت هەن کە دەلالەت لەسەر میهرەبانی کەریم خان دەکەن : یەکێ لەوانە ڕۆژێك کابرایەك پەشۆکابو بووو هاوار هاواری بوو،وەکیل وتی کابرا بۆ وا شێواوی ؟ وتی ئەو شەو کاروانەکەیان دزیم هەر لەماڵی خۆم وەکیل بە

توورەیـــەوە وتـــی ئـــەی بـــۆ خـــەوتی ؟ وتـــی واتـــێ گەیـــشـــتم کـــە تـــۆ بەخەبـــەری،کەریم خان ئەو وەلاَمـــەی بـەدڵ بـوو دواتـر قـەرەبووی مـــاڵەکەی کـردەوە [١٤٦].ئـەوەش ئـەوە دەگەیـەنێ کـە کـەریم خـان هەمیـشە بـەئاگا بـووە لەکاروباری ناوەوەی ولاَت.

لەبەر ڕەوشت بەرزی و دادپەروەرانەیەکی بێ وێنەی وەکیل لە تەواوی ئێران قسەو باسی چاکەو کردەوەکانی وەکیل بوو[١٤٧]. زۆر حیکایەت هەن لەسەر میهرەبانی و دادوەرانەی وەکیل لەسەرچاوەکان باسی لێوە دەکەن ئەڵێن جارێك کەریم خان خەریکی درووست کردنی مزگەوتێك دەبێ لە شیراز خۆی بەسەر وەستاو کرێکارەکان وەستابوو، لە مەجالێکدا ڕاکشاو (قلیان) واتە نێرگەلە بانگ کرد و ئەیکێشا، لەو کاتەدا بینی کرێکارێکی ڕووت و قوت سەیرێکی وەکیل ی کردوو سەری بەرز کردەوە بۆ ئاسمان و لێوی ئەجوولاَت وەك بڵێ ی شتێکی ئەوت، وەکیل بانی کرد بۆ تێ گەیشت لە بۆڵە بۆڵە : چونکە لەبەر خۆیەوە سێ (کەریم) ی پێ کەوە هەڵسەنگاند،وتی : ئەوە چواتای چی بوو؟ وتی: واتا خوداوەندی کەریم و دلاَوای ئاسمانان و کەریم خانی وەکیل کە خوا قلیانێکی ئاوای داوەتێ و خۆشی کە "کەریم "ێکی ڕووتە، کابرای لاواندەوەو بەشداری لە هەڵمژینی قلیانەکەپێ کرد و و قلیانە گرانبهاکەشی دا بە کرێکارەکەو وتی هەرزان مەیفرۆشە دواتر هەر لەلایەن پیاوێکی وەکیل قلیانەکەی لەو کەسە کڕیەوە کە کرێکارەکە پێ ی فرۆشتبوو [١٤٨].

کەریم خان دادگەری خۆش دەویست ئەو خەڵکەی کە دەهاتنە بەردەستی ڕازی دەکردن و هەمیشە خۆی بە جێگر دادەنـا خـەڵکی هەرچی کـەریم خـان حـوکمی پێدان تا ڕادەیەك ڵگران نەدەبوون وایان دەزانی ڕۆژێ یـەت کـە لـــێ ی خـۆش دەبێ [١٤٩]. وادیارە کەریم خان دادگەرترین دەسەلاَتدار بووە کە سەری هەڵدا لـە

مێژووی ئێران كە ئەوروپییەكان پێ ی دەڵێن (شای چاك ) كەچی كەریم خان ئەو نازناوەشی هەڵنەگرتبوو [١٥٠].

كەریم خان لە دادوەری و ویژداندا بێ هاوتابوو دەمارگیری مەزهەبی لەگەڵ مەزهەبەكانی تر نەبوو وەك:گاور، جوولەكە، ئەرمەنی، كە لەسەردەمی وەكیلدا زۆر بە سەربەستی و ئازادیئەژیان چونكە ئارەزووی نەبوو خۆی لەكەس بە بەرزتر بزانێ هەمیشە لە هەوڵی بڵاو كردنەوەی دادپەروەری بوو [١٥١]. بەو جۆرە ئێستاش لە نێو خشتەی ناوی دەسەڵاتدارانی ئێراندا تەنیا ناوی كەریم خان بەچاوێكی خۆشەویست و دەسەلاتێكی دادپەروەر لەسەردەمانی رابردوو سەیر دەكرێ كە مرۆڤ پەروەری ئەو ناوبانگی چاكترینە كە ستەم زۆر بووە لە ناوچەكانی تری دەوروبەی [١٥٢]. چونكە لەماوەی دەسەلاتیدا بە دادپەروەرانە هەوڵی داوە یەكسانی دادپەروەری فەراهام بكات و ژیانێكی خۆش بۆ خەڵكی دابین بكات و هیچ كاتێ بەرزەفڕ نەبووە فریوی نەخواردووە بۆ ناوبانگی پاشایەتی و خۆ زاڵ كردن و چەوسانەوەی مەزهەبەكان تر [١١٥٣].

لەكاتی دادگا كردنی تاوانبارێك یا خاوەن كێشەیەك كەریم خان خۆی لەدادگا دادەنیشت و گوێ ی دەگرت و سەیری خاڵەكانی كرد بۆ ئەوەی كەس هەقی كەس نەخوا بەڵام ئەوە كەم ڕووی دەدا مەگەر پاوە خانەدانێك یا كێشەیەكی گەورە یا دەوڵەمەندێك كێشەی هەبووایە نەی دەهێشت سەروەتی بڕوا و یان رزگاری بكات لەسەر ئەو حوكمە زۆرەی لەسەری دادەنرا [١٥٤].

بەو جۆرە كەریم خان لەبەخشین و لێبووردەیی یەوە بوێرێكی باشی هەبوو، ئەوكەسانەی كە لە شتێك بەخشران دواتر زوو بەرەڵای نەدەكرد بەڵكو وای لێ دەكرد كە جێ ی باوەڕ بن و متمانەیان بەخۆ هەبێت، و بەخۆی دەبەستاناوە، حەزی كردووە هەموو خەڵكی لەخۆشیدا بژی و بەو جۆرە لێ خۆشبوونە هەرگیز

نەی گەیاندۆتە ئەو دۆخە کە کار لە بەڕێوەبردنی دەسەڵاتەکەی و حکوومەتەکەی بکات [١٥٥]. وادیاربوو کە ئەو سیستەمە بەڕێوەبرنەی وەکیل و ئەو جۆرە دادپەروەریە جارجار هەندێ لە میرو سەرداران یاخی دەبوون، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا هەر ستەمی لێ نەکردوون و دادپەروەر بوو لەگەڵیان ئەوەی زۆر زۆر پیاو خراپ نەبوو بێت لەناوی نەبردووە، بەو جۆرە ئێرانی لە یاخی بووان پاك کردەوە [١٥٦]. لەگەڵ ئەو هەموو کاروبارەشدا کەیف و نەهەنگی تایبەتی وەکیل خواردن و خواردنەوە کۆمەڵێك ڕابواردن هەبوون کە باو بوو لەو سەردەمە خاڵی هاو بەشی تێکڕای میرانی رۆژهەڵاتە، جاری وا هەبوو تا بەیانی لەڕابواردن و خواردنەوەدا بوو، بۆ جوت بوونیش ویشکە سوێ بوو، هەتا ساڵێك بەر لە مردنی تەمەنی لە هەفتاو نۆ دابوو گاڵەی دەهات و سەدو بیست ژنی لە حەرەمخانەی خۆی ڕای گرتبوو [١٥٧]. لێرەدا زۆر جیاوازی باس کردنی کەریم خان لە ڕووی ڕابواردنەوە هەیە، لە کتێبی پەری دەڵێ : وەکیل بە پێچەوانەی پاشاکانی ئەو سەردەمە هەرگیز بەدوای ڕابوارن و پارە کۆکردنەوە نەبووە [١٥٨]. بەڵام زۆر بیرو ڕای پێچەوانە هەیە لەسەر ئەو بابەتە ڕۆستەم ئەلتەواریخ دەڵێ (لەکاتی گرتنی شارێك جوانترین کچی بۆ دەهات دواتر بەخەڵات وەدەرێ ی دەنان) وەچەندین ڕاپۆرتی گەڕیدەکان باس دەکەن لەوانە گەڕۆکی ڕووسی "گێملین"لە١٧٧٦ لە گەیلان و مازەندەران بووە کە ئامادەکراوی لەگەڵ ڕۆحی جوامێرانەو خێرخوازانەی وەکیل یەکتر ناگرێتەوە، بەراستی ئەم گوتانە لەگەڵ زانیاریەکانی ئێمە لە بارەی رەوت و سیاسەتی دوزگای بەڕێوەبەرایەتی وەکیل جیاوازە و یەکتر ناگرێتەوە.جان.ر.پێری دەڵێ دەنگی بیرو بۆچوونیچکی دیکەش لە شیراز هەڵسا کەلانتەر بانگەشەدەکات و کە (ئەخلاقی کەریم خان لە ساڵێك بەر

لەمردنی ڕا گۆڕابوو و کاری وای دەکردن کە لێ ی نەدەوەشایەوە کەسیش پێشتر نەی دی بوون) [١٥٩].

### تـــەوەرەی چوارەم

### سیاسەتی کەریم خان بەرامبەر بەمیرنیشینی ئەدەلان و میراتگرانی کەریم خان ولاوازبوونی دەسەلاتی و هەرەسهێنانی دەوڵەتی زەندەکان ١٧٥١-١٧٩٤ز

#### ١/ هەڵوێستی کەریم خان زەند بەرامبەر بەمیرنشینی ئەردەلان

بەشێوەیەکی گشتی هەڵوێستی کەریم خان بەرامبەر میرنشینە کوردیەکان بەتایبەتی ئەردەلان هەڵوێستێکی جێگیر نەبووە بەڵکو زۆر جار گۆرانکاری تێدا ڕوویداوە بەگوێرەی بارودۆخەکان واتە دەتوانین بڵێین زۆر جار پەیوەندی نێوانیان باش بووە وە زۆرجاریش بەپێچەوانەوە بووە و یارمەتی یەکتریان داوە و پشتگیریان لە یەکتر کردووە بەلام ئەو بـــارودۆخانە بەپێ ی کات و گونجان و سیاسی ئەو دەمە بووە.

وادیارە ســـەردەمی زەندیەکان لەسەرەتا کەریم خان چەندین جار پەلاماری ئەردەلان دراوە شاری سنەش هاتیتە ســوتان ، بەلام لەدوایدا لە لە گرمەی مەترسی گەورەی علی مەردان خانی بەختیاری کە داوای تاج و تەختی شایەتی دەکات، لەگەڵ میری ئەردەلان یەك دەگرن [١٦٠].

سەرەتای دەرکەوتنی ناکۆکی سیاسی لەنێوان میرنشینی ئەردەلان و بنماڵەی زەندیەکان، بەتایبەتی لەسەردمی کەریم خانی زەند دا ئەگەڕێتەوە بۆ ئەوکاتەی کە " حەسەن عەلی خان " (والی کوردستانی) (سنە) بوو لەســەر داوای (میهر عەلی خان) چووە بۆ سەرکووت کردنی کەریم خانی زەند و

دواکەوتنی تا ناوچەی پەری بەڵام دواتر " سەلیم پاشای بابان " هێرشی کردۆتە سەر میرنشینی ئەردەڵان و ئەوسا گەڕاوەتەوە [١٦١].

هاتنی سەلیم پاشای بابان بۆ ناوچەی ئەردەڵان وەك و پەنابەرو دەست تێوەردان لەکاروباری ناوخۆی ئەردەڵان دا حەسەن عەلی خان ناچار بوو بگەڕێتەوە شاری سنە لەشەڕی یەکەمدا لەگەل داروو دەستەی سەلیم خاندا تووشی شکست بوو گەڕاوە سنە لە ١٧٥٠ کەریم خان هێرشی هێنایە سەر سنەو بازاڕ هاتە سووتاندن و وێران کردنی شەقام و باڵەخانەکان [١٦٢].ماه شەرەف لە کتێبەکەیدا ئاماژە بە بەباروو دۆخەکەدەکات و دەڵێ مزگەوت و خوێندنگاکان سووتێنران و بوو بوونە پاشماوەی ئاژەلان [١٦٣].

کاتێك لەشکری ئەردەلان کشانەوە بەرەو ناوچەی خۆیان تاوەکو دژی میرنیشینی بابانیەکان بوەستنەوە کەریم خان بەو شێوەیە وازی لە ئەردەلانیەکان نەهێناو دوایان کەوت و چەندین جار پەلاماریان دان لەقەلای (قراتورا)[١٦٤] زۆریان لێ کوشتن و و کەلو پەلی سەربازی و ولاخ و ئەسپەکانیان لێ گرتن و توانی دەست بگرێت بەسەر گەنجینەیەکی حەسەن عەلی خان و دوو ئێستر زێڕی سپی و یەك ئێستر کە بارەکەی ئەشرەفی بوو، لەگەڵ چەندین بار کوتاڵ و شتی گرانبەها [١٦٥].

پاش تێپەڕ بوونی ماوەیەك دوا ی ئەوەی کە سوڵتانی عوسمانی "سلێمان پاشا" ی بابان لەسەر کار لادەدا و " سەلیم پاشا " دەخەنە شوێنەکەی و"سلێمان پاشا" پەنا دەباتە بەر حەسەن عەلی خان و داوای یارمەتی لێدەکات و ئەو داڵدانە دەبێتە هۆی نیگەرانی عسمانیەکان و تا دواجار والی بەغدا ئاگادار دکرێتەوە کە کە ئەو یارکەتیدانەی سلێمان پاشا ی بابان دەبێتە مایەی

تێکچوونیان لەگەڵ دەوڵەتی عوســمانی و ناچار دەبن لەشــکری سوپای بنێرنە سەر ناوچەی ئەردەلانیەکان [١٦٦].

والی بەغدا سلێمان پاشای کوڕی خالید پاشا ی دانابوو بە حاکمی بابان، وە لەسەردەمی ئەو سلیم پاشایە میرنشینی بابان دیسان هێزی پەیدا کردۆتەوە، سلیم پاشا دووجار بەلەشکری ئێرانەوە چۆتە سەر خاکی بەبە، و هەردووجاریش شکاوە والی بەغداش لێ ی نەدەترسا و شەڕیشی پێ فرۆشتووە و لەشەرەکانیشدا شکابوو ڕای کردبووە ئێران لەوێ کراوە بە حاکمی ئەردەلان لەلایەن کوڕانی کەرم خان [١٦٧].

دوای ئەو ڕووداوە گرنگانە و لادانی سلێمان پاشای بابان لە ساڵی ١٧٦٢ ز هێرشی هێنایە سەر ئەردەلان و مەریوان لەدەستی سوپای خەسرۆ خان هات شکان ناچار بوو پەنا بباتە بەر شیراز و بەڕێگای جۆراو جۆر توانی کەریم خان ڕازی بکات کە خوسرۆ خان لەسەر دەسەڵات لابدات و ئەو بەخۆی جێگای بگرێتەوە [١٦٨].

وادیارە والی بەغدای ئەوکاتە بە هەوەسی خۆی یاری بە تەختی میرنیشینە کوردیەکان دەکرد بەلأم کوردەکان و میرنیشینەکان هەریز یەکگر نەبوونە ئەگەر یەکگر بوونایە بارودۆخیان بەرەو ئاقارێکی تردا دەڕۆویشت لەبەر ئەوە هەمیشە بوو بوونە قوربانی نێوان هێزە گەوەورەکان هەر بۆیە میرنیشینەکان نەبوونە خاوەن قەوارەیەکی سیاسی خۆیان.

بە پێ ی قسەکانی " ماە شەرەف خانم " خوسرەو خـانی ئـەردەلأن لەسـاڵی (١١٧٠ ك / ١٧٦٤ ز) دا بـووە بـە فـەرمانڕەوای ئـەردەلأن و (خـانی قاجـار)[١٦٩] خوسرەو خانی داناوە بە والی ئەردەلان [١٧٠] .

دوای ئەوەی حاكمایەتی ئەردەلان كەوتە دەست (خوسرەو خان)[171] كە پێ یان دەوت خوسرەو خانی گەورە لێرەدا والی بەغدا " احمد پاشا " و محمد پاشای بابان دژایەتی خوسرەویان دەكرد بەیەكەوە هێرشیان كردە سەر ئەردەلان بەلام لەو كات و ساتەدا كەریم خان و لەشكرەكەی تا كەركوك هات چونكە كەریم خـــــــان ناحەزی والی بەغدا بوو [172].

بەلام لەو هەل و مەرجەدا سلێمان پاشای بابان لە ساڵی (١٧٧٠) ز بەنیازی داگیركردنی كوردستان بەسوپایەكی فراوانەوە بەرەو مەریوان ڕۆشت و لەسەر دەستی خوسرەو خان، ئەو وای لە سلیمان پاشا كرد كە بۆ تۆڵە سەندنەوە بچێتە لای كەریم خان خۆی وەك لایەنگری كەریم خان پیشانداو ٣ هەزار تومەن زێڕی نەختینەی كردە دیاری كەریم خان و خوسرەوی تاوانبار كرد و ئەو هەموو فێڵانەی سلیمان پاشا بوە هۆی ئەوەی كینەی دێرینی كەریم خان بوروژێنێت، تا لە ئەنجان خوسرەو خانی لاداو لە بڕی ئەو ســــــلێمان پاشای كردە حاكم ڕەوانەی سنەی كرد [173].

وادیارە سلێمان پاشا دوای یەك ساڵ بە دەستی فەقێ برایم ناوێك كوژرا، هەر لەو كاتەدا كەریم خان " محمد پاشا " ی برای " سلیمان پاشا " ی كردە حاكمی كوردستان بەلام نا ئارامی وناسەقامگیریەكی زۆر بەرپا بوو بۆیە كەریم خان لەو بڕیارانەی خۆی پەشیمان بۆوە هەر بەفەرمانی خۆی دووبارە خوسرەو خان دەكاتەوە والی كوردستان و لەو پەڕی سەربەخۆیی كەوتە فەرمانڕەوایی، هەول و كۆششێكی زۆری كرد بۆ ئاوەدانی و چاكردنەوەی شاری سنەو قەلای حكوومەت [174].

هەرچی پەیوەندی سیاسی یە لەسەردەمی " خوسرەخان " جۆرێك لە هەڵكشان و داكشانی پێوە دیار بووە لەگەڵ " كەریم خانی " زەندا، چونكە

گاهێك "کەریم خان " دیاری بۆ ناردووە گاهێك لەسەرداوای سلێمان پاشا ی بابان لەدەسەلاتی خستووە، هەروەها دواتر دژی بابانیەکان وەستاوە لەبەرامبەر هێرشکردنیان بۆ سەر " خوسرەو خان " دیارە ئەوەش جۆرێك لە پەرتازەیی و غیابە عەقڵی سیاسی دەردەخات لەلایەن کەریم خان و دەست و پێوەندەکەی، ئەوەش دوا پەیوەندی سیاسی و سەربازی کەریم خان بووە لەبەرامبەر بە میرنشینی ئەردەلان چونکە دوو ساڵێك دوای ئەو ڕووداوو گۆڕانکاریانە دەمرێت واتا لە ساڵی ۱۷۷۹ ز .، هەرچی پەیوەندی کەریم خان و بابان هەبوو تا ڕادەیەك پەیوەندیان باش بووو هەر زوو دەستی پێ کرد سەلیم پاشای بابان هانای بۆ کەریم خان هێنا بۆ تۆڵکردنەوەو دژ ڕاوەستان بەرامبەر بە والی بەغدا، هەروەها کەریم خان و سەلیم پاشای بابان هەردووکیان دژی والی ئەردەلان بوون بەرژەوندیان وەها بوو کە یارمەتی یەکتر بدەن بۆیە پەیوەندی کەریم خان لەگەڵ میرنیشینەکان بەپێ ی هەڵوێستیان و باروو دۆخ دەگۆڕا، لەلایەکی تر دژایەتی کردنی کەریم خان لەگەڵ بابان ئەوە بوو عوسمانیەکان میرەکانی بابانی بەکاردهێنا تا دەست لە کاروو باری کوردستان وەربدات لێرەدا کەریم خان مەبەستی دوورخستنەوەی عوسمانیەکان بوو لە ناوچەی کوردستان بەشێوازێکی سیاسی .

ب / میراتگرانی کەریم خان و لاواز بوونی دەسەلاتی و هەرەسهێنانی حکومەتی زەندیەکان لە ئێران

بەپێی بۆچوونی سەرچاوە مێژووییە گرنگەکان کەریم خانی زەند دوای نزیکەی ۲۸ ساڵ دەسەلاتداریێتی بەسەر ناوچە جیا جیاکانی ئێرانی ئەوکاتە لە نیوەی دووەمی سەدەی هەژدە توانی بەسەقامگیرکردنی ئەمنیەت و ئارامی لەناوچەکانی ژێر سنووری دەسەلاتەکەیدا ئێرانی ئالۆزی و شڵەژاوی دوای کوژران

نادر شاوە ئارام بکاتەوە، بەڵام سەرچاوە مێژووییی یەکان بەووردی مێژووی مردنی کەریم خان دیاری ناکەن،بەڵام ئێمە جگە لەو سەرچاوانە ناتوانین بە شتی دیکە مردنی بخەینە ڕوو هەروەها دەکرێ بگوترێ کەریم خان لە ساڵی ١٧٧٩ مردووە.

سەرچاوەکانی سەردەمی کەریم خا ن باس دەکەن کە گوایە کەریم خان سیلی هەبووە بەڵام ئەوە ڕوون نەبۆتەو،ماوەیەکی زۆر لەجێگا کەوتبوو، توانای دەرچوونی نەمابوو (خەدیجە بەیگەم) کە خێزانی کەریم خانی زەند بوو چاودێری دەکرد(١٧٥).

بەڵام لەسەر مردنی کەریم خان مشتوو مڕێکی زۆر هەیە، بۆ نموونە خاوەنی " مجمل التواریخ " ڕۆژی سێ شەممە دوازدەی مانگی سەفەری (١١٩٣ك) (١٧٧٨ز) و هۆی مردنەکەشی نەخۆشی سیل و نارەحەتی موسڵدان دیاری دەکات، لەکاتێکدا بە پێ ی ئاماژەی"ڕۆستەم ئەلتەواریخ " کەریم خان بەهۆی نەخۆشی سیل لە ڕێکەوتی موحەرەمی ســـــاڵی (١١٩٣ك) (١٧٧٩ز) مردووە، گەریدەی ئینگلیزی " مەلکوم" بەوجۆرە باسی مردنی کەریم خان دەکا (بەبەختیاری ژیا کۆچی دوایی وەك مەرگی بابێکی خۆشەویست لەناو خاوو خێزانی خۆیدا بوو(١٧٦).

کەریم خان لەگەڵ خەڵکی خاکی خۆیدا زۆر تێکەڵی هەبوو، ئەگەرچی لە مانادا پیاوێکی زۆر گەورەو بەشان و شەوکەت و فەڕبوو بەڵام کاتەکەی تەواو بوو،بەڵام کەمرد لەتەمەنی هەشتا ساڵدا بوو،ئێرانیەکان لەئاسوودەگی و خۆشی بێ بەش بوون،مردنی کەریم خان بوو بەمایەی پشێوی دڵی خەلکی هەموو خەڵکی ڕەشیان پۆشی(١٧٧). هەرچۆنێك بێت وەفاتی کەریم خان سەرەتای تێکچوونی حکومەتی زەند و پەشێوی مەملەکەتی ئێران بوو کەریم خان پێج

کوڕی هەبوو یەکێکیان لەپێش خۆیدا وەفاتی کردبوو تەنیا چوار کوڕو سیێ کچی هەبوو، ئەویش ئەو باروو دۆخە هەموویانی تووشی خیانەت و دووبەرکی نێوان خانەوادەکە بوون، زەکی خان هەر لەدوای وەفاتی کەریم خان حکوومەتی هێنایە ژێر دەستی خۆی بەڵام سەرکردەکانی حکوومەتی زەند باوەڕیان بە زەکی خان نەبوو لەخیانەت کاری ئەو دەترسان، زەکی خان هەر زوو ڕێگەی فێڵ و خیانەتی گرتــە بەر، لەو هەل و مەرجە نالەبارە (ئاغا محمد خانی قاجار) کە لە شیراز زیندانی کرابوو چاوەڕیێ ی مردنی کەریم خان بووو بە هەر جۆرێك بێت هەڵدێت بە بیانووی ڕاوکردن و دەچێتە ناوچەی خۆی بۆ خۆ قایم کردن [١٧٨].

بەگشتی ئەو هەموو ناکۆکی کەوتنە نێو بنەماڵەی زەند و سەرکردە سەربازیەکان و هێزە دەرەکیەکان و دووبارە سەر هەڵدانەوەی ناخۆشی نا سەقامگیری وڵات و تێك چوونی باروودۆخی حکوومەتەکەی کەریم خان کە سەرەتا لە شیرازی پایەتەخت لە ناوەخۆ سەری هەڵدا، دەکریێ بگوتریێ و ڕەنگە ئەو باروودۆخە کت و پڕە شڵەژاوە بگەڕێتەوە بۆ دیاری نەکردنی جێنیشین لەدوای خۆی لەلایەن کەریم خانی زەند،بەڵیێ ئەوە هۆی سەرەکی بوو وە زۆریشی پیێ نەچوو سەرجەم ناوچەکان ئێرانی گرتەوە وە بوو بەسەرەکی ترین هۆکاری ڕووخانی زەندیەکان.

تەرمی کەریم خان زەند چوار ڕۆژ پاش مردنی نێژرا [١٧٩]. هێشتا هەر نەنێژرابوو کە زەکی خانی برای (لەدایکەوە) بۆ بەدیهێنان و جیێ بەجیێ کردنی ئاواتە کۆنەکان و مەبەستی دەست بەسەرکردنی تاج و تەختی پاشایەتی سەرەتا لایەنگری محمد عەلی خان و ئەبو فەتح خانی کوڕانی کەریم خانــی کرد و بەدانانی ئەوان لەســـەر تەختی فەرمــانڕەوایەتی، خۆی جلەوی فەرمانڕەوایەتی لە شیرازی پایتەخت گرتە دەست، بەڵام زەبرو زەنگ و کوشت و کوشتاری

ناوبراو بوە هۆی ئەوەی كە حكومەتەكەی تەنیا سەد رۆژ دەوام بكا و لەئەنجامی كردەوە نامرۆڤانەكانی خۆی لە زستانی ســـاڵی ١٧٧٩ ز لـەلایـەن كوردێـكی عەشـــیرەتی (مـافی)* كوژرا[١٨٠].

هەر لەدوای كوژرانی زەكی خان ئەبو ئەلفەتـــح كوڕەگەورەی كەریم خان بە شـــای ئێران ئیعلام كرا لە ســـــاڵی (١٧٨٠ ز ) ناوبراو بەبێ ترس هاتە سەر تەخت و زۆر عادل و دادپەروەر بوو، بەڵام هەر زوو دیار بوو ئەوە لەو كات و ساتە ناهەموارە بەكەلكی فەرمانڕەوایەتی نایە بەڵام گومانی تێدا نیە كە بۆ لەناوچوونی خانـــەوادەی (زەند) و دووبارە بنیات نانەوەی ئارامی و ئاسایش جگە لە ئیعلانی پادشاهی ئەو هیچ چارەیەكی دیكە نەبوو [١٨١].

لەدوای كوژرانی زەكی خان ابو فتح خانی گـــەورە كوڕی كەریم خان هەوڵێكی زۆر دەدات بۆ هێور كردنەوەی ئەو باروو دۆخە نا لەبارە بەڵام لە بەر ئەوەی هێشتا گەنج بوو وە كەم ئەزموونیش وای كرد كە ناوبراو نەتوانێت لە ئاست كێشەكاندا چالاكی بنوێنێت. وە تەنیا حەفتا رۆژ تەمەنی دەسەڵاتی ناوبراو بوو، هەر بۆیە لە ئەنجامی كێشمە كێشێكی ناوخۆیی لە لایەن (صادق خان)[١٨٢] سەرەتا كوێر دەكری ودواتر بەشێوازێكی نامرۆیانە شوێن بزر دەكرێ [١٨٣].

بێگومان ئەوەش ئەوە دەگەیەنێت كە باروودۆخەكە یەكجار ئاڵۆز بوو كەس نەی دەتوانی هێوری بكاتەوە،دەكرێ بگوترێ ئەو باروو دۆخە زیاتر لە دۆخی جارانی دوای ڕووخانی ئیمپراتۆریەتی سەفەوی لە بیستەكانی سەدەی هەژدە دەچوو، گومانی تێدا نیە لەو كاتەی كە فەرمانڕەوایەك نامێنێ دوای ئەو نەمانە بارودۆخ تێك دەچێ هەرچەندە جێگریشی هەبێ ئەو جێگرە بەئاسانی ناتوانێ كۆنترۆڵی بكات وەك ئەبو ئەلفەتح خان هەر زوو دیارە كە ناتوانێ بارودۆهەكە

كۆنترۆل بكات لەبەر ئەوە ئەزموونی نەبوو و كێشەش زۆر بوون بەو جۆرە ولآت بەرەو كزی دەچوو و نەبوونی سەركردەیەكی بەهێزی وەك كەریم خان كارێكی زۆر زۆری كردە سەر باری سیاسی زەندەكان لە ئێران.

پێشتر كە (صادق خان) خەبەری مردنی كەریم خانی پێ گەیشتبوو بەصرەی بەجێ هێشت و ڕووی كردە شیراز ئۆردوگای هەڵدا ئینجا بەدوای هەوڵ زانینی فكرەی زەكی خانی كەوت و دەرهەق بە حكوومەتەكەی كەریم خانی زەند، دواتر كەوتنە دژایەتی كردنی یەكتر بۆ ماوەیەك، دوای كوژرانی زەكی خان صادق خان ئیعلانی پادشـــاهی خۆی كرد لە (١١٩٤هـ، ١٧٨٠ ز)، دواتر لەگەڵ عەلی موراد خان كەوتنە ململانێ و گەمارۆی شیرازی داو دوای ماوەیەك صادق خان تەسلیم بوو لەلایەن عەلی مورادخان لەسێدارە درا لە (١٧٨١ز) [١٨٤].

وا دەركەوت كە عەلی موراد خان بەسەر صادق خاندا سەركەوت، دوای هێور كردنەوەی شیراز بەناردنی چەندین سوپا هەوڵیاندا لەگەڵ نەیارانی ناوخۆیی وە بەتایبەتی دوژمنی سەرەكی بنەماڵەكەی واتا (ئاغا محمد خانی قاجار) كە دوای مردنی كەریم خان بەرەو ئەستەر ئاباد ڕای كردبوو بە مەبەستی ڕاو كردن چونكە كەریم خان زۆر لەگەل محمد خان هەلسوكەوتی باش بوو یارمەتی دەدا تا ڕادەیەك ئازاد بوو بۆ گەڕان، عەلی مورا خان هەوڵێی زۆری دەدا بەلآم مەرگ مەودای پێ نادات و ڕێگەی درێژی دەسەلآتی بۆ كورت كردەوە [١٨٥].

دوا بەدوای ئەو بارووذۆخە عەلی موراد خان تووشی نەخۆشیەكی زۆرگران بوو، بەلآم لەگەڵ ئەوەشدا هەڵوێستی خۆی هەر دەنواند و دەسەلآتی زۆر لا شیرن بوو نەی دەتوانی ملكەچی كەس بێت بەلآم كۆچی دوایی كرد [١٨٦].

بـەو جـۆرە دوای مردنـی عـەلی مـوراد خـان (جەعفـەر خـان)[١٨٧] بـۆ مـاوەی نزیكەی چوار سـاڵ دەسـەلآتی بنەمالـەی زەندیـەكانی بەدەسـتەوە بـوو ١٧٨٥–

١٧٨٩ز لەو سەردەمەدا خوسرەو خانی والی ئەردەڵان وە إلا قولی خانی زەنگەنە حاكمی كرماشـان لـەدژی دەسـەڵاتی زەندیـەكان هەڵگەڕانـەوە، هەرچـۆنێك بێـت دەسەڵاتی تەمەن كورتی جەعفەر خان لە ئەنجامی بگرەو بەردەیەكی زۆر تونـدو تیژ لەگەل دارو دەستەی سەید موراد خانی زەند لـە سـەرەتای ساڵی ١٧٨٩ بـە كوژرانی جەعفەر خان كۆتایی پێ دێ، وە دوای كوژرانی جەعفەر خان سـەرەڕای هەوڵ و تەقەلاكانی سەید موراد خانی زەند بۆ قۆرخ كردنـی دەسـەڵاتی ناوەنـدی لوتف عەلی خان ١٧٨٩-١٧٩٤ گەورە كوڕی جەعفەرخان بەیارمەتی و پـشتیوانی ڕاستەوخۆی حاجی برایم خانی كەلانتەری وەزیری بارەگای بنەماڵەی زەندیـەكان توانی دەسەڵاتی ناوەندی لەسەر ناوی خۆی تاپۆ بكات (١٨٨).

وادیارە نەمانی ئەو سەركردە زەندیانە بـەرە بـەرە لـە هێـزی فەرمانڕەوایـەتی زەندەكان كەم دەبێتەوە ململانێ ی نێوان ئەو سەركردانە بووە هۆی ئـەوەی كـە هێزێكی دیكە دەست لەكاروباری وولات وەردبات بێ گومان بـارو دۆخیـان وەك جاران نەماو بە یەكجاری كەوتنە شڵەژان.

دیارە لوتف عەلی خانی زەند كە حەوتەمین و بەهێزترین دوا میراتگری بنەماڵەی زەندیەكان بوو تەنیا بۆ ماوەی شەش ساڵ وێڕای بە سەرجەم شەڕو كوشتارو هەڵگەڕانەوەی ناوخۆیی و خیانەتی جۆراو جۆر توانی دەسەڵاتی زەندیەكان بۆماوەیەكی كورتیش بێ بیپارێزێ، وەك سەرچاوە مێژوویكان باسی لێوە دەكەن سەرەڕای هەموو هەوڵ و تەقەلاكان بەدرێژایی ماوەی كورتی تەمەنی دەسەڵاتەكەی هەوڵەكان سەركەوتوو نەبوون چونكە لە ئەنجامی بگرەو بەردەیەكی تێروتەسەل وە بەمەبەستی مسۆگەر كردنی بەرژەوەندیە تەسكەكان ئاغا محمد خانی قاجار كۆنە دوژمنی بنەماڵەی زەندیەكان بە یارمەتی حاجی برایم خانی كەلانتەری حاكمی شیراز بە ئابلووقدانی ئەو شارە ڕێگای سەرەكی

لەدوای میراتگری بنەماڵەی زەندی و لایەنگرانی قاجارەکان لە کۆتایی ساڵی ١٧٩٤ بە پیلانی حاکمی شاری (بەم) کە ناوی محمد عەلی خانی سیستانی بوو، لوتف عەلی خانی زەند بەدیل کەوتە دەستی لەشکری قاجارەکان، ئاغا محمد لەتۆڵەی کوشتنی باوکی و سەرکردەکانی هۆزە کۆنەکەی پێشتری کە بەفەرمانی کەریم خانی زەند لەناوچووبوون دوای دەرهێنانی چاوەکان لوتف عەلی خانی زەند بێڕێزی کردنێکی بێ سنوور لەبەرامبەر بنەماڵەکەیدا لەگەڵ دوا میراتگری زەندیەکان دەیکات، وە فەرمان دەوڵەت بە کوشتنی ناو براو بە دڕندانەترین شێوە و فڕەدانی پاشماوەی جەستەکەی بۆ بەردەم دەمی سەگەکان تاوەکو کەسی تر جورئەت نەکات لایەنگیری لەم بنەماڵەیە بکات [١٨٩].

بەهرام ئەفراسیابی دەڵێ : محمد حوسێن فەراهانی هەمیشە پشتگیری لە لوتف عەلی خان دەکرد دەیویست بەهەر شێوەیەك بێت بەکاری بهێنێ بۆ هێور کردنەوەی ئەو بارودۆخە [١٩٠].

هەروەها بەسەرکەوتنی کۆتایی ئاغا محمد خانی قاجار حوکومڕانی ئەردەڵان زیاتر بەهێز بوو بە بەراورد لەگەڵ سەردەمانی ڕابردوو [١٩١]. بەوجۆرە قاجارەکان دەوڵەتی ئێران داگیر دەکەن کە زەندەکانی لەناوبردن و دەوڵەتی دامەزراند تورکمانەکانی لە سنووری خۆراسان دەرکردو دووری خستنوە لەو سنوورە گورجستانیشی لەڕووس سەندەوە [١٩٢].

ریچ دەڵێ: هەر لەو کاتەی قاجارەکان دەستیان کرد بەوەی کە بناسرێن و دەسەلآتیان هەبێت والیەکانی ئەردەلآن چوونە پەیمان و بەڵێنی دۆستانەیان لەگەڵ قاجارەکان داوە زۆر ڕاستگۆ بوون لەگەڵ قاجارەکاندا، لەکاتێکدا ئەوان لەکاتی خۆیدا لە ١٧٥١–١٧٧٩ دانیان بەفەرمانڕەوایەتی کەریم خانی زەند نەنا [١٩٣]. دوای ئەو هەموو سەرکەوتنە گەورەیە ئاغا محمد ناوی خۆی نا (شـــا محمد

قاجار) و شاری تارانی کردە پایتەختی خۆی، ئەوە دوای نزیکەی سێ ساڵ هەوڵ و تەقەللای بەردەوام وە تێکۆشانی شەوو ڕۆژ بەردی بناغەی فەرمانڕەوایەتی نوێ لە ژێـر ناوی قاجارەکانی ١٧٩٤ – ١٩٢٥ دادەمەزرێنیـت [١٩٤].

سەرەڕای ئەو هەموو سووکایەتی پێ کردنەی شا محمد خانی قاجار بە بنەماڵەی زەند لەگەڵ ئەو هەموو چاکەو پیاوەتیەی ئەو وەختەی کە شا محمد ی قاجار کە لە شیراز زیدانی کرابوو کەریم خان هەر وەك کوڕی خۆی سەیری دەکرد و هەر وەك و شازادە ڕای ئەبوارد ئەوەندە لای کەریم خان لە پێش بوو کە بۆ زۆر شت پرس و ڕای پێ ئەکرد، ئەوی پاداشتی ئەو چاکانەی وەها دایوە بەوە وازی نەهێنا کە خانەکانی وەندی قەلاچوو و ڕیشەکەن کرد، هەڵسا چوو قەبرەکەی کەریم خانی هەژدەساڵ پاش مردنی هەڵدایەوە و ئێسقانەکانی لە قەبرەکە دەرهێنان و بردنی بۆ تاران لە بەرەی تەختی پادشایەتی خۆیدا چاڵی بۆ هەڵکەند و ناشتی، وەهای ناشتبوو کە شا محمد لەسەر تەختی سەڵتەنەت دابنیشتبا هەر دوو پێ ی ئەکەوتە سەر قەبری کەریم خانە بەناو بانگە، بەڵام ڕەزا شای پەهلەوی ئێران ئێسقانەکانی بە ڕێزەوە دەرهێنا وەك و ڕێز لێنان لە قەبرستانی تایبەتی ی خۆی ناشتی [١٩٥].

سایکس لەسەفەرنامەکەیدا بەناوی (هەشت ساڵ لەئێران) ئەنووسێ : لەشکری ئاغا محمد خان لە کرمان بیست هەزار ژن و منداڵیان دیل کردو بەناوی کەنیزە بردیان، بەفەرمانی خواجە حەفتا هەزار چاویان دەرهێنا خواجە بەفەرماندەکەی وتبوو ئەگەر جوتێك چاو لەو حەفتا هەزارە کەمتر بێت ئەوا چاوی خۆت دەردێنم [١٩٦]. بەوجۆرە لەئێران سەلاڵەی قاجارەکان زیاتر لە ٢٠٠ساڵ حکومەت دەکەن [١٩٧].

بەشێوەیەکی گشتی دەکرێ گرنگترین هۆکارەکانی ڕووخان و هەرەس هێنانی زەندیەکان بخەینە ڕوو :-

مردنی کەسایەتیەکی بەهێزی وەك کەریم خانی زەند و نەبوونی هاو وێنەیەکی وەك ئەو، دەست نیشان نەکردنی جێگر لەدوای خۆی، ناکۆکی و دووبەرەکی لەلایەك و خوێنڕشتنی میراتگرانی کەریم خان لەسەر دەسەلات، سەر هەڵدانی هەلگەڕانەوە و یاخی بوونی جۆراو جۆر و بەردەوامی شەڕی ناوەخۆ بوو بونی هۆی بێ باوەڕی.هەروەها نە بوونی کەسایەتیەکی بەهێز وەك ژێرخانێکی پتەو بۆ پڕکردنەوەی و کەم و کورتیەکانی دەسەلاتی ناوەندی و بۆشایی سیاسی پەیدابوو، هەروەها رق و کینەی زۆری ئاغا محمد خانی قاجار چونکە ماوەیەکی زۆر بوو بە بارمتە لەشیراز بوو هەرچەند جێگاشی خۆش بوو بەلام ئاغا محمد قەدەری خۆی بە مردنی کەریم خانەوە پەیوەست کردبوو هەروەها لەبەر بوونی شەڕوو ئاژاوەو فوانخوازی وای کردبوو زۆر پەرە بە پتەو کردنی ئابووری نەدرێ بۆ کاتی پێویست بەکار بهێنرێ.

## کۆتایـــی و ئەنجام

لە لێکۆڵینەکەمدا گەیشتینە چەند ئەنجامێك :—

بارو دۆخی ئێران بەر لە نیوەی یەکەمی سەدەی هەژدە لە دوای ڕووخانی سەفەوی یەوە دەبینینێن سنووری ئەو ناوچە فراوانە بۆتە مەیدانی ململانێ و شەڕوکوشتار لە پێناو وەرگرتنی تاج وتەختی پاشایەتی لەو وولاتە و داگیرکردنی خێرو بێری وولاتەکە ملکلانێ لەسەر دەسەلات و کوشت و کوشتار لەسە ر کورسی دەسەلات پیشەی ڕۆژانەیان بوو، هیچ کات ولات ئارامی و ئاسایشی بەخۆوە نەبینی بوو تا بەهاتنی ئەفغانەکان و نادر شای ئەفشاری وولات هێندەی دیکە کاول بوو وا دەرکەوت کە نادر شای ئەفشار توانی هێزە داگیر کەرەکان وەدەرنێ بەلام هیچ کات نەی توانی ئارامی و هێمنی بە وولات ببەخشێ، تا لە لە بەر بوونی ئەو هەموو خیانەت و کوشت و کوشتارانە نادر بە دەستی یەکێ لە سەرکردە سەربازیەکانی خۆی لە خێمەکەی خۆی دەکوژرێ، وولات بە بەرەلایی و شپرزەیی بۆ کەریم خان دەهێلێتەوە.

هۆزی زەند کە لەسەرەتا دا شوانکارە بوون و لەگەل هـۆزی لـەك و لـوور یـەك دەگـــرن و یـــەك تایفـــەن و کـــە ئـــەو هۆزانـــە بەدەســـتی نـــادر شـــاوە لەناوچەشـــاخاویەکانەوە هێنرابوونـــە ژێـــر دەســـەلاتی نـــاوبراو کـــە بـــەزۆرداری دەهێنرانە نێو سوپا بێ ڕەحمانەکـەیان، وەهـەروەها دەرکـەوتنی کەسـایەتیەکی وەك کەریم خانی زەند بووە هۆی ئەوەی کە خەلّی هێوایەکی هـەبێت کـە وولاتـی پان و بەرینی ئێران بگاتە خۆشیەك، وادەرکەوت کە کەریم خـان لێهـاتوو تـرین و دلّنەرمترین سەرکردەی کورد بـوو کـە بـە ئەپـەڕی جورئەتـەوە رەفتـاری لەگـەل هەموو مەزهەب و تایفەکانی دیکە دەکرد بەبێ جیاوازی.

وادەرکەوت کە دوای نادر کەریم خان هەلی زێڕین وەردەگرێ و دەتوانێ رقەبەرایەتی نەیارانی بکات و وولآتی پیس و پڕنەهامەتی و کاولکاری و میراتگرە بزۆکەکانی دوای خۆی دوای ئەو هەموو هەولّ و تەقەلایانە و فیداکاریە توانی وولآت لەو هەموو دەردەسەریە ڕزگار بکات و ململانێ لەگەلّ زۆربەی سەرکردە هۆزەکانی تر بکات لەسەر بەدەست هێنانی تاج و تەختی پاشایەتی کەدەیان کرد و وە سەرکوت کردنی ئەو هەموو دوژمنە سەر سەختانەی کەریم خان کە نەی دەتوانی بە زووترین کات فەرمانڕەوایەتیەکی پتەو دابمەزرێنێ.

دەرکەوت کە سنوورو فەرمانڕەوایی کەریم خان ووردە ووردە زیادی کرد دەکرێ بگوترێ پانتایی جوگرافیای فەرمانڕەوایی کەریم خانی زەند بریتی بوو لە و هەرێم و ناوچانە : لار، کرمان و بەشی ڕۆژهەلآتی عێراقی عەجەمی و بەشێك لەناوچەکانی زاگرۆس و کەنارەکانی کەنداوی فارس و و باکووری باکووری ڕۆژئاوای ئێران و ئازەربایجان و کوردستان ئەوانە هەموو لەژێر ژیانێکی خۆشدا لە سایەی کەریم خانی زەن دا لە خۆشترین ژیاتندا بوون لە هەموو بوارەکانی ژیان کەمو کوڕیان نەبوو.

وەهەروەها دەرکەوت کە ئەو بارووذۆخە نالەبارەی کە لەسەردەمی نادر شاوە لەدوای کوژرانیشی کە لە ئێران دروست بوو بوو، لایەنی ئابووری و بازرگانی بەشێوەیەکی زۆر بەرەو دواکەوتن چوو بوو، وە کاتێ کەریم خان دەسەلآتی گرتە دەست دوای دامرکاندنی نا سەقامگیری،هەستی کرد دەبێ پەرە بە ئابووری بدات و بەرەو پێشی ببات،وەگەورەترین هۆکاری گەشەسەندنی ئابووری و بلآوبوونەوەی ئاسایش بووکە لەئەنجامی هەولّی کەریم خانەوە هاتبووە گۆڕێ . لەپێش سەردەمی کەریم خان ئەوروپا لەبەر گۆڕانکاری ناوەخۆ زۆر گرنگی بە بازرگانی ئێران نەدا، بەلآم ئەتوانی بلێین لەسەردەمی کەریم خان وەك بازرگانی

ناوەخۆ کشتوکاڵی ئێرانیش بەرەو پێش چوو، کە ئێران کەوتبووە ئەپەڕی خۆشی و گەشەسەندنەوە خاوەن مولك وبەرووبوم بەشـــێکی زۆریان بە حکوومەت ئەدا ســـەربەخۆ بوون و خاوەن سەروەتی خۆیان بوون.

هەروەها بازرگانی لەسەردەمی ئەودا بەتەواوەتی گەشایەوە خەڵکی لە ئەوپەڕی خۆشگوزەرانیدا بوون پەیوەندیەکانی کەریم خان لەگەڵوولاّتانی دەرەوەو وەك بریتانیا هیند و تورکیا و عێراق و بەندەرەکان و هتد گەشەی سەندو گرووتینی پێ درایەوە و خەڵکی خەریکی بازرگانی و شت و مەك گۆرڤینەوە بوون و ئەوە نیشانەی ئەوە بوو کە هەوڵی کەریم خان تەنها بۆ ئەوە نەبوو دەسەلاّ بگرێتە دەست و بەس بەڵکو بۆ ئەوە بوو کە وولاّت بەرەو پێش بچێ، هەروەها لە ڕووی ئاوەدانکردنەوەی وولاّت پەرەیەکی یەکجار زۆری بەلایەنی بیناکاری و قەلاّو شوورەکانی وولاّت دا بێ گومان ڕازاندنەوەی شاری شیراز کە کردبوویە پایتەختی خۆی بەرنامەیەکی سەرکی کەریم خان بوو بە ئەو قەلاّو شوورانەی کە ئێستا ماون بوونی بەڵگەیەکی درووستە کە لەسەردەمی کەریم خان ئاشتی و ئارامی باڵی بەسەر وولاّتدا کێشا بوو.وەهەروەها دەرکەوت کە کەوریم خان لێبووردەیەکی زۆری هەبوو بۆ خەڵکی دادوەری لەسەر دەمی ئەودا دەنگی دابۆوە لە هەموو ناوچەکانی ئێران باس هەقی کەس نەدەخورا کەریم خان خۆشی لەدادگا دا دەنیشت ئەوانە هەموو کارێك بوون زۆر ئەستەم بوون لە شلیەکانی دیکە ببینرابان.

بەشێوەیەکی گشتی هەڵوێستی کەریم خان بەرامبەر میرنشینە کوردیەکان هەڵوێستێکی جێگیر نەبووە بەڵکو زۆر جار گورانکاری تێدا ڕوویداوە بەگوێرەی بارودۆخەکان واتە دەتوانین بڵێین زۆر جار پەیوەندی نێوانیان باش بووە وە

زۆرجاریش بەپێچەوانەوە بووە و یارمەتی یەکتریان داوە و پشتگیریان لە یەکتر کردووە بەلآم ئەو باروودۆخانە بەپێ ی کات و گونجان و سیاسی ئەو دەمە بووە.

بەگشتی ئەو هەموو ناکۆکی کەوتنە نێو بنەماڵەی زەند و سەرکردە سەربازیەکان و هێزە دەرەکیەکان و دووبارە سەر هەڵدانەوەی ناخۆشی نا سەقامگیری وڵات و تێك چوونی باروودۆخی حکوومەتەکەی کەریم خان کە سەرەتا لە شیرازی پایەتەخت لە ناوەخۆ سەری هەڵدا، دەکرێ بگوترێ و ڕەنگە ئەو باروودۆخە کت و پڕە شڵەژاوە بگەڕێتەوە بۆ دیاری نەکردنی جێنیشین لەدوای خۆی لەلایەن کەریم خانی زەند،بەڵێ ئەوە هۆی سەرەکی بوو وە زۆریشی پێ نەچوو سەرجەم ناوچەکان ئێرانی گرتەوە وە بوو بەسەرەکی ترین هۆکاری ڕووخانی زەندیەکان.

پەراوێزەکان

(١) (چالدێران)ئەوشەڕە بوو لەنێوان عوسمانی و سەفەوی ڕووی دا لە ١٥١٤ و سولتان سەلیمی یەکەم بەسەر سەفەویەکان سەرکەوت، وە بوەهۆی دابەش بوونی کوردستان بەسەر دووبەش.کەیوان ئازاد ئەنوەر :کوردستان و کورد لەچەند لێکۆڵینەوەیەکی مێژوویدا،چ١،چاپخانەی بابان،سلێمانی،٢٠١٠،ل[٢١٠].دارا ئەحمەد کەریم بەگ:کەریم بەگی فەتاح بەگی هەمەوەند،چ١،چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە،هەولێر،٢٠١١ز.ل[٣٣].م.رسول هاوار:کوردو باکوری کوردستان لەسەردەتای مێژوووە هەتا شەڕی دووەمی جیهان،ب١،چ١،چاپخانەی خاك،سلێمانی،٢٠٠٠،ل[١٤١].

(٢) د.محمد سهیل تەقوش،، مێژووی دەوڵەتی سەفەوی، و/ شاخەوان محمد، هەولێر،٢٠١٠،چ[١]،ل[٣٠٦-٣١٦].

نعمت شهاب /کوردستانی ڕۆژهەلات لەسەردەمی فەرمان ڕەوایەتی زەندیەکان،ماستەرنامە،هەولیر،٢٠٠٦،ل [٣٤-٤١]

هـ.س، ل [١٨].

(٣) صالح قەفتان، مێژووی گەلی کورد لەکۆنەوە تاکو ئەمڕۆ، سلێمانی،٢٠٠٥،چ[٣]،ل[٢١٠].

(٤) (تەهماسبی دووەم) ناوی تەهماسب میرزای کوڕی سولتان حوسێن بوو بەگوێرە سەرچاوەکان لە ساڵی (١٧٠٤ز/١١١٦ك) لەدایك بووە.ڕاجر سێڤری، ئێرانی سەردەمی سەفەوی و/سەلاحەدین ئاشتی، چاپخانەی شڤان، سلێمانی ٢٠٠٦، ل [٩٣]. ی.ئی.ڤاسیلیا: شەرەفخانی بەدلیسی ئەردەم،ژیان،ئەمری،و/ارام علی،چ١ ،چاپخانەی تیشك،سلێمانی،٢٠٠٨،ل[٨٨].

(٥) جان ر.پێری،کەریم خانی زەند مێژووی ئێران لە نێوان ١٧٤٧-١٧٧٩، و/ سلاح الدین ئاشتی،سلیمانی ٢٠٠٧،ل[٦].

(٦) د.حسێن حوزنی موکریانی، سەرجەمی بەرهەمی حسێن حوزنی موکریانی، هەولێر،٢٠٠٧، چ١، ل [٤٩٢-٤٩٤].

(٧) آئینە دانش،نادر افشار شاد ایران ١١٠٠-١١٦٠ ت/ صادق رضا زاده شفق، تهران، چ١، چاپخانە جعفری، ١٣٨٩ هت، ص[٨].

(٨) حەمە کەریم عارف / کورد لە ئینسکلۆپیدیای ئیسلامدا، هەولێر،١٩٩٨، چ١، ل [٨٤].

(٩) کۆمەڵێ لە ڕۆشنبیرانی مێژووی کوردستان، گۆڤاری مێژوو، ژ ١٦،ساڵی چواردە،هەولێر، ٢٠١٠، ل [٤١].

(١٠) د.حسێن حوزنی موکریانی، سەرچاوەی پێشوو، ل[٤٩٢-٥٠٣].

(١١) جان. ر.پێری،کەریم خانی زەند مێژووی ئێران لە نێوان ١٧٤٧-١٧٧٩، و/سلاح الدین ئاشتی،سلیمانی ٢٠٠٧،ل[١١٠-١١٤].

(١٢) کۆمەڵەی رۆشنبیرانی مێژووی کوردستان،گۆڤاری مێژوو، ژ ١٦،ساڵی پێنجەم ،هەولێر، ٢٠١٠، ل ٤١.

(١٣) (زەهاو) رێکەوتنامەی (زەهاو)لەنێوان هەردوو دەولەتی عوسمانی وسەفەوی دامۆرکرا بەناماددبوونی (شاعباسی یەکەم)وسولتان (موڕادی چوارەم) بوو بەسەرەتای دابەشکردنی خاکی کوردستان دادەنرێ لەرووی فەرمییەوە وسنووری نێوان هەردوو دەولەت دیارکرا.محمد حەمە باقی،شۆرشی شێخ عوبەیدوڵلای نەهری،چ[1]،چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە،هەولێر،٢٠٠٠،ل١٢-١٣. (١٤) و/سەلام عەبدوالکەریم،کۆمەڵێ نووسەر،عوسمانییەکان،لەعوسمانی کوڕی ئۆرتوغولەوە تا سوڵتان عبدالحمید دووەم،چ٢، سلێمانی،٢٠٠٨،ل٢١٩.

(١٥) نعمت شهاب، س.پ، ل١٨-٤٠.

(١٦) دێیڤید مەکداول،مێژووی هاوچەرخی کورد،وتەبوبەکر خۆشناو،چ(١)،چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە،هەولێر،ل٦٧.

(١٧) صالح محمد ئەمین، کوردو حەجەم مێژووی سیاسی کوردەکانی ئێران، هەولێر،١٩٩٢،چ١،ل١٤٧.

(١٨) (کوردان) ناوچەیەکی کوردی یە لەنزیك موصل.وە هەمووکات دەگەڕانەوە بۆزەهاو چونکە پەیمانێکی نێودەولەتی بوولەنێوان ئێران و عوسمانی،جان ر.پێری ،س.پ،ل١١٨.

(١٩) جان ر.پێری،س.پ،ل ٩-١٠.

(٢٠) گۆڤاری مێژوو س.پ،ژ١٦،ل ٣٠. د.محەمەد سهیل تەقوش،عوسمانیەکان لەدامەزراندنیانەوە تا بەسەر خەلافەتدا،و/نەریمان خۆشناو،چ١،چاپخانەی رۆژهەلات،هەولێر،٢٠٠٩،ل٢٣٤.

(٢١) نەجاتی عەبدوللە : کوردستان و کێشەی سنووری عوسمانی –فارسی ١٦٣٩-١٨٤٧،هەولێر،٢٠٠١،چ١، ٦٦-٦٧.

هـ.س،ل٦٨.

(٢٢) صالح قەفتان : س.پ،ل ٢١١.

(٢٣) شەرەفخانی بەدلیسی : شەرەفنامە، و / مامۆستا هەژار، چ٣، هەولێر،٢٠٠٦، ل ٤٢٨.

(٢٤) د.عبدالرحمن قاسملو : کوردستان و کورد (لێکۆڵینەوەیەکی سیاسی و ئابووری) یە،و/ عبداللە حسن زادە، هەولێر،٢٠٠٦، چ٢، ل٤٣.

(٢٥) شێخ محمدی مەردۆخی کوردستانی: مێژووی کوردو کوردستان،و/عبدالکریم محمد سعید، بغداد، ١٩٩١، ل ١٤٩.

(٢٦) علی تەتەر : کەریم خانی زەند و بزاڤێن لەشکری و سیاسی،گۆڤاری (مەتین)،ژ(١٠٩)،شوباتی ٢٠٠١،ل١٠-١١.

(٢٧) کارستن نیبور : سفرنامه کارستن نیبور، ١٧٦٥،ت/پرویز رجبی،چ١،تهران،ل٤٨.

(٢٨) (لووڕەکان) ووشەی لور فارسی یە کوردیەکەی واتە(شاخی پر چڕە دارستان) دەگەیەنێ.بڕوانە حەمەدی نێژە پەناد تفەرهەنگی لەك و لوڕ /چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد،بغداد،١٩٧٨،ل٣٢.عبدالجليل فيلي:اللور(الكورد)الفيليون في الماضى والحاضر،ط١،مطبعة وزارة التربية،اربيل،١٩٩٩، ١٠٧.

(٢٩) كمال مزهر احمد : دراسات فى تاريخ ايران الديث والمعاصر، بغداد، ١٩٨٥، ص٢٣.

(٣٠) کورد لەئینسکلۆپیدیای ئیسلامدا : و/ حەمە کەریم عارف، هەولێر، ١٩٩٨، ل٨٦.

(٣١) صالح قەفتان : مێژووی گەلی کورد لەکۆنەوە تاکوو ئەمڕۆ، چ٢، سلێمانی، ٢٠٠٤، ل ٨٨.

(٣٢) نازناز محمد عبدالقادر : میرنیشینەکانی کوردستانی رۆژهەلات –لەسەردەمی فەرمانڕەوای قاجارەکاندا، لێکۆڵینەوەیەکی مێژوویی و رامیاری و ئابووری یە، چ١، هەولێر، ٢٠٠١، ل ٤٤-٤٦.

(٣٣) میرزا شکرالله سنندجی: هۆزو تیرەی تایەفەی کورد لە کوردستانی ئەردەڵان.وەرگێڕانی سولتانی،٢٠٠٦،سلێمانی، ل ٤٤.

(٣٤) جان. ر. پێری : س.پ، ل٤٠.

(٣٥) مینۆرسکی : کورد، و / حەمە سعید کەریم،. بغداد، ١٩٨٤، ل٣٤.

(٣٦) حەسەن احمد : حکومەتی زەند و چەند تێ ڕوانینێك، گۆڤاری (کاروان)، ژ(١٢٧)،١٩٩٨،ل٣٣.

(٣٧) عبدالجليل فيلى : اللور الكرد والفيليون فى الماضى والحاضر، هه ولير، ١٩٩٩،ص٢٣.

**(٣٨) (دەرگەزی ئەبیوەرد) شوێنێکە ئەکەوێتە ناوچەی خۆراسان و لەگوندی پەری یەوە زۆر دوورە،بەهرام ئەفراسیابی،قەڵای پەری لەکەریم خانەوە تا لوتف عەلی خان : و/سامان عبدالله،هەولێر،٢٠٠٧،ل ١٢.**

(٣٩) عبدالجليل فيلى، م. س،ل١٩٩٩،ص٩٣.

(٤٠) بەهرام ئەفراسیابی، قەڵای پەری، و/ سامان عەبدوالله، هەولێر ٢٠٠٧، چ١، ل ٥.

(٤١) محمد معين، فرهنگ فارسى، تهران، ١٣٧٦، ص ١٤.

(٤٢) جان. ر.پێری، س. پ، ل٤١.

(٤٣) بەهرام ئەفراسیابی : هـ.س،ل ١٤.

**(٤٤) (ئیناق) باوکی کەریم خانی زەند بووە بەڵام نێوی باپیری بەتەواوەتی مەعلووم نیە بڕوانە :دونالد ولبر :ايران ماضيها وحاضرها،ت/د.عبدالنعيم حسنين،القاهرة،١٩٥٨،ص٩٦.**

(٤٥) (پەری) قەڵایەك بوو لەناوجەرگەی دەشتەکانی لوورستاندا بوو، بەهرام ئەفراسیابی لەکتێبی قەڵای پەریدا دەڵێت ئەو گوندە یاخو ئەو قەڵایە لەسەر تەپۆلکەو شوێنەکاندا بوو ئەڕوانێتە دەشتێکی پان و بەرین

و کێلگە بە پیتەکان،: دیواری قەلاکەی بەرزی هەبوو. بەهرام نەفراسیابی،قەلای پەری لەکەریم خانەوە تا لوتف عەلی خان ،و/ساماننعبداللە،هەولێر،٢٠٠٧،ل ١٢.

(٤٦) پالەوانی زەند : و/ حسن فهمی جاف، بغداد، ١٩٥٦، ل ١١-١٢.

(٤٧) کمال مزهەر أحمد : المصدر السابق، ص ٢٣.

(٤٨) محمد أمين زەکی : خولاسەیەکی تاریخی کوردو کوردستان، ب٤، سلێمانی، ٢٠٠٦، ل ١٧١-١٧٢.

(٤٩) علي رضا اوسطلی : ایران در سه قرن گزشته، ج١، ١٣٢٣، تهران، ل ٣٧-٣.

(٥٠) دۆنالد ولبر : ایران ماضیها و حاضرها، ت-د. عبدالنعيم محمد حسنين، القاهرة، ١٩٥٨. ص ٩٦.

(٥١) صالح قەفتان : سەرچاوەی پێشوو، ل ١٨٩.

(٥٢) عەلی تەتەر : کەریم خانی زەند و زاڤین لەشکری و سیاسی، مەتین گۆڤار،ژ-١٠٠، ئاداری ٢٠٠١،ل ٢٦-٢٧.

پرویز رجبی،س.پ،ل ٤٤.

(٥٣) صالح قەفتان : هەمان سەرچاوە، ل ٢٠١.

(٥٤) (هەمەدان) شارێکی رندو جوانە،بنکەی نوستانە—تورکمان زوربەن-لەدامێنی چیای(ئەباسا وادیاه)، ٢٢کم لە قەزوێنەوە دوورە،جان.ر.پێری س.پ.ل ٨٨.

(٥٥) مەحەمەد ئەمین هەورامـــی : کاکەیـــی،چاپخانەی (حوادث)،بەغداد،١٩٨٤،ل ٢٨.

(٥٦) (تەکلوو) یەکێك لە تیرە سەرەکیەکانی تورکانن و بەگشتی بە قزلباش ناسراون وە لایەنگری شا نیسماعیلی سەفەوی بوون، هەمزە میرزا ئەو تایەفەیەی بن بڕ کرد بەلام چەن تایفەیەکی دیکە ئەو ناوەیان پاراست بەلام نیتر وەك و تایەفە نەمان.جان.ر،پێری کەریم خانی زەند مێژووی ئێران لەنێوان ١٧٤٧-١٧٧٩، و/سەلاحە دین ئاشتی،سلێمانی،٢٠٠٥ ،ل ٤٤-٤٩ .

(٥٧) عبدالجليل فيلی : م،س، ص ٩٧.

(٥٨) محمد أمین زکی : س.پ، ل ١٧٣-١٧٤.

(٥٩) سامان عبداللە، س.پ، ل ٧.

(٦٠) سەلاحەدین ئاشتی : س.پ، ل ٤٣.

(٦١) صالح قەفتان : س.پ، ل ١٨٨.

(٦٢) ئەحمەد حەمەدەمین : دۆزی کورد لەچەن باسێکی مێژوویدا، هەولێر، ٢٠٠٨، ل ٢٤.

(٦٣) واسیلی نیکیتین : کورد و کوردستان، و/ خالیدی حسان، هەولێر. ١٩٩٨، ل ٤٨٤.

(٦٤) د.عبداللە رازی : تاریخ کامل ئیران —از تأسیس سالة ماد تا انقراض قاجار، تهران، ١٣٦٧ ش، ل ٤٤٨.

(٦٥) ئارشاك سافراستیان : کوردو کوردستان، و/ ئەمین شوان، چ٢، هەولێر، ٢٠٠٥، ل [٦٤].

(٦٦) د.عبدالله رازی : م.س، ل [٤٤٨].

(٦٧) حسین حوزنی موکریانی : مێژووی کوردو نادرشا لەخاکی ئیرانا، رواندوز زاری کرمانجی، ١٩٣٤،ل [٤].

(٦٨) المقدم شیخ عبدالواحد : الاکراد و بلادهم تاریخ الشعب الکردی منذ أقدم العصور الی العصر الحالی، د.م.، د.ت، ص [١٣].

(٦٩) محمد ئەمین زەکی : س.پ، ل [١٦٣].

(٧٠) حسین حوزنی موکریانی : مێژووی شاهەنشاهی کوردی زەند لەسالانی ١١٦٣-١٢١٠د ١٧٤٩-١٧٩٦ م، رەواندوز مەرکەزی زاری کرمانجی : ١٩٣٤، ل [٦].

(٧١) عبدالله رازی : م. س، ل [٤٢٠].

(٧٢) ئەحمەد حەمەد ئەمین : س.پ، ل [٢٩].

(٧٣) سالح قەفتان : س.پ، ل [١٨٩-١٩٠].

(٧٤) محمد ئەمین زەکی : س.پ، ل [١٦٤].

(٧٥) صالح قەفتان : س.پ، ل [١٩٠-١٩٩].

(٧٦) هـ.س، ل [٢٠١].

(٧٧) شاکرخەصباك : کوردو مەسەلەی کورد، و/ ئەمجەد شاکرلی، هەولێر، ٢٠٠٥، ل [١٢١].

(٧٨) (عەبدولحەمیدی یەکەم) کوڕی ئەحمەدی محەمەدە یەکێکە بوو لەسوڵتانەکانی عوسمانی لەنێوان سالانی ١١٨٧-١٢٠٣ك فەرمانڕەوایەتی کردووە. د.محمد حرب : سوڵتانەکانی عوسمانی،و/ ابراهیم ئەحمەد شوان،چ١،چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە،هەولێر،٢٠٠٤،ل [٩].

(٧٩) د.عبدالرحمن قاسملو : س.پ، ل [٤٣].

(٨٠) نازدار محمد قادر : س.پ، ل [٤٤].

(٨١) حوسێن حوزنی :مێژووی شاهەنشاهی کوردی زەند، چ١،سەرجەم بەرهەمی حوسێن حوزنی، دەزگای ئاراس، هەولێر : ٢٠٠٧ ، ب١، ل [٤٤٧-٤٤٨].

(٨٢) ئەحمەد محەمەد ئەمین : س. پ، ل [٢٩].

(٨٣) واسیلی نیکیتین، س.پ ل [٤٨٤].

(٨٤) (عێراقی عەجەمی)یاقوتی حەمەوی دەڵێ:مەڵبەندێکە لەنێوان ئیسفەهان و زەنجان و قەزوێن و هەمەدان و دینەوەر و قەرمیسین و دینەوەر.بۆ زیاتر زانیاری سەیری.عەلی ئەسغەری شەمیمی هەمەدانی،و/عبدالرحمن محمد،جوگرافیای کوردستانی ئێران،چاپخانەی کۆڕی زانیاری عێراق،بەغدا، ١٩٨٠،ل [٢٨].

(٨٥) نیعمەت شەهاب : س.پ، ل ٦٠.

(٨٦) جان ر. پێری : س.پ، ل ٤٣٩.

(٨٧) نەجاتی عەبدوڵڵە : کوردستان وکێشەی سنووری(عوسمانی و فارسی ١٦٣٩-١٨٤٧)، ٢٠٠٠، هەولێر، چ١، ل ٦٨-٦٩

(٨٨) نیعمەت شەهاب : هـ.س، ل ٤٩.

(٨٩) نیعمەت شەهاب : س. پ، ل ٦٠.

(٩٠) جان ر. پێری: س.پ، ل ٤٣٩.

(٩١) کەریم زەند : گەشتی زەند تۆماری تەمەن، هەولێر، ٢٠٠٤، ب١، ل٢٨٩.

(٩٢) و / سـلاح الدین ناشتی : هـ.س، ل ٤٤٠.

(٩٣) ناصر خلیلی :گرایش به غرب در هز عثمانی و قاجار و هند،تهران،نشر کارنگ،١٣٨٣،ل١٠٩.

(٩٤) پرویز رجبی : س.پ، ل ٢٦٠.

(٩٥) فەلەکەدین کاکەیی :کەریم خانی زەند پارێزەری میللەت،هەولێر،وەزارەتی رۆشنبیری،ژ ٤٥٣)،١١ی ناداری ٢٠٠٨، ل ٨٠.

(٩٦) محمد ئەمـین زەکی : س. پ، ل ١٧٠.

(٩٧) نیعمەت شەهاب : س. پ، ل ١٠٣-١٠٤.

(٩٨) صـالح محمد ئەمین : س. پ، ل ١٤٧.

(٩٩) صـالح قەفتان : س. پ، ل ١٩١-١٩٢.

(١٠٠) جان. ر. پێری : س. پ، ل ٤٢٦.

(١٠١) هـ. س، ل ٤٢٢.

(١٠٢) کارستن نیبور : س. پ، ل ٢٢٠.

(١٠٣) گۆڤاری مێژوو : ژ١٦، س. پ،ل ٧٦.

(١٠٤) نیعمەت شەهاب : س، پ، ١٠٦-١٠٧.

(١٠٥) پرویزرجبی : س،پ، ل١٩٩.

(١٠٦) هـ. س،ل ١٨٣.

(١٠٧) "بارتۆڵد"ناوی ڤاسیلی ڤلادمییری بارتۆڵدە مێژوونوس و لێکۆڵەرێکی مێژوویی یە لە پترسبورگ خوێندوویەتی.

(١٠٨) www.qcastle.com

(١٠٩) نیعمەت شەهاب : س، پ، ل١٠٨.

(١١٠) دیوید الکساندر:ابزاز آلات جنگ ' تهران،نشر کارنگ،١٣٨٧،ل ١٣٦.

(١١١) جان. ر. پێری : س. پ، ل ٤٢٢.

(١١٢) خەلیل ناصر :کارهای شیشه کشور اسلامی،تهران،نشر کارنگ،١٣٨٣،ل ٤٠٧.

(١١٣) نیعمەت شەهاب : هـ، س، ل ١٠٨.

(١١٤) هـ، س، ل ١٠٩.

(١١٥) جان. ر.پێری : س.پ، ل ٤٢٣.

(١١٦) عبدالرحمن قاسملو : س.پ، ل ٤٣-٤٤.

(١١٧) پرویز رجبی : س.پ ل ١٩٨.

(١١٨) نیعمەت شەهاب : هـ، س، ل ١١٠.

(١١٩) نیعمەت شەهاب : س.پ،ل ١١١.

(١٢٠) هـ.س : ل ١١٢.

(١٢١) صادق نشأت، م.س، ص ٨٣.

(١٢٢) حەسەن احمد: حکومەتی زەند و چەند تێروانینێك، کاروان، گۆڤار، ژ،(١٢٧)، ١٩٩٨، ل ٣٣.

(١٢٣) کارستن نیپور : س.پ، ل ١٧٠.

(١٢٤) (ارگ) بەمانای قەلا یاخود شوێنی نیشتەجێ دێت کە تایبەت بوو بە شوێنی حەوانەوەی کەریم خان کە لە مەرکەزی شاردا هەبوون کە یەکێك بوو لە گرنگترین بیناکانی سەردەمی کەریم خان .بڕوانە میرخان تلایی :ارگهای کریم خان،سنندج،نشر سیدا ١٣٨٩،ل ٤٣.

(١٢٥) جان.ر.پێری : س.پ،ل ٤٧٠.

(١٢٦) حسن فهمی جاف : کەریم خان زەند، گەلاوێژ، گۆڤار،ژ.(١)، تشرینی یەکەمی ١٩٤٣ ل ٤٠.

(١٢٧) جان.ر.پێری : هـ.س،ل ٤٧٠.

(١٢٨) فەلەکەدین کاکەیی: س.پ،ل ٨٠.

(١٢٩) جان.ر.پێری : هـ.س،ل ٤٧١.

(١٣٠) (بیجادە) جۆرە بەردێکی جوان و گرانبەهابوو بۆ جوانکاری بیناکان بەکاردەهات.پرویز رجبی :س.پ،ل ٤٤.

(١٣١) جان.ر.پێری،س.پ،ل ٥٧١.

(١٣٢) صالح قەفتان،س.پ،ل.١٩٢

(١٣٣) دۆنالد ولبر،م.س، ص٩٦.

(١٣٤) جان.ر.پێری،هـ.س،ل ٥٧٤.

(١٣٥)) www.goghrafu-shz.blogfa.com

(١٣٦) کارل بروکلمان،تاریخ شعوب الأسلامیة،ت/بنیة امین فارس،منیر بعلبکی،١٩٧٧،ص٤٢٨.

(١٣٧) Jografi-sh.blogfa.com

(١٣٨) جان.ر.پێری،س.پ،ل ٤٧٤.

(١٣٩) Admf.persianblog.ir.com

(١٤٠) عەلی تەتەر، کەریم خانی زەند و بزاڤێن لەشکرو سیاسی، مەتین،گۆڤار، ژ١١٠.ئاداری ٢٠٠١،ل٨.

(١٤١) جان.ر.پێری،س.پ،ل ٥٨٤.

(١٤٢) حەسەن فەهمی جاف، س.پ،ل١٤-١٥.

(١٤٣) صالح قەفتان،س.پ،ل ١٩٢.

(١٤٤) حەسەن فەهمی جاف، هـ.س، ل١٥.

(١٤٥) هـ.س، ل ١٥.

(١٤٦) حەسەن ئەحمەد : س.پ،ل٣٢.

(١٤٧) جان.ر.پێری : س.پ،ل ٤٩٦.

(١٤٨) صادق نشأت : مصطفی حجازی، صفحات عن ایران،ط٢،بغداد، ١٩٦٠ز، ص٨٢.

(١٤٩) کمال مظهر احمد : م.س،ص٢٣٣.

(١٥٠) حەسەن فەهمی جاف :س.پ،ل١٤.

(١٥١) محمد ئەمین زەکی : س.پ،ل١٧٤.

(١٥٢) عبدالله رازی : س.پ،ل٤٤٩.

(١٥٣) فەلەکەدین کاکەیی : س.پ،ل ٨٠.

(١٥٤) محمد امین زەکی،س.پ، ل١٧٥.

(١٥٥) صالح قەفتان :س.پ، ل ١٩١.

(١٥٦) جان.ر.پێری :س.پ،ل ٤٩٩.

(١٥٧) بەهرام ئەفراسیابی : س.پ، ل٧.

(١٥٨) جان.ر.پێری : هـ.س،ل ٦٠٠.

(١٥٩) (ئەردەلآن) مێجەرسۆن دەڵێ: ئەوان سەنەیان لە شوێنی شارە کۆنەکەدا درووست کردۆتەوە بە بەردەوامی نەوەکانیان لەوێدا حوکمڕانیان کردووە تاساڵی ١٨٦٥ز کە زیاتر لە ٥٠٠ ساڵەمان بنەماڵە لەفەرمانڕەوایی دابوون.میەجەرسۆن،سلێمانی ناوچەیەك لەکوردستان،و/مینە،چ١،سلێمانی٢٠٠٧،ل١١٩.

نارشـــاك پۆلاتیـــان:کـــورد لەـــــەدەی حەوتەمـــەوە تـــا ســـەدەی دەیـــەم،و/جـــەلیل کاکـــە وەیس،چ٢،هەولێر،٢٠٠٨،ل[١٤٤].

(١٦٠) نازناز محمد عبدالقادر : س.پ. و ل[٢٨].

(١٦١) نەوشیروان مستەفا ئەمین :کوردو عەجەم، مێـژووی سیاسـی کوردەکـانی ئێـران، چ٣ ´سـەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیژی،سلێمان ی، ٢٠٠٠ ز،ل[٤].

(١٦٢) عەلی تەتەر : کەریم خانی زەندو بزاڤێن لەشکری و سیاسی، مەتین، گۆڤاری ژمـارە ١١٠، تـاداری ٢٠٠١، ل [١٨].

ماهشەرەف خانم مەستوورەی کوردستانی : مێژووی ئەردەلان ، و/ حسن جاف و شـکور مـــستەفا، بغـداد، ١٩٨٩ ز، ل[١١٧].

(١٦٣) (قراتورا) ئەو قەلایە بوو لە ژێر دەسـتی ئەردەلانیەکان دابوو کە زەنـدەکان توانیـان بیگـرن و عـەلی مەردان خان لەو قەلایە بشکێنن. میرزا شکرالله سنندجی،فخر الکتاب،تحفـه ناصـری در تـاریخ و جغرافیـا کردستان،تهران،١٣٧٥،ل[١٤٤-١٤٦].

(١٦٤) نەوشێروان مستەفا، س.پ، ل [٥٧٣].

(١٦٥) مەستوورەی کوردستانی، س.پ ل [٧٨-٧٩].

(١٦٦) صالح قەفتان، س.پ، ل [٢١٧].

(١٦٧) جان ر، پێری، س.پ، ل [٤٤].

(١٦٨) (خوسرەو خان)بەگوتەی مەستوورە خانم پیاوێکی زۆر زمان شڕو جوێن فرۆش و بێ بزەیـی و نامـەرد بوو بۆ زانیاری زیاترنەهەژار :مێژووی ئەردەلان چ١،تهران،٢٠٠٢،ل [٩٤].

(١٦٩) (خانی قاجار) لێرەدا مەبەستمان لە محمدحسن خانی قاجـارە کەلـە (١١٧٢- ١١٢٧) کـە بناغـەی حکومەتی سەربەخۆی قاجارەکانی دانا لە ئێران. بڕوانە جان ر.پێری،س.پ،ل[١٣١].مهدی مظفر سـاوجی،شـهد اما شوکرات،غزل اجتماعی معاصر ازعهد مشروتەتا دهەی هفتادچ١،کتابسرای‌تندیس، ١٣٨٢،ص[٢٩].

(١٧٠) نەوشێروان مستەفا ئەمین، س.پ، ل [٨٧].

(١٧١) صالح قەفتان، س.پ، ل [١٦٨].

(١٧٢) نەوشێروان مستەفا، هـ. س، ل[٤٨٢].

(١٧٣) عەلی تەقی ئەلحوسێنی:مێژووی ٦٤١ ساڵەی فەرمانڕەوایی ئەردەلانیەکان، چ١، ٢٠٠٢،سلێمانی، ل [٤٧].

(١٧٤) بەهرام ئەفراسیابی : پەری، س.پ، ل[١٣٦].

(١٧٥) نیعمەت شەهاب : س. پ ل [٦٢].

(١٧٦) د.کوردستا ن موکریانی، سەرجەمی بەرهەمی حوسێن حوزنی، هەولێر، ٢٠٠٧، ب[١]، ج[١]، ل[٦١].

(١٧٧) محمد ئەمین زەکی بەگ : خولاصەیەکی تاریخی کوردوکوردستان لە زۆر قەدیمەوە تاکو ئەمرۆ،سلێمانی،٢٠٠٦،ب[١]، ل[١٧٤-١٧٦].

(١٧٨) (مافی) ئەو هۆزە شوێنی دانشتنیان لە پێشدا لە کوێستانەکانی ڕەاندوز بووە. لەخاکی عوسمانی و ساوجبلاغی موکری مولکی ئێران بووە، وە بەهۆی ملهوڕی و سەربزێویەوە بە فەرمانی شا عەبباسی سەفەوی کۆچیان پێ کراوە و لە " ڕەی " و " شەهریار " و " قەزوێن " دایان مەزراندون.میرزا شکراللە سنندجی :هۆزو تیرەی تایفەی کورد،و/ئەنوەری سولتانی،سلیمانی،٢٠٠٦،ل[٨٧].

(١٧٩) (صادق خان ) برای کەریم خان بوو ئەمیرێکی بەتوانا بوو زۆر زیرەك و چاونەترس بوو، بەلاّم زۆر حەزی لە پادشایەتی نەدەکرد، زیاتر خەریکی کاری سەربازی و فراوانخوازی بوو، ناوبراو هەر لەزەمانی کەریم خانی برایدا زۆر بەناوبانگ و دادپەروەر بوو. جان. ڕ. پێری : کەریم خانی زەند مێژووی ئێران لەنێوان (١٧٤٧ – ١٧٧٩)، و/ سەلاحەددین ئاشتی، سلێمانی، ٢٠٠٧، ل[٩٩-١٠٠].

(١٨٠) سەلاحەددین ئاشتی : کەریم خانی زەند مێژووی ئێران لەنێوان سالأنی١٧٤٧-١٧٧٩،سلیمانی،بنکەی ژین،٢٠٠٥،ل [٤١٤].

(١٨١) نیعمەت شەهاب : س. پ، ل [٦٣].

(١٨٢) محمد ئەمین زەکی : س. پ، ل[١٧٨].

(١٨٣) نیعمەت شەهاب : هـ. س، ل [٦٣-٦٤].

(١٨٤) (جعفر خان) کوڕە گەورەی صادق خانە کەدەکاتە برازای کەریم خان سەرکردەیەکی بەهێزو بێ ڕەحمی هۆزی زەند بوو.کارستن نیبور :س.پ.،ل [١٩٧].

(١٨٥) محمد ئەمین زەکی :س. پ، ل[١٧٩- ١٨١].

(١٨٦) نیعمەت شەهاب : س. پ، ل [٦٤].

(١٨٧) ئەجاتی عەبدوللە : س.پ، ل [٦٩- ٧٠].

(١٨٨) نیعمەت شەهاب : س. پ، ل [٦٤-٦٥].

(١٨٩) نیعمەت شەهاب : س.پ، ل [٦٤-٦٧].

(١٩٠) بەهرام ئەفراسیابی : س. پ، ل [٢٤٦].

(١٩١) میجەرسۆن : س.پ، ل [١٢١].

(١٩٢) رشید شیخ عبدالرحمن : مێژووی زاگروس، هەولێر، ٢٠١١، ل [٤١٤]

(١٩٣) مێجەرسۆن : هـ.س، ل [١٢٢].

(١٩٤) نیعمەت شەهاب : هـ.س، ل [٦٧]

(١٩٥) حەسەن فەهمی جاف : س.پ، ل [١٣] .

(١٩٦) بەهرام ئەفراسیابی،پەری، س.پ، ل [٤٦٢] .

(١٩٧) نادر فەتحی بۆکانی : کرۆنۆلۆگی کوردستان،هەولێر، ٢٧٠٣ك،ل[٣١] .

لیســـــتی سەرچاوەکان

**سەرچاوە کوردیەکان**

(١) ئارشاك سافراستیان : کوردو کوردستان، و/ ئەمین شوان، چ٢، هەولێر، ٢٠٠٥ ز.

(٢) ئارشاك پۆلاتیان:کورد لەسەدەی حەوتەمەوە تا سەدەی دەیەم،و/جەلیل کاکە ودیس،چ٢،هەولێر،٢٠٠٨ز.

(٣) بەهرام ئەفراسیابی، قەلای پەری، و/ سامان عەبدوالله،چ١، هەولێر ٢٠٠٧ ز.

(٤) جان ر.پێری،کەریم خانی زەند مێژووی ئێران لە نێوان ١٧٤٧-١٧٧٩، و/ سلاح الدین ئاشتی،سلیمانی ٢٠٠٧ ز.

(٥) حەمە کەریم عارف / کورد لە ئینسکلۆپیدیای ئیسلامدا،چاپخانەی وەزارەتی رۆشنبیری، چ١، هەولێر،١٩٩٨ ز.

(٦) حسێن حوزنی موکریانی، سەرجەمی بەرهەمی حسێن حوزنی موکریانی، چ١، هەولێر،٢٠٠٧ ز.

(٧) -------------- : مێژووی کوردو نادرشا لەخاکی ئیرانا، رواندووز زاری کرمانجی، ١٩٣٤ ز.

(٨) -------------- :مێژووی شاهەنشاهی کوردی زەند،سەرجەم بەرهەمی حوسێن حوزنی، ب١،دەزگای ئاراس، رەواندوز مەرکەزی زاری کرمانجی : ١٩٣٤ ز.

(٩) حەمدی ئێزە پەناه : فەرهەنگی لەك و لوور /چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد،بغداد،١٩٧٨ ز.

(١٠) حسن فهمی جاف: پالەوانی زەند، بغداد، ١٩٥٦ ز.

(١١) دارا ئەحمەد کەریم بەگ:کەریم بەگی فەتاح بەگی هەمەوەند،چ١،چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە،هەولێر،٢٠١١ز.ل[٣٣] .

(١٢) دیڤید مەکداول،مێژووی هاوچەرخی کورد،وتەبوبەکر خۆشناو،چ١،چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە،هەولێر٢٠٠٣،.

(١٣) راجر سێڤری، ئێرانی سەردەمی سەفەوی و/سەلاحەدین ئاشتی، چاپخانەی شڤان، سلێمانی ٢٠٠٦ ز.

(١٤) رشید شیخ عبدالرحمن : مێژووی زاگروس، هەولێر، ٢٠١١ ز.

(١٥) رسول هاوار:کوردو باکوری کوردستان لەسەرەتای مێژووەوە هەتا شەڕی دووەمی جیهان،ب١،چ١،چاپخانەی خاك،سلێمانی،٢٠٠٠.
(١٦) سەلاحەدین ئاشتی:کەریم خانی زەند مێژووی ئێران لەنێوان سالآنی١٧٤٧-١٧٧٩،سلیمانی،بنکەی ژین،٢٠٠٥ ز.
(١٧) سەلام عەبدوالکەریم،کۆمەلێ نووسەر،عوسمانیەکان،لەعەوسمانی کوڕی ئۆرتوغولەوە تا سولتان عبدالمجیدی دووەم،چ٢، سلێمانی،٢٠٠٨ز.
(١٨) شێخ محمدی مەردۆخی کوردستانی: مێژووی کوردو کوردستان،و/عبدالکریم محمد سعید، بغداد، ١٩٩١ ز.
(١٩) شاکرخەصباك : کوردو مەسەلەی کورد، و/ ئەمجەد شاکرلی، هەولێر، ٢٠٠٥ ز.
(٢٠) صالح قەفتان، مێژووی گەلی کورد لەکۆنەوە تاکو ئەمڕۆ، چ٣، سلێمانی،٢٠٠٥ ز.
(٢١) صالح قەفتان : مێژووی گەلی کورد لەکۆنەوە تاکوو ئەمڕۆ، چ٢، سلێمانی، ٢٠٠٤ ز.
(٢٢) صالح محمد ئەمین، کوردو حەجەم مێژووی سیاسی کوردەکانی ئێران،چ١، هەولێر،١٩٩٢ ز
(٢٣) عەلی تەقی ئەلحوسێنی:مێژووی ٦٤١ سالەی فەرمانڕەوایی ئەردەلانیەکان، چ١،سلێمانی، ٢٠٠٢ ز.
(٢٤) عبدالله غفور، جوگرافیلی کوردستان،هەولێر،دەزگای چاپ و بلاوکراوەی موکریان،٢٠٠٠ ز.
(٢٥) عەلی ئەسغەری شەمیمی هەمەدانی،و/عبدالرحمن محمد،جوگرافیای کوردستانی ئێران، عێراق،بەغدا،١٩٨٠ز.
(٢٦) عبدالرحمن قاسملو:کوردستان وکورد (لێکۆڵینەوەیەکی سیاسی وئابووری) یە،و/عبدالله حسن زادە،چ١،هەولێر،٢٠٠٦ ز.
(٢٧) ی.ئی.ڤاسیلیا: شەرەفخانی بەدلیسی،سەردەم،ژیان،ئەمری،و/ارام علی،چ١،چاپخانەی تیشك،سلێمانی،٢٠٠٨ز.
(٢٨) کوردستان موکریانی، سەرجەمی بەرهەمی حوسێن حوزنی،ب١،چ١،هەولێر، ٢٠٠٧ ز.
(٢٩) کەریم زەند : گەشتی زەند تۆماری تەمەن،ب١، هەولێر، ٢٠٠٤ ز.
(٣٠) کەیوان ئازاد ئانوەر: چەرەدیەك لەمێژووی کورد،چ٥،٢٠٠٨ ز.
(٣١) کەیوان ئازاد ئەنوەر :کوردستان وکورد لەچەند لێکۆڵینەوەیەکی مێژوویدا،چ١،چاپخانەی بابان،سلێمانی،٢٠١٠ ز.
(٣٢) محمد ئەمین زەکی بەگ : خولاصەیەکی تاریخی کوردوکوردستان لە زۆر قەدیمەوە تاکو ئەمڕۆ،ب١،سلێمانی،٢٠٠٦ ز.

(٣٣) مینۆرسکی : مینۆرسکی و کورد، و / حەمە سعید کەریم،. بغداد، ١٩٨٤ ز.

(٣٤) میرزا شکراللە سنندجی: هۆزو تیرەی تایەفەی کورد لە کوردستانی ئەردەڵان.وتەنوەری سوڵتانی،سلیمانی،٢٠٠٦ ز.

(٣٥) ماهشەرەف خانم مەستووردی کوردستانی : مێژووی ئەردەڵان،و/ حسن جاف و شکور مستەفا،بغداد، ١٩٨٩ ز.

(٣٦) محمد أمین زەکی : خولاسەیەکی تاریخی کوردو کوردستان، ب٤، سلێمانی، ٢٠٠٦ ز.

(٣٧) مەحەمەد ئەمین هەورامـــی : کاکەیـــی،چاپخانەی (حوادث)،بەغداد،١٩٨٤ز.

(٣٨) محمد سهیل تەقوش : مێژووی دەوڵەتی سەفەوی، و/ شاخەوان محمد، چ١،چاپخانەی رۆژهەلات،هەولێر،٢٠١٠. ز.

(٣٩) ------------عوسمانیەکان لەدامەزراندنیانەوە تاکو بەسەر خەلافەتدا،و/ئەریمان خۆشناو،چ١،چاپخانەی رۆژهەلات،هەولێر،٢٠٠٩ز.

(٤٠) محمد حەمە باقی،شۆرشی شیخ عوبەیدوللای نەهری،چ(١)،چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە،هەولێر،٢٠٠٠ ز.

(٤١) محمد حرب : سوڵتانەکانی عوسمانی،و/ ابراهیم ئەحمەد شوان،چ١،چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە،هەولێر،٢٠٠٤،ل٩.

(٤٢) نازناز محمد عبدالقادر: میرنیشینەکانی کوردستانی رۆژهەلات—لەسەردەمی فەرمانرەوای قاجارەکاندا، لێکۆڵینەوەیەکی مێژوویی و رامیاری و ئابووری یە، چ١، هەولێر، ٢٠٠١ ز.

(٤٣) نەجاتی عەبدوللە:کوردستان وکێشەی سنووری(عوسمانی-فارسی ١٦٣٩-١٨٤٧)،چ١، هەولێر،دەزگای موکریانی، ٢٠٠٠ز.

(٤٤) نەوشیروان مستەفا ئەمین :کوردو عەجەم، مێژووی سیاسی کوردەکانی ئێران، چ٣ ،سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیژی،سلێمانی،٢٠٠٠ ز.

(٤٥) نادر فەتحی بۆکانی : کرۆنۆلۆگی کوردستان،هەولێر، ٢٧٠٣ک.

(٤٦) هەژار :مێژووی ئەردەلان، چ١، چاپخانەی تازە نگاە، تهران،٢٠٠٢،ل ٩٤.

(٤٧) واسیلی نیکیتین : کورد و کوردستان، و/ خالیدی حسان، هەولێر،چاپخانەی زانکۆی کوردستان ١٩٩٨ ز.

**سەرچاوە رەسەنە کوردیەکان**

(٤٨) شەرەفخانی بەدلیسی : شەرەفنامە، و / مامۆستا هەژار،،چ٣، هەولێر،٢٠٠٦ ز.

**سەفەرنامە کوردیەکان**

(٤٩) میجەرسۆن،سلێمانی ناوچەیەك لە کوردستان،وەگێرانی لە ئینگلیزیەوە /مینە،چ١،سلێمانی٢٠٠٧ز.

**گۆڤارە کوردیەکان**

(٥٠) حەسەن احمد : حکومەتی زەند و چەند تێ ڕوانینێك، گۆڤاری (کاروان)، ژ(١٢٧)،١٩٩٨ ز.

(٥١) عەلی تەتەر : کەریم خانی زەندو بزاڤێن لەشکری و سیاسی، مەتین، گۆڤاری ژمارە ١١٠، ئاداری ٢٠٠١ ز.

(٥٢) علی تەتەر : کەریم خانی زەند و بزاڤین لەشکری و سیاسی،گۆڤاری (مەتین)،ژ(١٠٩)،شوباتی ٢٠٠١ ز.

(٥٣) حەسەن احمد: حکومەتی زەند و چەند تێروانینێك، کاروان، گۆڤار، ژ،(١٢٧)؛ ١٩٩٨ز.

(٥٤) فەلەکەدین کاکەیی :کەریم خانی زەند پاریزەری میللەت،هەولێر،وەزارەتی رۆشنبیری،ژ ٤٥٣)؛١١ی ئاداری ٢٠٠٨ ز.

(٥٥) گۆڤاری مێژوو وەرزی،کۆمەلەی رۆشنبیرانی مێژووی کوردستان،ژ ١٦،سالی چوارەم، ٢٠١٠ ز.

(٥٦) گۆڤاری مێژوویی وەرزی،کۆمەلەی رۆشنبیرانی مێژووی کوردستان،ژ ١٨،سالی پێنجەم،٢٠١١ ز.

**ماســـتەر نامە کوردیەکان:**

(٥٧) نعمت شهاب /کوردستانی رۆژهەلات لەسەردەمی فەرمان رەوایەتی زەندیەکان،ماستەرنامە،هەولیر،٢٠٠٦ز.

**ســـەرچاوە فارســـیەکان**

(٥٨) دیوید الکساندر:ابزاز آلات جنگ ' تهران،نشر کارنگ،١٣٨٧هـ.

(٥٩) خەلیل ناصر :کارهای شیشه کشور اسلامی،تهران،نشر کارنگ،١٣٨٣ هـ.

(٦٠) علي رضا اوسگلی : ایران در سه قرن گزشته، ج١، تهران،١٣٢٣هـ.

(٦١) عبدالله رازی : تاریخ کامل ئیران –از تأسیس سلسلة ماد تا انقراض قاجار، تهران، ١٣٦٧ هـ.

(٦٢) میرخان تلایی :ارگهای کریم خان،سنندج،نشر سیدا ١٣٨٩ هـ.

(٦٣) میرزا شکرالله سنندجی،فخر الکتاب،تحفه ناصری در تاریخ و جغرافیا کردستان،تهران،١٣٧٥هـ.

(٦٤) مهدی مظفر ساوجی:شهد اما شوکرات،غزل اجتماعی معاصر ازعهد مشروتة تا دهةی هفتادض۱،کتابسرای تندیس، ۱۳۸۲.
(٦٥) ناصر خلیلی :گرایش به غرب در هز عثمانی و قاجار و هند،تهران،نشر کارنگ،۱۳۸۳هـ.

**سەفەرنامە فارسیەکان**

(٦٦) کارستن نیپور : سفرنامه کارستن نیپور، ت/پرویز رجبی،چ۱،تهران،۱۷٦٥ز.

**فەرهەنگە فارسیەکان**

(٦٧) محمد معین، فرهنگ فارسی، تهران، ۱۳۷٦ه

**سەرچاوە عەرەبیەکان**

(٦٨) آتینه دانش:نادر افشار شاه ایران ۱۱۰۰-۱۱٦۰ ت/صادق رضا زاده شفق،تهران،ط۱،م.جعفری، ۱۳۸۹ هـ.
(٦٩) دونالد ولبر :ایران ماضیها وحاضرها،ت/د.عبدالنعیم حسنین،القاهرة،۱۹٥۸،ص۹٦.
(۷۰) شیخ عبدالواحد : الأكراد و بلادهم تاريخ الشعب الكردى منذ أقدم العصور الى العصر الحالى، د.م.، د.ت.
(۷۱) صادق نشأت : مصطفى حجازى، صفحات عن ایران،ط۲،بغداد، ۱۹٦۰ م.
(۷۲) عبدالجاليل فيلي:اللور(الكورد)الفيليون فى الماضى والحاضر،ط۱،مطبعة وزارة التربية،،اربيل، ۱۹۹۹م.
(۷۳) كمال مزهر احمد : دراسات فى تاريخ ايران الحديث والمعاصر، بغداد، ۱۹۸٥ م.
(۷٤) كارل بروكلمان:تاريخ شعوب الأسلامية،ت/بنية امين فارس،منير بعلبكى،۱۹۷۷.

**سایتەکانی ئینتەرنێت**

(۷٥) www.qcastle.com
(۷٦) www.persianblog.ir.com
(۷۷) www.goghrafu-shz.blogfa.com
(۷۸) www.ografi-sh.blogfa.com
(۷۹) WWW.Damghani.zet.ir
(۸۰) www.karimxan.pic.com
(۸۱) www.ar.wikipedia.org
(۸۲) www.sotakhr.com

تێبینی ئەم وێنانە لە ئینتەرنێت وەرگیراون



کەریم خانی زەند (١٧٥١-١٧٩٤ز)



لوتف عەلی خانی زەند دوا میراتگری بنەماڵەی زەندیەکان

١٧٨٩-١٧٩٤



کەریم خانی زەند و سەرکردەکانی لەکاتی کۆبوونەوەدا

# دەوڵەتی عوسمانی لە نێوان ساڵانی( ١٨٠٩-١٨٣٩ ) ( چاکسازییەکانی سوڵتان مەحمودی دووەم، محمد علی پاشا، بزووتنەوەی وهابی )

فاخر عالی عبابکر

**پێشەکی:**

گرنگی مێژووی دەوڵـەتی عوسمـانی لـەوە سەرچاوە دەگرێ کـە تـوانی لـە میرنشینێکی بچووکەوە خۆی بگەیەنێتە پۆپە و ئەو پەڕی دەسـەڵات و سـنووری خـۆی فـراوان بکـات و بگاتـە سـنووری ئیمپراتۆریـەتێك، لـە هەرسـێ کیـشوەری ئاسیاو ئەوروپا و ئەفریقیا فەرمانڕەوایی بکات و بۆ ماوەی زیاتر لە شەش سـەدە وەك دەوڵـەت و دەسـەڵات خـۆی ڕابگرێـت، شـتێکی بەڵگـە نەویـستە هـەموو بونێکیش لە سەرەتادا لە تەمەنی لاوەتی و گەنجیدا لەو پەڕی بەهێزی و چالاکی دا دەبێ؟؟ دەوڵەتی عوسمانی لـە سـەرەتادا بـۆ مـاوەی نزیکـەی دوو سـەدە لـە تەمەنی هێز و دەسەڵاتدا توانی چەندین فراوانخوازی بکات و تـەواوی ناوچـەکانی دەوروبەری بخاتە ژێـر دەسـەڵاتی خـۆی، بـەڵام دواتـر بـە شـێوەیەکی هێـواش و لەسـەرخۆ بـەرەو بـێ هێـزی چـوو تـاکو گەیـشتە ڕادەیـەك لەدەسـت دەربـچێ کۆنترۆڵکردنی ئاسان نەبێ بۆیە چەند سوڵتانێك هەوڵی چاکسازیان دا یەك لەوانـە سوڵتان مەحمودی دووەم بوو لە ماوەی سـاڵانی(١٨٠٩–١٨٣٩) بـەهۆی گەنـدەڵ بوونی بارودۆخی دەوڵەت و ئـەو کێشە و گـیرو گرفتانـەی ڕووبـەڕووی سـوڵتان و دەوڵـەتی عوسمـانی ببوونـەوە بـیری لـە ئەنجامـدانی چاکـسازی کـردەوە، لـە

ئەنجامدا توانی چەند کار و پرۆژەیەك بەجێ بگەیێنێ وەکو پرۆژەی سەرەکی لە ناوبردنی سوپای ئینکشاریەکان(یەنی چەریەکان) کە پێی وابوو گرفتی سەرەکی تێك چوون و گەندەڵ بوونی بارودۆخی وڵات کارگێری ئەوانن، دوای چەند هەوڵێك کێشەی ئینکشاریەکانی بە لەناوبردن چارەسەر کرد، هەروەها چەند کارێکی تری ناوخۆی لە ڕووی کارگێری و کۆمەڵایەتی و خوێندن و ڕۆشنبیریەوە ئەنجامدا، بەڵام سەرهەڵدانی چەند هێزێك لە ناوچەکەدا بوون بە کێشە بۆ سوڵتان مەحمود و دەوڵەتی عوسمانی ئەوانیش دروست بوونی بزووتنەوەی وەهابی(موحدین)ەکان لە سەرەتادا و محمد علی پاشا، سوڵتان مەحمود لە ڕێگەو یارمەتی محمد علی توانی بزووتنەوەی وەهابی لەناو ببات، بەڵام دواتر محمد علی خۆی بوو بە کێشە بۆ دەوڵەتی عوسمانی و داوای قەرەبوو کردنەوەی لە دەوڵەتی عوسمانی دەکرد بەرامبەر لەناوبردنی بزووتنەوەی وەهابی و بەشداری کردنی لە هێرش کردنە سەر یۆنان کە ئەوەش کێشەیەکی تر بوو بەرۆکی سوڵتانی گرتبوو، ئەم ڕووداوانەش کاریگەریان لەسەر دەزگا کارگێڕیەکانی دەوڵەتی عوسمانی دروست کردبوو.

ئەم توێژینەوەیە ئەم لایەنە گرنگانەی لەخۆ گرتووە کە ببوونە ڕووداو گەلێکی دیاری ئەو سەردەم و دابەش کراوەتە سەر دووبەش، بەشی یەکەم لە دوو باس پێکهاتووە لە باسی یەکەم دا بە شێوەیەکی گشتی باسی چاکسازیەکانی سوڵتان مەحمودی دووەمم کردووە وەك تەوەرەیەکی سەرەکی بابەتەکە لە باسی دووەمدا باسی بارودۆخی دەوڵەتی عوسمانی پێش فراوانخوازی و چونیان بۆ وڵاتانی عەرەبی کراوە، هەروەها بەشی دووەمیش دوو باسی لەخۆ گرتووە باسی یەکەم محمد علی پاشا و باسی دووەم بزووتنەوەی وەهابی.

بەشـێوەیەکی باباتیانــە و نیمــچە وردەکــاری باســی لێــوە کــراوە، ئــەو سەرچاوانەی لەم توێژینەوەیەدا بە شێوەیەکی سەرەکی سوودم لـێ وەرگرتـوون ئەمانەن: (فرید بك، د.سهیل تەقوش، محمود شـاکر، د.علـی وەردی، د.زەکـەریا قورشون، د.محمد احمد دەرنیقە، گۆڤاری مێژوو ژمارە دوو کە ناوی کتێبەکانیان لە کۆتایی توێژینەوەکەدا لە لیستی سەرچـاوە و پـەراوێزەکان هـاتووە، گومـانی تێدا نییە هیچ کارێکیش بێ کەم و کوڕی نابێ و هەموو هەڵەو کەم و کورتیەکیش لە ئەنجامی کـارکردن و هەوڵدانـەوە دەبێـت ئەگـەر کـار نـەکرێ هەڵـەش نـاکرێ، ئامانجیش لە کار بەدەست هێنانی سوود و بەرهەمە و گەیاندنیەتی بـە دەوروبـەر و کۆمەڵگە بۆ دروست کردنی کۆمەڵگەیەکی چالاك و بەرهەم هێن.

### عوسمانیەکان(١٢٩٩-١٩٢٤):

دەوڵەتی عوسمانی وەکو دەسەڵات لە سەرەتادا میرنـشینێکی بـچووك بـووەو دواتـر دەسـەڵاتی فـراوان بـووە بەڕادەیـەك پێـی وتـراوە ئیمپراتۆریـەت کـە بـۆ ماوەی(٦٢٥)ساڵ فەرمانڕەوایی کردووە لە هەر سێ کیشوەری(ئاسـیا، ئـەوروپا، ئەفریقیا) لەگەڵ هاتنی مەغۆلەکان بۆ ترکستان هۆزە تورکەکان کۆچیان کرد بـە ئاراسـتەی ڕۆژئـاوای ئـەنادۆڵ کـە لـە نێوانیانـدا موسـڵمانی تـورك هـەبوون و لـە ئاسـیای بـچووك نیـشتەجێ بـوون بــە سـیفەتی سـەرکردە لەسـەر گروپـە جەنگاوەرەکان لە خزمەتی سەلاجقەی ڕۆم[1].

لـــە دوای مردنـــی ســـەرکردەکەیان(ئـــەرتوغرول) کوڕەکـــەی بـــە نـاوی(عوسمـان(١٢٨٨-١٣٢٦) شـوێنی بـاوکی گرتـەوە خۆشـی وەك سـوڵتان ڕاگەیاند ئەم ناوەش تاوەکو ڕوخانی ئیمپراتۆریەت بوو بە ناسـنامەی دەسـەڵاتی سوڵتانەکان و هەر بەو نـاوەش ناسـران، وە نـاوی(عوسمـان) بـوو بـە ناسـنامەی دەوڵەتەکەیان هەروەها (عوسمان)ی یەکەم باری ئاینی و سەربازی و سیاسی بـۆ تورکە عوسمانیەکان دیاریکرد[2].

## بەشی یەکەم

### باسی یەکەم: چاکسازی لە سەردەمی سوڵتان مەحمودی دووەم(١٨٠٩-١٨٣٩)

### کورتەیەك لەسەر مێژووی چاکسازیەکان لە دەوڵەتی عوسمانی:

مێژوونوسان سەردەمی سوڵتان سلێمانی قانونی(١٥٢٠-١٥٦٦) بە سەردەمی زێرینی دەوڵەتی عوسمانی دادەنێن بەڵام لە پاش مردنی سوڵتان سلێمان دەوڵەتی عوسمانی دیاردەی لاوازی ڕووی تێ دەکات بەڵام ئەم بێ هێزییە بە شێوەیەکی کاریگەر نەبوو بەڵکو بە شێوەیەکی لەسەرخۆ بەرەو بێ هێزی دەچوو ئەمەش بە شێوەیەکی ڕوون و خێرا بەدیار نەکەوت، تاکو ساڵی(١٦٨٣) لە کاتی دووەم گەمارۆدانی شاری(ڤیەننا) کە سوپای عوسمانی سەرنەکەوت لە گرتنی ئەو شارەدا و پاشەکشەی کرد کە زۆر لە مێژوونوسان ئەو ساڵە بە سەرەتای دەست پێکردنی لێك هەڵوەشانی دەوڵەتی عوسمانی دادەنێن[٣]، بۆیە هەندێ نووسەر ئاماژە بە دەوری چەند کەسایەتیێك دەکەن کە لە بواری چاکسازی دا دەوریان هەبووە لەوانە(لوتفی پاشا) یەکێك بووە لە وەزیرەکانی سوڵتان سلێمانی قانونی، نامەیەکی نووسیوە بە ناونیشانی(ئاسەف نامە) ئاماژەی بە هەندێ لایەنی لاوازی دەوڵەت کردووە[٤].

بەڵام هەندێ نووسەری تر دەیبەنەوە بۆ نیوەی دووەمی سەدەی هەژدە لە هەوڵی سوڵتانەکانی ئەو ماوەیە وا دەردەکەوێت بەتایبەتی سوڵتان مستەفای سێیەم(١٧٥٧-١٧٧٤) کە هەوڵی چاکسازییەکانی سوپا و لایەنی دارایی داوە، ڕای تەواو لە نێوان ئەم دوو ڕایە ئەوەیە چاکسازی کردن وەك بیرۆکە مێژوویەکی کۆنی هەیە و بە شێوەیەك دەگەڕێتەوە بۆ نیوەی یەکەمی سەدەی(١٧) ئەگەر بە شێوەیەکی زۆر سەرەتایی و سادەش بووبێت چونکە سەرەتای دەرکەوتنی دیاردەی لاوازی لە دەوڵەتی عوسمانی بۆ ئەو ماوەیە دەگەڕێتەوە، بۆیە لەو کاتە

بەدواوە هەندێ لە سوڵتانەکانی عوسمانی داوا لە بیرمەندان و کەسانی شارەزا دەکەن بیرو بۆچونی خۆیان لەسەر چۆنیەتی چارەسەرکردنی کێشەکانی دەوڵەت دەربڕن، یەك لەو بیرمەندانە(قۆچی بەگ) ئەفسەرێکی عوسمانی بوو لە کۆشکی سوڵتان موورادی چوارەم(١٦٢٣-١٦٤٠) لە نامەیەکدا بۆ سوڵتان باسی هۆکارەکانی لاوازبوونی دەوڵەت و ڕێگا چارەکانیش دەکات و دەڵێ: (جێبەجێ کردنی یاساکانی ئیسلام بە چاکی هۆکاری سەرەکییە بۆ چارەسەرکردنی کێشەکانی دەوڵەت)(٥).

چاکسازێکی تر بە ناوی(حاجی خەلیفە) کە لە ساڵی(١٦٥٣) نامەیەك دەنێرێ بۆ سوڵتان محمدی چوارەم بە ناونیشانی(دستور العمل لاصلاح الخلل) واتە(پەیڕەوی کارکردن بۆ چارەسەرکردنی کەم و کورپیەکان) بەم شێوەیە دوو ئاراستەی چاکسازی لە دەوڵەتی عوسمانی دەرکەوتن ئاراستە و گروپی یەکەم دەیان گوت بە گەڕانەوەمان بۆ سەر جێبەجێ کردنی بنەماکانی ئاینی ئیسلام و چاکسازیەکان چارەسەر دەبن و دێنە ئەنجام، بەڵام گروپی دووەم لە ژێر کاریگەری پێشکەوتنەکانی ئەوروپا گوتیان دەبێت هەمان بەرنامە و شێوازی ئەوروپا بگیرێتە بەر لەمەدا گروپی دووەم سەرکەوتنیان بەدەست هێنا، لە کۆتایی خەلافەتدا توانیان دەسەڵات بگرنە دەست.

لەم ڕووەوە(داماد ئیبراهیم پاشا) کە پلەی سەرۆك وەزیرانی(صدر الأعظم)ی وەرگرتن لە سەردەمی سوڵتان ئەحمەدی سێیەم(١٧٠٣-١٧٣٠) بە یەکەم بەرپرسی عوسمانی دادەنرێت کە زۆر بایەخی بە شارەزا بوون لە بارودۆخی ئەوروپا داوە بۆیە دەوڵەتی عوسمانی دەستی کردووە بە ناردنی(سفیر) بۆ ئەوروپا وەك(محمد چەلەبی) بە سەفیری دەوڵەت نێدرا بۆ فەڕەنسا لە ساڵی(١٧٢٠)، چاکسازیەکانی دەوڵەتی عوسمانی لە سەدەی هەژدە زیاتر لە

بواری سەربازی بوو بە هۆی ئەو شکستە زۆرانەی سوپای عوسمانی تووشی ببوو، وە سوپای ئینکشاریەکانیش ئەرك و کاری خۆیان بەجێ نەدەگەیاند، بە هاتنی سوڵتان سەلیمی سێیەم(١٧٨٩) چاکسازیەکان هەندێ لایەنی تریشی گرتەوە بەلام بەرپابونی شۆڕشی فەرەنسی(١٧٨٩) بڵاوبونەوەی بنەماکانی (ئازادی، برایەتی، یەکسانی) پێویستی چاکسازیکردنی لە دەوڵەتی عوسمانی بەدیارخست بەتایبەتی دوای داگیرکردنی میسر لە ساڵی(١٧٩٨) کە ویلایەتێکی عوسمانی بوو، وە چینی بورجوازی تازەپێگەیشتوش پشتگیری چاکسازیەکانی دەوڵەتی دەکرد بۆ ڕزگاربونی لەو بارودۆخە ئەگەرچی لاوازیش بوو[٦].

**بارودۆخی دەوڵەتی عوسمانی پێش هاتنی سوڵتان مەحمودی دووەم:**

بارودۆخی سەڵتەنەت لە ساتە وەختی هاتنی سوڵتان مەحمود بۆ سەر دەسەڵات بە کات و ساتێکی زۆر ئاڵۆزدا تێدەپەڕی کە سوپای(یەنی چەری) ئینکشاری بە هاوکاری موفتی(شیخ الاسلام) لە دەوڵەت توانیبویان سوڵتان سەلیمی سێیەم لەسەر تەخت لابدەن لە ساڵی(١٨٠٧) توانیان زۆرێك لە وەزیر و کاربەدەستانی دەوڵەت بکوژن و هەموو قوتابخانە و دامەزراوەکانی پەیوەست بە چاکسازی کردن هەڵبوەشێننەوە زۆربەی ئەفسەرە چاکسازی خوازەکانیش بکوژن، پاشان یەنی چەریەکان(مستەفای چوارەم)یان لە شوێنی سەلیمی سێیەم دانا کە وەك ئامرازێك بوو بە دەستیانەوە[٧]، ئەم کارەش وای لە لایەنگرانی چاکسازی و دۆستانی سوڵتان سەلیمی سێیەم کرد بەم کارە ڕازی نەبن و هەوڵی گێڕانەوەی سوڵتان سەلیم بدەن ئەوە بوو(مستەفا پاشای بیرق دار) وە یان(بیرق دار پاشا) کە یەکێك بوو لە کەسە نزیکەکانی سوڵتان سەلیمی سێیەم، لەو کاتەدا فەرمانڕەوای(روستوك) بوو لە بولگاریا لە ساڵی(١٨٠٧) بەخۆی و هێزێکەوە

گەڕایەوە ئەستانە و دەستی بەسەرداگرت و چوو بۆ ڕزگارکردنی سوڵتان سەلیمی سێیەم بەڵام(سوڵتان مستەفای چوارەم) فەرمانی کوشتنی سوڵتان سەلیمی سێیەم و مەحمودی دووەمی دابوو سوڵتان سەلیم بەرکەوتبوو بەڵام سوڵتان مەحمود بەهۆی خۆ حەشاردانی ڕزگاری ببوو لەبەر ئەوە(بیرق دار پاشا) سوڵتان مستەفای چوارەمی کوشت و سوڵتان(مەحمودی دووەم)ی لە شوێنی داندرا[٨]، لە ساڵی(١٨٠٨) بیرق دار پاشاو(صدر الاعظم) هەستان بە چاکسازی سەربازی بۆ دروست کردنی سوپایەکی نیزامی وەك خۆ ئامادەکردنێك بۆ جێگرتنەوەی سوپای ئینکیشاریەکان بەڵام سەرکەوتنیان بەدەست نەهێنا لە دروست کردنی ئەم سوپایە ئینکیشاریەکان وەکو خۆیان مانەوە. ئەمەش تاکو سەر نەبوو بەڵکو بۆ ماوەیەکی کاتی بوو سوڵتان مەحمود بێ دەنگی نواند تاکو بتوانێ خۆی بەهێز و قایم بکات بۆ ئەوەی لە داهاتوو بتوانێ بەرەو ڕووی ئینکیشاریەکان بێتەوە و لە ناویان ببات.

**سوڵتان مەحمودی دووەم کێیە؟** دەروازە

سوڵتان مەحمودی دووەم(١٧٨٤-١٨٣٩) کوڕی سوڵتان عبدالحمیدی یەکەم لە ساڵی(١٧٨٤) لەدایك بووە دوای لابردنی سوڵتان مستەفای چوارەمی برای لەسەر تەخت بووە بە سوڵتان[٩].

دایکی سوڵتان محمود ئافرەتێکی فەڕەنسی بوو بە ناوی(ئێمێ) ئافرەتێکی زۆر جوان و بە توانا بووە دەورێکی گەورە و کاریگەری هەبووە لە پەروەردەکردن و دامەزراندنی کەسایەتی محمودی کوڕیدا، دایکی سوڵتان محمود ئامۆزای(ڕۆزفین)ی خێزانی ناپلیۆن بووە کە یەکێکە لە ئافرەتە بەناوبانگەکانی مێژووی فەڕەنسا[١٠].

**هۆکارەکانی چاکسازیکردن لە لایەن سوڵتان محمودی دووەم:**

سوڵتان محمود کاتێ هاتە سەر حوکم تەمەنی(٢٤) ساڵ بوو زۆر سوودی لەو ماوەیە بینی کە دەست بەسەر کرابوو لەگەڵ سوڵتان سەلیمی سێیەمدا چونکە ئاگاداری کردبووەوە لە هەموو ئەو ریفورمانەی کە ئەیەوێت بیانکات، بارودۆخی گشتی دەوڵەت تەواو ئاڵۆز بوو، سوڵتان محمود بەرەو ڕووی چەند تەنگژەو مەترسی بوەوە بۆیە هەرزوو بیری لە چاکسازی کردن کردەوە لەبەر ئەم هۆکارانەی خوارەوە:

١- لە ڕووی کارگێڕی تووشی لێک هەڵوەشان ببوو میر و والیەکان بەپێی بەرژەوەندی خۆیان فەرمانڕەواییان دەکرد بێ ئەوەی گوێ بدەنە بەرژەوەندییەکانی وڵات.

٢- بڵاوبوونەوەی گەندەڵی یاسا و زوڵم و زۆرداری کاربەدەستان کە خۆیان بە هیچ یاسایەکەوە نەبدەستەوە تەنها مەبەستیان ناوو نازناوی گەورە بوو.

٣- بێ هێزی سوپای عوسمانی وایکردبوو هەندێ لە بنەماڵە و نەتەوە جیاوازەکانی دەوڵەتی عوسمانی بەتایبەتی جێگا دوورەکان ئەو بارودۆخە بە هەل بزانن و دەسەڵاتی خۆبەڕێوەبەری لە ناوچەکانی خۆیان ڕابگەیەنن وەك مەمالیکەکان لە بەغدا، ١٧٥٠-١٨٣١، بنەماڵەی جەلیلیەکان لە موسڵ ١٧٢٦-١٨٤٣، بنەماڵەی قەرانلی لە تەرابلوس ١٧١١-١٧٣٥، بنەماڵەی حسەینی لە تونس ١٧٠٥-١٨٨١، زیدییەکان لە یەمەن هۆزە عەرەبییەکان لە عێراق و شام بزووتنەوەی وەهابی لە سعودیە، میرنشینە کوردییەکان بابان و سۆران و بۆتان لە کوردستان[١١]، وە هەندێ هێزی تریش لە کاتی دەسەڵاتی سوڵتان محمودی دووەم بە ڕوویدا وەستانەوە وەك محمد علی پاشا لە مصر و هەندێ لە نەتەوە

ژێر دەستەکانی عوسمانی لە ئەوروپا وەك یۆنان لە ساڵی(١٨٠٤) دەستیان بە شۆڕش کردبوو.

٤- دەرکەوتنی بزووتنەوەی وەهابی لە حیجاز و هەروەها دووچاربوونی دەوڵەتی عوسمانی بە فشاری فارسی لە عێراق و چالاکییەکانی ڕووسیا لە وروژاندانی نەتەوەکانی بەلقان لەبەر ئەوەی نەیدەتوانی لە ڕوویاندا بوەستێ بەم هۆیەوە دەوڵەتی عوسمانی بیری لە چاکسازی کردەوە بەتایبەتی لە ڕووی سەربازییەوە بۆ ئەوەی بتوانێ هێزی ئینکیشارییەکان ڕێك بخاتەوە بەلاّم ئینکیشاریەکان بەمە ڕازی نەبوون بۆیە لە ساڵی(١٨٢٦) قەسابخانەیەکی بۆ لەناوبردنی ئینکیشارییەکان سازکرد(١٢).

٥- زۆری خەرجی و دارایی ببووە هۆی مایە پووچ بونی خەزێنەی دەوڵەت و زیادکردنی باجەکان لەسەر پیشەگەر و جوتیاراندا هەروەها لاوازبوونی بازرگانی بەهۆی بارودۆخ و کێشە ناوخۆییەکانەوە.

٦- سوپای یەنی چەری گرفتێکی دارایی گرانی بۆ دەوڵەتی عوسمانی دروست کردبوو ئەویش بەهۆی خەرجە زۆرەکانییەوە لەبەر ئەوەی یەنی چەریەکان بە شێوەیەکی کەم بەشداریان لە هێرش و کاری سەربازیدا دەکرد زۆرێکیان تەنها لە کاتی مووچە وەرگرتن دەچوونە سەربازگەکانیان کە لە سەردەمی سوڵتان محمودی دووەم ژمارەی ئەم پسولانە گەیشتبوە(١٣٥٠٠٠)سەدو سی و پێنج هەزار پسولە تەنها(٥٪)ی هەڵگرانی ئەم پسولەیە بەشدارییان لە ژیان و کاری سەربازی دا دەکرد(١٣).

### لایەنەکانی چاکسازی سوڵتان محمودی دووەم:

گومانی تێدانیە لە سیستەمی هەر وڵاتێکدا هەموو پێکهاتەیەکی دەسەڵات بەپێی ئەو پۆست و ئەرکەی پێیدراوە بەرپرسە لە هەر کەم و کورییەك کە

ڕوویدات وەك دامەزراوەكی لاوەكی یاخود سەرەكی ئەو دەوڵەتە، هەموو پێشهات و گۆڕانكارییەكان بەرەو ڕووی ئەو دامەزراوانە دەبێتەوە، سوپای عوسمانیش كە خۆی لە سوپای یەنی چەریدا دەبینیەوە تووشی گەندەلی هاتبوو تێكڕای چاكسازیەكانی تریش پەیوەست بوو بە ئینكیشارییەكان دەبو بۆ یەكەم جار چاكسازی لە ئینكیشارییەكانەوە دەستی پێ كردبووایە لەبەر ئەوەی گەندەڵترین دەزگا و دامەزراوەی دەوڵەتی عوسمانی سوپای ئینكیشاری بوو، لەبەر ئەوەی ببوونە ڕێگر لەبەردەم هەر كارێكی چاكسازی كە لە بەرژەوەندی ئەواندا نەبوایە، لایەنەكانی تری چاكسازی سوڵتان مەحمودی دووەم چەند بوارێكی تریشی گرتەوە وەك:

أ- چاكسازییە سەربازییەكان.

ب- چاكسازییە كارگێڕییەكان.

ت- چاكسازییە ئابورییەكان.

ج- چاكسازییە ڕۆشنبری و كۆمەلایەتییەكان.

**أ- چاكسازییە سەربازییەكان:**

سوڵتان محمود لەگەڵ بوونی بە سوڵتان لە ساڵی(١٨٠٨) لەوە دڵنیا بوو كە دەبێ چاكسازی ئەنجام بدرێ ئەوەش بەبێ لەناوبردنی یەنی چەرییەكان مەحاڵ بوو ئەوەش چەند ساڵێكی خایاند بەهۆی ئەو كێشە زۆرانەی كە ڕووبەڕوی ببونەوە یەكەم كاریش لە بواری چاكسازیدا بوژانەوەی ئەو قوتابخانە سەربازیانە بوو كە سەلیمی سێیەم دایمەزراند بوون یەك لە دڵسۆزانی خۆی هەڵبژارد بە ناوی(حسین پاشا) كە ناسرابوو بە حسێنە ڕەش و ئەندامێكی كۆنی یەنی چەرییەكان بوو سەرپەرشتی ئەو هێزەی كرد كە لە بەشی ئاسیاییەكەی ئەو بەری بسفور بوو ئامادە بوو بۆ جێبەجێ كردنی هەر فرمانێكی سوڵتان.

سوڵتان محمود بۆ ئەوەی شەرعیەت بدات بە کارە چاکسازییەکانی لە بواری سەربازییدا هەوڵیدا ڕای گشتی زانایانی ئاینی بە دەست بهێنێ لەمەشدا سەرکەوتوو بوو کە موفتی دەوڵەت فەتوای دا ئەو چاکسازیانەی سوڵتان دەیانەوێ بیانکات لەگەڵ شەریعەتدا دەگونجێ و پێویستە لەسەر هەموو کەسێك پشتگیری بکات، سوڵتان محمود لەساڵی(١٨٢٦) بە ئامادەبوونی سەرۆك وەزیران و کاربەدەستە باڵاکانی دەوڵەت و زانایانی دەوڵەت و زانایانی ئاینی و ژمارەیەك لە ئەفسەرانی یەنی چەری بانگهێشت کرد و ئەنجوومەنێکی لێ دروست کردن و پڕۆژەی چاکسازییەکەی خستە بەردەمیان.

پڕۆژەکەش ئەوەبوو (سێیەکی سوپای یەنی چەرییەکان هەڵبژێردرێن و بۆ ئەوەی بە درێژایی سنووری ڕۆژئاوای دەوڵەت مەشقیان پێ بکرێ لەسەر شێوازی تازە و جل و بەرگی تازەیان پێ بدرێ پڕۆژەکە زیاتر پێداگری لەسەر دیاردەکانی بەرتیلکاری سوپا دەکرد، ئەنجومەنەکە بە ڕووکەشی ئەم پڕۆژەیەی قبوڵ کرد و ناوی لێنرا(موعەلەم ئەسکینجی) واتە(پاسەوانی مەشق پێکراو) سوڵتان محمود پشتی بەو ڕاهێنەرانە بەستبوو کە(محمد علی پاشا) والی میسر بۆی ناردبوون.

بەڵام یەنی چەرییەکان لە بەرژەوەندی و دوا ڕۆژی خۆیان دەترسان خۆپیشاندەران لە ڕۆژی(٢٤/یونیو/١٨٢٦) لە گۆڕەپانی(ئات مەیدان) کۆبونەوەو دەستیان کرد بە ئاژاوە نانەوە دژی چاکسازییەکانی سوڵتان مەحمود و هەستان بە تالان کردنی ماڵەکانی دەوروبەری ئەو ناوچەیە سەرەتا سوڵتان پێی ڕاگەیاندن بڵاوەی لێ بکەن ئەوا لێیان خۆش دەبێ بەڵام هەر بەردەوام بوون ویستیان هێرش بکەنە سەر(باب عالي) ئەوەبوو سوڵتان ڕۆژی دواتر بەخۆی و هێزێکەوە کە زۆرێك لە زانایانی ئاینی و قوتابیانی قوتابخانەکان و خەڵکێکی زۆر

بەرەو شوێنی یاخی بووان بەرێکەوت فەرمانیشیدا بە(حسینە ڕەش) بە خۆی و هێزەکەیەوە لە بسفور پەڕینەوە زۆر بە توندی بە پاڵپشتی قوتابخانە سەربازی هێرشی کردە سەریان بە تێکدانی سەربازگە و قاوەخانەکان و شوێنی کۆبونەوەیان و قەدەغەکردنیان لە هەموو شوێنێك و هەڵوەشاندنەوەی تەریقەتی سۆفیگەری بەکتاشی و مەولەوی و داخستنی تەکییەکان سێ کەسیشی لە گەورەکانیان لە سێدارەدا، ئەم لەناوبردنەی یەنی چەرییەکان ئینکشارییەکان، پاش ئەم لەناوبردنە سولتان لە ڕێگەی لێژنەیەکی بۆ کاروبار و ڕێکخستنی سوپایێك هێناو سوپایەکی نوێی لەسەر شێوازی ئەورووپی پێك هێنا ناوی نا(عساكر منصوری) واتە(سوپای محمدی سەرکەوتوو) حسێنە ڕەش هەڵبژێردرا بەسەر عسکر واتە(سەرکردەی سپا)[١٥].

هەر لە درێژەی چاکسازییە سەربازیەکانی سولتان محمودی دووەم ڕاهێنەری سەربازی ئەورووپی هێنا بە ناوی(فۆن مولتکە) بۆ ڕاهێنان و مەشق پێکردنی سوپای عوسمانی هەروەها چەند قوتابخانەیەکی سەربازی دامەزراند لە سەرەتای سیەکانیشدا(١٨٢٨) قوتابخانەی مۆسیقای سەربازی(موزیکی هومایون)ی دامەزراند لەگەڵ قوتابخانەیەکی پزیشکی سەربازی.

**ب- چاکسازییە کارگێڕییەکان:**

دوای لەناوبردنی سوپای یەنی چەری ڕێگا لەبەردەم سولتان محمود واڵا بوو بۆ چاکسازیکردن لە لایەنەکانی تری دەوڵەت لەم ڕووەوە سولتان محمودی دووەم هەوڵی چاکسازی دا ویستی دام و دەزگاکانی دەوڵەت بەهێز بکات هەستا بە هەڵوەشاندنەوەی ژمارەیەکی ئەو پلەو پۆستە حکومیانەی کە تەنها بۆ ناو شۆرەت بوو ئەرك و ئیشی کاربەدەستانی دەوروبەری خۆی ڕێکخست و ئەو نازناوەشی لابرد کە خاوەنەکەی کارو فرمانی دیاریکراوی نەبوو، سولتان خۆشی

بە جموجۆڵ و چالاکیەوە ئامادەی دانیشتنەکانی دیوانی دەوڵەت دەبوو بە هاوشێوەی نەریتی سوڵتان سلێمان قانونی کە پشت گوێ خرابوو[16]، هەروەها بە بڕیاری سوڵتان محمود لە ساڵی(١٨٣١) یەکەم سەرژمێری دانیشتوان ئەنجام درا پێوانەی ڕووبەری زەویەکانی دەوڵەت دیاریکرا بە مەبەستی ڕێکخستنی کاروباری سەربازی و دیاریکردنی باجەکان، سیستەمی پشکنینی تەندروستیشی داهێنا تابتوانێ بەرەنگاری نەخۆشییەکان ببێتەوە بەتایبەتی نەخۆشی تاعون کە لە ساڵی(١٨١٢) ژمارەیەکی زۆری لە دانیشتوانی ئەستانەی لەناوبرد[17].

کاروباری ئەوقافی خستە ژێر چاودێری خۆی کە پێشتر لەژێر چاودێری موفتی وڵات و زانایانی ئاینی بوو بۆ ڕێکخستنی ئەو کارەش بەڕێوەبەرایەتییێك دانرا دواتر بوو بە وەزارەت، ئەوقاف و دەسکەوت و دەرامەتی ئەوقافیش کەوتە ژێر چاودێری دەوڵەت، ئەنجومەنی وەزیرانی لەسەر شێوازی ئەنجومەنی وەزیرانی ئەورووپی دامەزراند و چەند وەزارەتێکی تازەش دروست بوو وەك وەزارەتی دارایی و جەنگ.

لە ساڵی(١٨٣٧) نازناوی(صدر الأعظم) لابراو دەسەڵاتەکەشی درا بە کەسێك کە پێیان دەگوت(باش وەکیل) واتە وەزیری یەکەم کە هاوتای(سەرۆك وەزیران) بوو لە هەمان کاتدا وەزیرایەتی ناوخۆشی لەدەست دابوو.

کردنەوەی باڵوێزخانەکان(سفارة) لە ساڵی(١٨٣٤) دوای ئەوەی لە سەردەمی سوڵتان سەلیمی سێیەم داخرابوون لەلایەن ئەو کەسانەی دژی چاکسازی بوون، هەروەها ڕێکخستنی کاروباری پۆستە، وە لە ساڵی(١٨٣٨) سوڵتان مەحمود(ئەنجومەنی دادگەری دامەزراند) کە پێی دەگوترا(مجلس عالي احكام عدلية) کە بەرپرس بوو لە لێکۆڵینەوەو دانانی بەرنامە بۆ بابەتە سەرەکیەکانی بواری دادگەریی.

چاودێریکردنی سوڵتان و گەڕانی بە ویلایەتەکان بۆ لێکۆڵینەوە لە ژیان و گوزەرانی خەڵك بەتایبەتیش لە چۆنیەتی مامەڵەکردنی کاربەدەستان لەگەڵ خەڵك و مەسیحییەکان، هەوڵدان بۆ نەهێشتنی بەرتیل و کۆنەکردنەوەی باجی زیادە لە خەڵك، ساڵی(١٨٣٨) موچەی دیاریکراویشی بۆ کاربەدەستانی دەوڵەت برییەوە، گۆڕینی جل و بەرگی کاربەدەست و فەرمانبەرانی دەوڵەت بە پانتۆڵ و چاکەتی درێژی قۆپچەدار(تەربوش)ی لە جیاتی مێزەر لەسەر دانرا، گەڕاندنەوەی دەسەلاتی ناوەند بۆ ولایەتەکان بە لەناوبردنی دەسەلاتە خۆجێییەکان، گەڕاندنەوەی دەسەلاتی کارگێڕی عوسمانی بۆ ناوچە دابڕاوەکان، توانی ناوچەکانی سەرەوەی ئەلبانیا بگرێتەوە کە لە ژێر دەستی علی پاشا دابوو، ڕاهێنان فەرمانبەری بە توانا بەتایبەتی گەنجەکان فێری زمانە ئەورووپیەکان دەکران بۆ شێوازی نوێی بەڕێوەبردن، دامەزراندنی ئەنجومەنی ولایەتەکان کە موسڵمان و مەسیحی لەخۆ دەگرت کاریان گفتوگۆکردن بوو لەسەر بابەتە مەدەنی و داراییەکان لەسەر والیش پێویست بوو ڕەزامەندی ئەم ئەنجومەنە بەدەست بێنێ، وە دامەزراندنی لێژنەیەکی هەمیشەیی بۆ کاروباری نەخشە و پلانە گشتیەکانی چاکسازی لە ساڵی(١٨٣٧).

**ج- چاکسازییە ئابورییەکان:**

چاکسازی ئابوری ئەم لایەنانەی لە خۆ دەگرت کە لە خوارەوە بە شێوەی خاڵ دەیانخەینە ڕوو:

١- نەهێشتنی نووسینگەی دەست بەسەرداگرتن لە جیاتی ئەوە بڕیارێکی دەرکرد کە دەڵێ نابێت چیتر دەوڵەت ببێ بە بار بەسەر شانی خەڵك و دەست بەسەر سامانی هیچ کەسێك داناگیرێت هەرچەندە ئەمە زیانی بە دەوڵەت گەیاند بەلام دڵنیایی زیاتری بە خەڵك و کارمەندان بەخشی.

٢- داهات و دەرامەتی ئەوقافی خستە ژێر چاودێری کە پێشتر بۆ هەندێ مەبەستی لاوەکی بەکار دەهات.

٣- ئەو زەوی و زارانەی کە دەرەبەگ و خاوەن دەسەڵاتەکان دەستیان بەسەرداگرتبوو گەڕاندیەوە بۆ موڵکی گشتی دەوڵەت.

٤- هەڵوەشانەوەی ئەو باجانەی کە لە دانیشتوان و هاوڵاتیان لە کاتی تێپەڕبونیان بە ناوچەیەك وەردەگیرا لە لایەن کاربەدەستانی دەوڵەت هەروەها وەرگرتنی باجەکانی پێش هاتنی وادەی خۆی قەدەغە کرد.

٥- لێدانی پارەو ڕێکخستن و زیادکردنی مووچەی فەرمانبەران.

٦- دروست کردنی ڕێگاو پرد بۆ بەستنەوەی شارە گەورەکان بۆ ئاسانکاری هاتوچۆکردن، هەرچەندە ئەمە دەچێتە بواری ئاوەدانکردنەوە و بیناسازی بەڵام مەبەست لێی زۆرکردنی داهاتی دارایی بوو، هەروەها دروست کردنی نزیکەی(١٠٠) سەد کەشتی بۆ کاری بازرگانی لەگەڵ دامەزراندنی چەند کارگەیەك وەك کارگەی ڕستن و چنین کە جل و بەرگی سەربازانی ئامادە دەکرد.

**د- چاکسازییەکانی بواری ڕۆشنبیری و کۆمەڵایەتی:**

ئەم لایەنەی چاکسازی بۆ ئەو بێ هێزیەی دەوڵەتی عوسمانی بوو کە لەم بوارەشەوە تووشی دواکەوتووی هاتبوو خوێندن لە قوتابخانەکاندا لەسەر شێوازی کۆن دەڕۆیشتن بوارە زانستیەکانی تێدا پشت گوێ خرابوو، بۆیە سوڵتان محمودی دووەم بیری لە چاکسازی ئەم لایەنەش کردەوە بەڵام بە شێوەیەکی پێچەوانە بوو واتە لە سەرەوە بۆ خوارەوە ئەمەش لەبەر ئەوە بوو تاکو تووشی نارەزایی زانایانی ئاینی نەبێ تەنها ئەو قوتابیانەی حوجرەی هەڵدەبژارد کە ئارەزووی خوێندنی ئاینییان نەبوو بۆیە لە بواری پەروەردە و فێرکردن و بواری ڕۆشنبیری چەند کارێکی ئەنجامدا وەك:

* ئـەو قوتابیانـەی حـوجرەی هەڵدەبـژارد کـە ئـارەزووی خوێنـدنی ئاینییـان نەبوو بۆیـە دوو قوتابخانـەی بـۆ ئـەو قوتابیانـە دامەزرانـد لـەم دوو قوتابخانەیـە بنچینەکانی زمانـەوانی مێـژوو و بیرکـاری دەوترایـەوە کـە ئـارەزووی پەیوەنـدی کردنیان بە پەیمانگاکانی هونەری سەربازییەوە هـەبوو، وە ئـەو قوتابیانـەش کـە ئـارەزووی پەیوەنـدی کردنیـان بـە دام و دەزگاکـانی حکومەتـەوە هـەبوو قوتابخانەی(عدلیـة)و قوتابخانـەی(ئـەدەبیات)یـان بـۆ دامەزرانـدن کـە فێرکردنـی زمانی عەرەبی و فەڕەنسی و جوگرافیا و مێژوو و بیرکاری و زانستە سیاسیەکانی تێدە خوێنرا.

* قوتابخانـەی(عرفانیـة)ش لـە(بـاب العـالي) کـردەوە بـۆ فێرکردنـی ئـەو کارمەندانـەی کـە ئارەزوویـان هەیـە لـە دواڕۆژدا پلـە بـەرزە کارگێڕیـەکان بگرنـە دەست، لەگەڵ ئەم هەموو چاکسازیانە کەچـی دەرسـە ئاینیـەکان وەکـو خۆیـان مانەوە.

* چەندین قوتابخانەی سەرەتایی و ئامـادەیی تـازەی دامەزرانـد و خوێنـدنی سەرەتای کردە زۆرەملێ بە مەبەستی گەشەپێدان و پـەیمانگا هونەریـە باڵاکـانی دامەزراند.

* زیاد لە(١٠٠)قوتابی نارد بۆ ئەورووپا بۆ ئەوەی لە دوا ڕۆژدا ببن بە مامۆستا لەسەر شێوازێکی پێشکەوتوو.

* هەر لەو سەردەمە یەکەمین ڕۆژنامەی ڕەسمی حکومەت دەرچوو لـە سـاڵی ١٨٣١ بە ناوی(تقويم الوقائع).

* سوڵتان محمود گرنگییەکی زۆری دەدا بە فێربوونی زمانە ئەورووپییەکان لە وتوێـژ و پەیوەندیـەکان دا لەگـەڵ سـەفارەت و دەوڵەتەکانـدا پـشتی بـە موسـوڵمانەکان ببەسـتێ لـە جیـاتی ئـەو یۆنانییـە ڕۆشـنبیرانە کـە پێـشتر لـە

سەفارەتی عوسمانی و(باب العالي) کاریان دەکرد وەکو وەرگێڕ بەڵام پاش شۆڕشی یۆنانی ١٨٢١ ئەم کارە گرنگی زیاتری پێدرا.

* لە ساڵی ١٨٢٤ سوڵتان محمودی دووەم(تەرجەمە ئودەسی) واتە(نوسینگەی وەرگێڕان)ی دامەزراند کە دواتر بوو بە وەزارەتی دەرەوە لەم نوسینگەیەدا ژمارەیەکی زۆر لە ناو دارانی عوسمانی دەرچوون وەك(عالي پاشا، فواد پاشا، نامق کمال بەگ...).

* لە ڕووی تەندروستییەوە سوڵتان محمود ڕێنمای و هۆشیاری تەندروستی بە هاوڵاتیان دەگەیاند لەسەر نەخۆشییە باوەکان تاکو خۆیان بپارێزن[١٨].

**پەیوەندی چاکسازییەکان و کاریگەریان لەسەر کورد:**

دوای ئەوەی دەوڵەت بەرەو بێ هێزی و لاوازی چوو لە ڕووی سیاسی و ئابوری و بەڕێوەبەرایەتی کارگێڕی و سەربازی بەم هۆکارانەش نارەزایی لە ناو دەوڵەتی عوسمانی سەری هەڵدا بە شێوەی جیا جیا بەمەش چەند هەرێم و ناوچەیەکی لەدەستدا وەك هەرێمی قەرم بۆ ڕووسیا بوو ١٨٩٢ وە میسر و شامیشی لە دەستدا(١٧٩٨-١٨٠١)، لە لایەکی تردا ئەو هەرێمانەی کە لە ژێر دەسەڵاتیشیدا مابوونەوە تەنها بە ناو بوو هیچ پابەندێك و ئیلتیزامێکیان بۆ عوسمانییەکان نەبوو، وەك مەمالیکیەکانی بەغدا جەلیلیەکان لە موصل و محمد علي لە مصر هەموو ئەمانە وایان لە چەند دەسەڵاتدارێك و پیاوان و ڕۆشنبیرانی دەوڵەت کرد کەوا بیر لە چاکسازی بکەنەوە بۆ بەهێز کردنەوەی ناوەند و گێڕانەوەی سەروەری بۆ دەوڵەت.

گرنگترین چاکسازی سەرەتا ڕووی لە لایەنی سەربازی کرد بۆ ئەوەی دەسەڵاتی ناوەندی بەهێز بکەن و بەم هۆیەوە بتوانن بەسەر بێ هێزی و کەم و کورتیەکاندا زاڵ بن و دەست گرتن بەسەر هەموو ئەو هێزە دەرەبەگایەتیانەی کە

لە ناو دەوڵەتدا بوونیان هەیە، لەم چوارچێوەدا توانی دەست بگرێتەوە بەسەر مەمالیکەکان لە بەغدا ١٨٢٤ جەلیلیەکان لە موسڵ ١٨٣١ وە لە هەمان کاتدا نەی توانی دەسەڵاتی وەهابییەکان لە جزیرەی عرب لەناو ببات وە کۆتایی بهێنێت بە دەسەڵاتی محمد علی پاشا لە میسر، لە دوای ئەم هەوڵانە هەوڵیشدرا بۆ نەهێشتنی دەسەڵاتی کوردی لە ناوچە خۆجێیەکانی خۆیان وەکو میرنشینی سۆران و بابان و بۆتان و بادینان و هەکاری و بەدلیسی جێگای ئاماژەیە میرنشینەکان شێوازێکی سەربەخۆیان پەیڕەو دەکرد هەرچەندە پابەندیش بوون بە دەوڵەتی عوسمانی ئەوەبوو سوڵتان محمودی دووەم هەوڵیدا دەسەڵاتی ناوەند بەهێز بکات و بڕیاری جێبەجێ کردنی ئەو چاکسازیانەی دا کە دەیەویست ئەنجامیان بدات.

لە هەموو شوێنێکی دەوڵەتی عوسمانی کە کوردستانیشی گرتەوە بەبێ لەبەرچاو گرتنی ئەو ڕێکەوتنامەی ساڵی(١٥١٦) لەگەڵ سوڵتان سەلیم مۆرکرا بوو لە لایەن مەلا ئیدریسی بەدلیسی کە ئەو ناوچە کوردییانە کەوتبوونە سەر سنوری ئێران و ڕوسیا دەسەڵاتی خۆجێیان پێ بدرێ بەرامبەر پاراستنی سنورەکان بە مەرجێ دەسەڵات لە میرنشینەکان پشتاوپشت بێ بەڵام دەسەڵاتی عوسمانی وایان بیرکردەوە و پێیان وابوو کە بوونی ئەو میرنشینانە دەبێتە هۆی دەست تێوەردانی وڵاتانی دەرەوە لە کاروباری ناوخۆی دەوڵەتی عوسمانی هەوڵی تەواویدا بۆ نەهێشتنی میرنشینەکانی کورد و هەڵوەشاندنەوەی گشت پەیمانەکانی پێشتر کە لەگەڵ میرنشین و دەسەڵاتدارەکان بەسترابوو.

گرتنە بەری ئەم ڕێو و شوێنانە بۆ گەڕاندنەوەی ئەو زیانانەی بە دەوڵەت و دام و دەزگاکان کەوتبوو لەگەڵ بەهێزکردنی دەسەڵاتی ناوەندی و چاودێریکردنی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی لە داڕوخان و بێ هێزی بەم شێوەیە دەسەڵاتی کوردی

لـە ناوچـە خۆجێیـەکانی خۆیـان وەبـەر ئـەو سیاسـەتە چاکسازییەی دەوڵـەتی عوسمانی کەوت تووشی داڕوخان هات دەکرێ خاڵێکی تری نەهێشتنی دەسەڵاتی میرنشینە کوردیەکان هۆکاری ئابوری بێ بۆ زیادکردنی باجەکان و گەڕاندنەوەیان بۆ دەوڵەت و ناوەندی دەسەڵات ئەوەش لە لایەن کونسولی بەریتانی ئاماژەی پێ کراوە کە لە ساڵی ١٨٣٨ هاتۆتە کوردسـتان و وای ڕوون کردۆتـەوە کـە بـاج زۆر زیاتر کراوە لەسەر ناوچەکانی کوردستان لە چاو ساڵانی پێشتر.

هەر بۆ گەڕاندنەوەی دەسەڵاتی مەرکەزی دەوڵـەتی عوسمـانی داوای دروسـت کردنی سەربازی زۆرەملێی کرد(تجنيدا اجباري) پێویستیشە هەموو لایەنـەکانیش بەشداری تێدا بکەن[١٩].

**دەرئەنجامی چاکسازییەکانی سوڵتان محمودی دووەم:**

پێش ئەوەی سوڵتان محمـود بێتـە سـەر حـوکم دەوڵـەتی عوسمـانی تووشـی گەندەڵی و چـەند دیاردەیـەکی بێهێـزی هـاتبوو، بۆیـە لـە کـاتی هـاتنی سـوڵتان محمود بۆ حوکم بیری لە چاکسازی کردەوە تـاکو بتوانـێ بوژانەوەیـەك بـدات بـە دەوڵەتی عوسمانی لەم ڕووەوە چەندین چاکسازی ئەنجام دا کە توانی کاریگەری و دەرئەنجامەکانی لەسەر دەوڵەتی عوسمانی ڕەنگ بداتەوە، دەکـرێ لـەم چـەند خاڵەدا دەرئەنجامەکانی دیاریکەین:

* لەناوبردنی هێزی ئینکیشارییەکان گرو تین و هێزێکی زیندووی بە دەوڵەتی عوسمانیـدا تـاکو بتوانـێ چاکـسازییەکانی تـری دەوڵـەتی عوسمـانی ئەنجامبـدا چونکە ئینکیشاری لە بەردەم هەر هەوڵێکی چاکسازی دەوەستا کە بدرایە.

* ڕێکخـستنەوەی سـەروەت و داهـاتی دەوڵـەت کـە پێـشتر لـە لایـەن یـەنی چەرییەکان بە شـێوەیەکی خـراپ لـە بەرژەوەنـدی خۆیـان بـەکارهێنا، هـەروەها نەهێـشتنی دیاردەکـانی گەنـدەڵی بـە شـێوەیەك کـە لـە سـەرەوەی دەوڵـەتی

ئەنجامی دا وەك دامەزراندنی ئەنجومەنی وەزیران لەسەر شێوازی ئەوروپی ئەم هۆکارەش بووە هۆی ململانێی نێوان کارمەندە باڵاکانی دەوڵەت و سوڵتان بۆ سنوردارکردنی دەسەڵاتی یەکتر، وە کەمکردنەوەی ڕۆڵی دامەزراوەی ئایینی.

* گێڕانەوەی دەسەڵاتی ناوەندی دەوڵەت هەرچەندە توانی ئەم کارە بکات بەڵام بووە هۆی سەرهەڵدانی ئاژاوەگێڕی و ململانێی ناوخۆی وەك گێڕانەوەی دەسەڵاتی بەغدا بۆ ناوەندە مەمالیکەکان تووشی نەهامەتیێکی زۆر بوون لە ساڵی ١٨٣١ ئەم کارەی سوڵتان ڕەنگدانەوەیەکی خراپی لەسەر کوردستان هەبوو چونکە لەناووچوونی دەسەڵاتی میرنشینەکانی کورد بوو لەوانەش میرنشینی سۆران لە ساڵی ١٨٣١ لەناوبرد.

* چاکسازییەکان بە شێوەیەکی پچڕ پچڕ پێ دەگەیشت یاخود دەسەڵاتی خۆجێیی لە شوێنەکەدا مایەوە وەك(جەزیرەی عەرەبی) بەهۆی دووری لە مەڵبەندی فەرمانڕەوای چاکسازی تێدا دەرنەکەوت، هەروەها لە مصردا بواری چاکسازی خۆی لە دەستی محمد علی دا بینیەوە.

* چاکسازییە ئابورییەکان ژیان و گوزەرانی دانیشتوانی ئاسانتر و باشتر کرد بەتایبەتی دوای هەڵوەشاندنەوەی باج و ڕەسمە زیادەکان.

* چاکسازییە ڕۆشنبیری و کۆمەڵایەتییەکان هاوڵاتیانی وا لێکرد بەڕووی شارستانیەتی ڕۆژئاوا بکرێنەوە بەمەش کاریگەریان لەسەر دروست بوو بە هۆی خۆش گوزەرانی و گەڕان بەدوای شارنشینی ژیانێکی سەردەمی و هەوڵ دان بوو بۆ خۆ دەوڵەمەندکردن ئەمەش بوە هۆکاری لێك دابڕانی کۆمەڵگەی عوسمانی.

* گرینگدانی بە کردنەوەی خوێندنگاو بوارە جیاجیاکانی زانست و پشت گوێ خستنی حوجرەکانی بوونە بنەمایەك بۆ پێگەیاندنی چینێکی دیاری سیاسەتمەندارانی عوسمانی کە دواتر کاریگەریان لەسەر هەڵوێست و سیاسەتی عوسمانیدا هەبوو.

**باسی دووەم/بارودۆخی دەوڵەتی عوسمانی پێش فراوانخوازی و چونیان بۆ وڵاتانی عەرەبی:**

**- وەك كورتەیەكی مێژوویی و بەرچاوڕوونی خوێنەران:**

دەكرێ ئەم بارودۆخە لە سەردەمی(سوڵتان سەلیم)ەوە باسی لێوەبكری واتە لەگەڵ هاتنی سوڵتان سەلیم بۆ سەر دەسەڵات لەساڵی(١٥١٢-١٥٢٠) كە لەو كاتەدا لە فراوانخوازی وڵاتانی ئەورووپی دا بوو بەڵام دوای دەركەوتنی سەفەوییەكان وەك هێزێكی كاریگەر بە ڕووی عوسمانییەكان و بڵاوكردنەوەی مەزهەبی شیعەگەری و گرتنی چەند ناوچەیەكی ژێر دەسەڵاتی عوسمانی، دەوڵەتی عوسمانی هەڵوەستەیەكی كرد وەرچەرخانێك لە سیاسەتەكانی ڕەنگی دایەوە بەوەی ڕووی فراوانخوازی و سیاسەتەكانی بەرگری و هێرش بردنی گەڕایەوە ڕۆژهەڵات.

**سیاسەتی سوڵتان سەلیم لەسەر دوو بنەما وەستابوو:**

١- دەستگرتن بەسەر ڕێگەكانی بازرگانی نێوان ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا.

٢- فراوانخوازی لەسەر حیسابی هێزەكانی ڕۆژهەڵات.

بۆیە چەند پەیماننامەیەكی ئاشتی لەگەڵ هێزە ئەورووپیەكان دابەست تاخۆی بۆ گرفتەكانی ڕۆژهەڵات یەكلابكاتەوە[٢٠]، هەندێ لە مێژوونوسان گۆڕانی سیاسەتی سوڵتان سەلیم بۆ ئەوە دەگێڕنەوە كە فراوانخوازی عوسمانییەكان لە ئەورووپا گەیشتبووە خاڵی بنبەست بوون و ڕووبەڕوی هێزە گەورەكانی ئەورووپا ببووە بۆ هەڵوێستی هێرش بردنەوە وەستا بوو بۆ هەڵوێستی بەرگری هەروەها سەرهەڵدانی سەفەویەكانیش بە هۆیەكی تری گۆڕانی ئەم سیاسەتە دادەنێن بە ئامادەكیەكی تەواوە لە شەڕی چاڵدێران ١٥١٤ توانی بەسەر سەفەوییەكاندا سەربكەوێت.

**چونی عوسمانییەکان بۆ وڵاتانی عەرەبی و شام و مصر وەك دەروازە:**

سەرکەوتنی سوڵتان سەلیم بەسەر شا ئیسماعیل لە جەنگی چالدێران بۆ مەمالیکەکان کتوپڕو چاوەڕوان نەکراو بوو بەڵکو شکستێکی مەعنەویش بوو قانسو غوری هەستی کرد عوسمانیەکان لە دوو لاوە ئیش بۆ پاکتاوکردنی بارودۆخەکە لە ڕۆژهەڵاتی ئیسلامیدا دەکەن لە بەرژەوەندی خۆیان تا لەگەڵ مەمالیکەکاندا بەیەکدا بدەن بۆیە بێ لایەنی خۆیان نیشاندا و تەنها هێزێکی چاودێری بۆ حەلەب نارد.

چالاکییە فراوانخوازییەکانی عوسمانی لە دیاربەکر و ناوچەکانی زیلقەدر ئاماژە بەوە دەکەن کە بەبێ بازنەی سوران بە دەوری مەملوکی لە وڵاتی رافدەینی سەرەوە و ناوچەکانی عوسمانی پەیوەست و بەیەك نابەسترێتەوە، بۆیە وای لە سوڵتانی عوسمانی کرد ڕووبەڕووی ئەو هێزە مەملوکیە ببێتەوە کە بنکەی داکوتا بوو ڕێگەی بە سوپای عوسمانی نەدەدا لەوێوەوە بپەڕێتەوە بۆ ئێران ئەوەش بە ڕوون و ئاشکرا دەرکەوت سوڵتان سەلیم لە کاتی گەڕانەوەی لە چالدێران نیازی هەبوو لەگەڵ غوریدا بجەنگێن[21].

هەرچەندە سوڵتان سلیم ئەو هەڵوێست و سیاسەتەی گرتەبەر کارێکی دژە بەرامبەر بووی سەفەویەکان و هاوپەیمانیەتیان لەگەڵ مەمالیك و میرنشینەکانی دەوڵەتی عوسمانی بوو بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئەو گەلانەی ڕۆژهەڵاتی ئیسلامی دەیانویست لە دەسەڵاتی مەمالیکەکان ڕزگاریان بێت، بۆیە لە دوای گەڕانەوەی سوڵتان سەلیم لە شەڕی چالدێران ئەو میرنشینە ببووە جیاکەرەوەی عوسمانی و مەمالیکەکان میرنشینی زیلقەدری دایە پاڵ خۆی مەمالیکەکان ئەم کارەیان بە هێرش کردنە سەر دەسەڵات و سەرەوەی خۆیان زانی و بۆ گەڕانەوەی ئەو سەروەریەش خۆیان بۆ جەنگ ئامادەکرد لە هەمان کاتدا عوسمانییەکان دوای

ئەوەی لە نەبوونی کێشەو مەترسیە ڕاستەوخۆیەکانی خۆیان دڵنیا بوون خۆیان بۆ جەنگی مەمالیك ئامادەکرد و بەڕێکەوتن، قانسو غوریش کاتێ بەمەی زانی بەخۆی و سوپایەکەوە لە قاهیرە دەرچوو لە مەرج دابق باکووری حەلەب هەردوولا ئاڵوگۆڕیی نامەیان کرد و هەر لایەکیان سوکایەتیان بە نوێنەری یەکتر دەکرد تاکو لە(مانگی ئابی ١٥١٦) شەڕ لە نێوان هەردوولا بەرپابوو بە سەرکەوتنی عوسمانییەکان و خۆکوشتنی قانسوغوری کۆتایی هات.

سوڵتان سلیم بەرهەمی سەرکەوتنەکەی وەرگرت و حەلەب و عمان و حمصی گرتە خۆ، ئەو حەزی دەکرد واز لە مەمالیکەکان بهێنێت تا فەرمانڕەوای میسر بکات بە سیفەتی فەرمانڕەوایەتی خۆجێیەتی بەڵام سوڵتان مەملوکی تومان بای بە بیرۆکەی شکست خواردوو ڕازی نەبوو بۆیە سوڵتان سلیم ناچار جەنگەکەی گواستەوە بۆ مصر و بەرەو ڕووی بووەوە، سوپاکانی لە بەردەم دەرگاکانی قاهیرە دەرکەوتن لەساڵی ١٥١٧ لە ڕەیدانیە تۆپەکانی عوسمانی شکستێکی یەکلاکەرەوەیان تووشی مەمالیك کرد و تومان بای ڕای کرد بۆ دەلتا بەڵام دواتر گیراو لە سێدارەدرا[٢٢].

دەکرێ ئەم هەڵوێست و کارەی تۆمان بای و ڕازی نەبوونی بە فەرمانڕەوای خۆجێیەتی بۆ بڕواو متمانە بەخۆبوون بگەڕێتەوە لەگەڵ ئەوەشدا پێشتر بە شێوەیەکی سەربەخۆ فەرمانڕەوایەتی میسریان کردووە ڕەنگە ئەوە بە شکست و لەدەستدانی دەسەڵاتی سیاسی زانی بێ کە لەلایەن هێزێکی ترەوە فەرماندرا بکرێت و لە ڕووی کارگێڕییەوە سەر بەوان بن، لەگەڵ هاتنە ژێردەستی میسر و فراوانبوونی دەسەڵاتی عوسمانیەکان گرنگیەکی لەدەست بەرداربوونی(خەلیفە محمد متوکل)و خەلیفەی عەباسی دەردەکەوێت بە گواستنەوەی ڕەمزی خەلافەتی ئیسلامی لە مصرەوە بۆ ئەستەمبوڵ، هەرچەندە ئەمە چەند قسەو

باسێکی هەیە لە لایەن هەندێ لە مێژوونوسان ئاماژە بەوە دەکەن و دەڵێن سوڵتان سلیم چەند نامەیەکی بۆ سلێمانی کوڕی ناردووە لە ئەستەمبوول هیچ ئاماژەیەکی بە گواستنەوەی خەلافەتی نەکردووە بەڵام ڕاستی مێژوویی دەڵێ سوڵتان سەلیم نازناوی(خەلیفەی خوا لە هەموو زەویدا) لە خۆی نا پێش فەتحکردنی شام و میسر و ڕاگەیاندنی حیجاز بە سەردانەواندن و ملکەچ بوونی بۆ دەوڵەتی عوسمانی توانا و مەعنەوی ماددی بۆ بەدەست خست بەتایبەتی دوای چوونی مەککە و مەدینە بۆ ژێر دەسەڵاتی سوڵتان و بووە پەناگەیەك بۆ ئەو موسوڵمانانەی بە دوای یارمەتی دا دەگەڕان[٢٣].

**عوسمانیەکان لە وڵاتەکانی باکووری ئەفریقیا(جەزائیر، تونس،...):**

دوای ئەوەی عوسمانیەکان شام و میسریان کەوتە ژێر دەست ڕاستەوخۆ حیجاز بە مەککەو مەدینەوە مل کەچ بوونی خۆیان بۆ دەوڵەتی عوسمانی ڕاگەیاند ئەمەش بووە فراوانخوازیەکی گەورەی عوسمانی بەسەر هەرێم و وڵاتە عەرەبیەکان، بەڵام چەند وڵاتێکی تر لە ناوچەکەدا مابوونەوە عوسمانیەکان ویستیان ئەمانەش بەدەر نەبن لەژێر دەسەڵاتی عوسمانی بۆ ئەوەی لە داهاتوودا نەبنە کۆسپ و تەگەرە لەبەردەمیاندا.

**– جەزائیر:**

عوسمانییەکان لە سەردەمی سوڵتان سەلیمی یەکەمدا باکوری ئەفریقایان لە لیبیاوە تا مەراکیش دایە پاڵ خۆیان ئەمەش لەسەر داخوازی هێزە گیرۆدەبووەکانی ئەوێ بوو لە دژی هێزە ئەوروپییەکان بەهۆی ئەو هێرشانەی دەیانکردە سەر ناوچە موسڵمان نشینەکان، بۆ ئەوەی بچنە ژێر پارێزگاری عوسمانییەکان لە ساڵی ١٥١٩ لە سەردەمی سوڵتان سەلیم دوای بەیەك دادانی

لەگەڵ ئیسپانییەکان و سوڵتان محمدی شەشەم ی سوڵتانی حەفسی و تـونس و بەنی زیان لە تلسمان دژ بە هێزە نیشتیمانییەکان بـە سـەرکردایەتی خـەیرەدین بەربەڕۆسە جەزائیر چووە ژێـر دەسـەڵاتی عوسمانیـەوە، ئیسپانیا دانـی بـەوەدا نـەنا کـە جـەزائیر لـەژێر دەسـتی عوسمانیەکانـدا بـێ و چـەندین جـار هەوڵیـدا بیگێڕێتەوە کۆتا هەوڵیشی لـە سـاڵی ١٥٥١ بـوو بـەڵام لـەو کارەیـدا سـەرکەوتوو نەبوو دواتر ناچار بوو لەگەڵ ڕاستی لەدەست دانی ئەو وڵاتە ژیان بگوزەرێنێ.

— تونس:

تـونس و تەرابلوسـی ڕۆژئـاوا بەشـێك بـوون لـە حەفـسیەکان سـەرەتای سەدەی(١٦) ئەو دەوڵەتە بەرەو هەڵوەشانەوە دەچوو لـە سـاڵی ١٥٢٦ حەسـەن حەفسی کورسی دەسەڵاتی گرتە دەست و بەرەو هاوکاری لەگـەڵ ئیسپانیەکان هـەنگاوی نـا ئەمـە بـووە هـۆی پـچڕاندنی پەیوەنـدی لەگـەڵ(بـاب عـالي) بـەڵام خەیرەدین بەربەڕۆسە سوڵتان سـەلیمی ڕازی کـرد کـە بـە نیـازی شـەڕکردن بـوو لەگەڵ ئیسپانیا تاکو سەرەتا دەست بەسەر تونسدا بگرێـت بـەم جـۆرە سـوڵتان ڕازی بوو بەربەڕۆسە هێرشی کردە سەر تونس و حەسەن حەفسی بـە ئاراسـتەی بجایە ڕایکرد و پەنای بردەبەر ئیمپراتۆر شارلی پێنجەم ئیمپراتۆریش چوو بەدەم داواکەیەوە کەشتیگەلێکی بە ئاراستەی کـەنارەکانی تـونس چـوو تـوانی دەسـت بەسـەر(حلـق الـوادي) دابگرێـت بەشـی بـاکوری ڕۆژهـەڵاتی داگیرکـرد و حەسـەن حەفـــسی گەڕایـــەوە پایتـــەخت، بەرهەڵـــستکارەکانی توونـــسی بـــە یارمـــەتی عوسمانیەکان لە سـاڵی ١٥٤١ چـەند هەڵمـەتێکیان ڕێکخست و ئامانجیـان چـەند شوێنێك بوو کە سەربازگە ئیسپانیەکانی تێدا بوو هەروەك لەو کاتەدا دەسـەڵاتی

حەسەن حەفسی دارماو لە کۆتایدا ناچار بوو شارە کەناراویەکان بەجێ بهێڵێت و هاوڵاتیان دانیان نا بە دەسەڵاتی عوسمانی بەسەر ناوچەکەیان.

**- تەرابلوسی ڕۆژئاوا:**

ئیسپانیا لە ساڵی ١٥١٠ دەستی بەسەر تەرابلوسی ڕۆژئاوا داگرت و شارلی پێنجەم بڕیاریدا بیکات بە داگیرگەیەکی ئیسپانی تا ئەورووپیەکانی تێدا نیشتەجێ بکات، بەڵام ئیسپانیا بەرەو ڕووی هەڵمەتێکی دانیشتوانی ناوچەکە بوونەوە ناچار بوو ناوچەکە چۆڵ بکات و بیدات بە سوارەکانی قەدیس یوحەننا کە هەموو هیوایەکیان بە میر حەسەن حەفسی بوو بۆیە پەیوەندیان لەگەڵ دا بەست بەڵام حەسەن حەفسی لە ململانێیەکەدا شکستی خواردبوو سوارەکان نەیانتوانی دەسەڵاتی بیانی تێدا بسەپێنن لە ئەنجامی ئەو بەرهەڵستکاریە توندەی دانیشتوان و هاواریان بردە لای باب عالی و لە ساڵی ١٥٥١ کەشتیگەلێکی دەریایی نارد دەستی بەسەر تەرابلوسی ڕۆژئاوا داگرت لەو کاتەوە بو بە هەرێمێکی عەرەبی ئیسلامی لە ژێر دەستی دەسەڵاتی عوسمانی.

**- یەمەن:**

عوسمانیەکان لە ساڵی ١٥٣٨ یەمەنیان خستە ژێر دەستی خۆ بە سەرکردایەتی کەسێك بە ناوی(سلیمان پاشای خادم) هەڵمەتێکی سەربازیان بۆ نارد کە ئەرکی گرتنە خۆی ئەو وڵاتە لە ئەستۆ دابوو چونکە دەکەوتە سەر ڕێگای بازرگانی ڕۆژهەڵات هەروەها لە بەرژەوەندی دەسەڵاتی عوسمانیدا بوو کۆنترۆڵی باری ئەوێ بکات بۆ ڕووبەڕوبونەوەی پورتوگالیەکان و دەست گرتن بەسەر بازرگانی ڕۆژهەڵاتدا، پاش ئەوەی خۆی لە یەمەن بەهێز کرد سلیمان پاشای بۆ جەنگی بە پورتوگالیەکان نارد بەرەو کەناراوەکانی(کوجرات) لە وڵاتی هیند هەرچەندە چەند سەرکەوتنێکی بەدەست هێنا بەڵام لەبەردەم سەر

سنوری(دیو)دا شکستیخوارد بۆیە دوای چەند مانگێك ناچاربوو ناوچەکە بەجێ بهێڵێ و بگەڕێتەوە بۆ یەمەن پاشان دەوڵەتی عوسمانی چەند والیەکی دەست نیشان کرد کە دەسەڵاتی عوسمانیەکان لە یەمەن چەسپاند و بابەتی بازرگانی و قەڵەمڕەوی سیاسی دەوڵەتیان لە زەریای هیندیدا دڵنیاکرد(٢٤).

بەم شێوەیە سوریا حیجاز و میسر بە ئاسانی سەریان بۆ دەوڵەتی عوسمانی دانەواند و ملکەچی بوون لە ساڵی ١٥٥٦ بەشێکی زۆری جەزائیر و تونس و تەرابلوس چوبوونە ژێر دەسەلاتی عوسمانیەوە تەنانەت عێراقیش لە ساڵی ١٦٣٨ بەتەواوی لەژێر هەژموونی عوسمانیدا بوو بەڵام زۆربەی زۆری ئەو وڵاتانە لەژێر دەسەڵاتی مەمالیکەکان دابوو ڕاستەوخۆ لە لایەن ئەستەمبولەوە ئیدارە نەدەکران، لەبەر ئەوەی مەککە و مەدینە لەسەر حیسابی میسر یارمەتی دەدران لە دوای چوونی عوسمانیەکان بۆ میسر حیجاز بە مەککەو مەدینەوە ڕەزامەندی چوونە ژێر دەسەڵاتی عوسمانییەکان دەربڕی بە شێوەی دەسەڵاتی خۆجێیەتی یا خۆبەڕێوەبەری.

ئەو وڵاتانەی لەژێر دەسەڵاتی عوسمانیدا بوون شێوە ڕێکخستنێکی ئیداریان هەبوو کە هێڵی سەرەکی لە شێوەی ڕێکخستنی ئیداری فارسەکان و بیزەنتییەکان و سەلجوقی و مەمالیکەکان وەرگیرا بوو ئەم دابەشکردنە ئیداریەش بەم شێوەیە بوو هەتا ئەم ساڵانەی دوایش کە بچوکترین یەکەی ئیداری بریتی بوو لە گوند یا لادێ کۆمەڵێ لادێ ناحیەیان پێك دەهێنا کۆمەڵێك ناحیە قەزایان پێك دەهێنا کۆمەڵێکیش لە قەزا سەنجەق(لیوا)یان پێك دەهێنا کە لە لایەن پارێزگارەوە(متصرف) بەڕێوە دەبراو کۆمەڵێکیش لە لیوا ولایەتێکیان پێك دەهێنا و هەر ولایەتێکیش والیەکی هەبوو بە شێوەیەکی گشتی بە(پاشا) ناسرا بوو ئەویش لە بواری دادوەری و سەربازی سیاسیدا دەسەڵاتی

باڵای خۆی هەبوو بەرپرسی یەکەمیش بوو لە هێشتنەوەی پەیڕەو ئاسایشی گشتی کۆکردنەوەی باج و پەیوەندی لەگەڵ ئەستەمبول.

جیاوازی نێوان سیستەمی ئیداری عوسمانی و سیستەمی ئێستا لە سیستەمی عوسمانیدا چەند پارێزگا یا لیوایەك دەبوونە ولایەتێك و والیەکان هەبوو پێیان دەگوت پاشا بەڵام لە سیستەمی کارگێڕی دوای عوسمانی و سەدەی بیستەم بە دواوە گۆڕانکاری بەدوا داهاتوە لە دوای پارێزگا(لیوا) کۆتایی بە پلەی کارگێڕی دێت و چەند پارێزگایەکیش لە چوارچێوەی سنوورێکی دیاریکراو دەوڵەت پێك دەهێنن، لە سەدەی نۆزدە کۆی ولایەتە عەرەبیەکانی ژێر دەسەڵاتی عوسمانی بریتی بوون لە دوازدە ولایەت کە ئەمانە بوون: ولایەتەکانی(حیجاز، بەیروت، یەمەن، بصرە، بغداد، موصل، حلب، سوریا، جەزائیر، تەرابلوسی ڕۆژئاوا، تونس، میسر).

بەم جۆرە ولایەتە عەرەبییەکان بەم سیستەمە کارگێڕیە بەڕێوەدەبران هەتا نیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدە ولایەتە عەرەبیەکانی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست بریتی بوون لە چەند ولایەتێك وەك(موصل، بغداد، بەیروت، حلب، هەیداو، شام، دیمەشق) کۆی دانیشتوانیان لە شارە سەرەکیەکان(٥٠٠,٠٠٠)پێنج سەد هەزاری تێپەڕ نەدەکرد وە ئەوانەی نێو دورگەی عەرەبی بریتی بوون لە حیجاز و یەمەن، سەبارەت بە ژمارەی وڵاتە عەرەبیەکان نزیکەی نیوەی ئیمپراتۆریەتی عوسمانیان پێك دەهێنا پێش جەنگی جیهانی یەکەم دانیشتوانی دەوڵەتی عوسمانی وڵاتی میسری لێ دەرچێ بریتی بوو لە(٢٢)بیست و دوو ملیۆن لەم ژمارەیە(١٠,٥)دە ملیۆن و نیوی عەرەب بوون (٧,٥)حەوت ملیۆن و نیوی تورك بوون بەقیەکەشی بریتی بوون لە پێکهاتەکانی تر، لەسەر ئاستی نوێنەرایەتیش لە کۆی(٢٤٠)ئەندامی(مجلیس مبعوثان) ئەنجومەنی نوێنەران عەرەب

(٦٠)ئەندامیان هەبوو لە کاتێکدا (١٥)هی تورکەکان بوو سەرجەم ئەندامانیان لە سەرەوە دیاری دەکران عەرەب تەنها(٣) کورسیەکان لە کۆی(٤٠) کورسی ئەندام هەبوو هەرچەندە ئەم دابەش کردنەی ژمارەو کورسی ئەندامان بە شێوەی جیاواز ئاماژەی پێدراوە[٢٥].

فەرمانڕەوایەتی دەوڵەتی عوسمانی لە وڵاتە عەرەبیەکان دوای ئەوەی سنووری دەوڵەتی عوسمانی فراوان بوو بەڕێوەبردنی کارگێڕی کارێکی ئەستەم و گران بوو بۆ ئەو مەبەستە پەنایان بردە بەر دابەشکردنی ناوچەکان بۆ چەند ولایەتێك ولایەتەکانیش دابەشکرانە سەر چەند یەکەی ئیداری بچوك و بە سەنجەق ناسران ئەوانیش دابەش کرانە سەر یەکەیەکی ئیداری بچووکتر کە بە ناحیە ناونران، ئەم یەکە ئیداریانەش لە لایەن ژمارەیەك فەرمانبەر و بەرپرسی گەورە بەڕێوەدەبران بەم شێوەی خوارەوە:

١- والی:

ئەرکی ئەوەبوو لە کاروباری ئیداری سەربازی جێگای سوڵتانی دەگرتەوە هەروەها لە پاراستنی ئاسایش و کۆکردنەوەی باجەکان و ناردنی بۆ خەزێنەی دەوڵەت، ئەرکی والی شوێنێك لە شوێنێکی تر جیا بوو بۆ نموونە والی شام لە والیەکانی تر جیا دەکرایەوە کە پایەی میری حەجیشی هەبوو لە رووی سەرپەرشتی کردنی قافلەی حاجیان کە حاجی شام و ئەنادۆڵ و بەلقانی لەخۆ دەگرت و قافلەکە لە دیمەشقەوە دەردەچوو بە ڕۆژهەڵاتی ئوردن دا تێدەپەڕی بەرەو حیجاز.

**٢- سەنجەق و ناحیە:**

فەرمانڕەوایەتی سەنجەق و ناحیەکان کاریان بریتی بوو لە جێبەجێ کردنی فەرمانەکانی والی ئیداری ناوەندی و ڕاپەڕاندنی کاروباری ناوخۆ و پاراستنی ئاسایش و سەقامگیری لە ناوچەکاندا.

**٣- دەفتەردار:**

ڕاستەوخۆ لە لایەن سوڵتانەوە دادەمەزرێندرا ڕۆڵی بریتی بوو لە کاروباری دارایی لە ولایەتەکەدا وەکو خەزنەدار وابوو(٢٦)، بە شێوەیەکی گشتی ئەم چەند پایانە ڕوویەکی دیاری کارگێڕی دەوڵەتی عوسمانین لەگەڵ چەندین وردەکاری کارگێڕی لە دەوڵەتی عوسمانی بەکارهێنراون.

**بەشی دووەم:**

**باسی یەکەم/محمد علی پاشا(١٧٦٩-١٨٤٩):**

محمد علی پاشا لە ساڵی(١٧٦٩) لە شاری(کاوالا) لە مەکدۆنیا لەدایك بووە لەو کاتەی دەوڵەتی عوسمانی تووشی بێ هێزی ببوەوە، لە شاری ئەسکەندەریە لە(٢ئاب ١٨٤٩) مردوەو لە مزگەوتی محمد علی لە قەلاّ(قلعة) لە قاهیرە نێژراوە، دایك و باوکی بەڕەگەز ئەلبانین زمانی تورکی وەك زمانی دایك و زمانی ئەلبانیشی بە باشی دەزانی، باوکی بازرگانی دوخان(توباکۆ) بوو، لە تەمەنی چواردە ساڵی دایك و باوکی مردوون و بە هەتیوی ژیانێکی ناخۆشی بەسەر بردووە، لە تەمەنی لاویەتیدا خەریکی کاری بازرگانی و سەربازی بووە، پوور(پلك)ی محمد علی سەرپەرشتی کردوە و یارمەتی داوە بۆ بەدەست هێنانی پۆستەکانی دەوڵەت، دواتر کچی پوورەکەی بە ناوی(امینە نوسترەتلی) هێناوە، وە بە دامەزرێنەری بنەماڵەی عەلەوییەکان دادەنرێت و فەرمانڕەوایەتی میسر و سودانیان کردوە بۆ ماوەی(١٥٠)سەدو پەنجا ساڵ لە ماوەی نێوان

سالانی(١٨٠٥-١٩٥٣) محمد علی توانی ژێرخانی میسر ببوژێنێتەوە لەسەر شێوازێکی نوێ و سەردەمیانە لە تاریکی سەدەکانی ناوەڕاست ڕزگاری بکات[٢٧].

لە ساڵی(١٨٠١) سوپای عوسمانی گەیشتە(ئەبی قیر) بۆ دژایەتی کردن و ڕووبەڕوبونەوەی سوپای فەرەنسییەکان بە سەرکردایەتی ناپلیۆن محمد علی یەکێك بوو لەو ئەفسەرە بچووکانەی لەناو ئەو سوپایەدا بوو، لە هەمان ساڵیشدا سوپای فەرەنسییەکان میسریان بەجێ هێشت و کشانەوە، بۆ ماوەی چوار ساڵ ئاژاوە و کێشە لەسەر فەرمانڕەوایەتی لە قاهیرە بەردەوام بوو، لەو ماوەیەدا پیاوێك دەرکەوت کەوا پێشبینی دەکرا یەکێك بێت لەو کەسایەتییە مەزنانەی بتوانێ تەکان بە مێژووی عەرەبی لە سەردەمی نوێدا بدات ئەویش محمد علی پاشا ناسراو بە(کبیر)[٢٨] لەو ماوەیەدا دەوڵەتی عوسمانی(خورشید پاشا- حاکمی ئەسکەندەریە)ی کردە والی میسر محمد علی لە هەمان کاتدا وەك یەکێك لە سەرکردە سەربازییەکان لە میسر لە سەربازگەی عوسمانی سەرپەرشتی و ڕێکخستنی کاروبارەکانی ناوخۆی ولاتی دەکرد ولاتیش لە بارودۆخێکی ناوخۆی ئابوری زۆر خراپ دابوو بەرپرس و بەڕێوەبەرە کارگێڕیەکان باجیان لەو ڕێژەیەی خۆی کە هەبوو زیاتر کرد، خەڵك و دانیشتوانی میسر ئەو بارە گرانەی بەهۆی باجەکانەوە بەسەریان دا سەپێنرا خۆیان پێیان ڕانەگیرا، بە خۆپیشاندانێکەوە ڕوویان کردە ئەزهەر بۆ ئەوەی زاناکانی ئەزهەر کار بۆ نەهێشتنی باج بکەن، محمد علی هێزەکانی بۆ پاڵپشتی خۆپیشاندەران هێنایە سەر شەقام و ڕایگەیاند دژی ئەو زوڵم و زۆریە کە بەسەر مەمالیك و دانیشتوانی میسر دا سەپێنراوە، گەلی میسریش پاڵپشتی خۆیان بۆ محمد علی و هێزەکەی دەربری[٢٩]. بەم جۆرە محمد علی زۆر بە زیرەکانەو لهێاتووی خۆیەوە توانی سۆز و خۆشەویستی دانیشتوانی قاهیرە بەدەست بهێنێ و سوڵتانی عوسمانیش وەك والی و

فـەرمانڕەوای وڵاتـی بناسـێنێت، لـە سـاڵی(١٨٠٥) دەسـەڵاتی گرتـە دەسـت بـۆ مـاوەی(٤٣)چـل و سـێ سـاڵ فـەرمانڕەوای میـسری کـرد لـە سـەردەمی فەرمانڕەوایەتیەکەیدا دەسەڵاتێکی توند و تیژانەی هەبوو بەڵام لـە هـەمان کاتـدا بونیاتنەرێکی پلە یەك بوو ئەو میسری نوێی دامەزراند لـە ڕووی شارسـتانی و فەرهەنگیەوە کردی بە پێشکەوتووترین وڵاتی عوسمانی(برۆکلمان)ی مێژوونوسی ئـەڵمانی دەڵێـت: (محمـد علـی ئەگەرچـی خۆویـست و هەڵـە کـار بـوو بـەڵام ئاواڵاکردنی میسر لە بەرامبەر شارستانیەتی ئـەوروپا بـۆ ئـەو دەگەڕێتـەوە)[٣٠].

دەکـرێ چـەند لایـەنێك لـە کارەکـانی محمـد علـی لـە مـاوەی دەسـەڵاتی فەرمانڕەوایەتیدا بخەینـە ڕوو، لـە مـاوەی دەسـەڵات و فەرمانڕەوایەتیەکەیدا لـە نیوەی یەکەمی هەمان سەدەی میسری گەیاندە ئاستێکی پێشکەوتوو بەتایبـەتی لە بواری سەربازی و ئابوری، هەروەها توانی بەرپەرچی هێرشـێکی ئینگلیزەکـان بداتەوە لە(مانگی نیسانی ١٨٠٧) کـە کرایـە سـەر شـاری(رشـید)، وە لـە سـاڵی (١٨١١) فەرمانی کوشتنی(٣٠٠)سـێ سـەد کەسـی لـە مەمالیکـەکانی دەرکـرد لـە قەڵای قاهیرە، هەروەها ئاگادارکردنەوەیەکی لە لایەن حکومـەتی ئەسـتەمبۆڵەوە بـۆ هـات لـە ڕێگـەی والی دیمەشـق بـە نـاوی(والی یوسـف کـنج) بـەم شـێوەیەی خوارەوە:

**نامەی(یوسف کنج) والی دیمەشق بۆ محمد علی پاشا سەبارەت بە هێرشی سێ قۆڵی:**

لە میسر و شام و عێراق بۆ لەناوبردنی بزووتنەوەی موحـدین(حرکـة الوهابیـة) بزووتنەوەی وەهابی لە ناو جەرگەی دوورگەی عـەرەبی، ئامـانجی پاککردنـەوەی ئاینی ئیسلامە لەو شتە زیادانـەی هاتونەتـە نـاوی بـۆ ڕێکخـستنی موسـڵمانەکان لەبەر ئەوە شوێن کەوتووەکانی بە(موحدین) دەناسـرێن بـەڵام دوژمنـەکانیان بـە وەهابی ناویان دەبەن، ئەمە لە دەوڵەتی عوسمانی(مقبول) پەسەند نـەبوو لەبـەر

ئەوەی داوای یەکخستنی دورگەی عەرەبی دەکرد، لەمەشدا سەرکەوتو بوو بە یارمەتی وەرگرتن لە نێوان بانگخوازەکان و بنەماڵەی ئال سعود ئاراستەی بڵاوبونەوەی بنەماکانی بیروباوەڕی بەرەو وڵاتانی دراوسێ چوو بە هەردوو ڕێگەی بانگەوازی گفتوگۆ و زمان و جیهادی شمشێر، هێرشێکی بەهێزی کردە مەزارگە گەورەکانی شیعە لە کەربەلا لە ساڵی(١٨٠١) ئەم کارە شای فارسەکانی زۆر تورە کرد، وە بێزاری سوڵتانی عوسمانی بەهۆی فراوانبوونی دەسەڵاتی موەحدینەکان لە حیجاز لەبەر ئەوەی سوڵتانی عوسمانی هەڵگری نازناوی(حرمین الشریفین) بوو لەو کاتەشدا سوڵتانی عوسمانی محمودی دووەم نەیدەتوانی سوپا بۆ سەر موحدینەکان بنێرێت لەبەرئەم هۆکارانە:

١- سەرقاڵی دەوڵەتی عوسمانی بەو پێشکەوتنخوازیانەی ناپلیۆن لە شەڕەکانیدا بەدەستی دەهێنا.

٢- ترسان لە گەڕانەوەی فەرەنسییەکان و ئینگلیزەکان بۆ سنوری وڵاتانی ئیسلامی و شەڕکردن لەگەڵیاندا.

٣- ململانێ و ناکۆکی بەردەوامی نێوان ڕوسیا و دەوڵەتی عوسمانی[٣١].

بۆیە داوای لە محمد علی کرد بەو کارە هەڵبستێ و هێرش بکات سەر موەحیدنەکان کە بە وەهابی ناسراون، دەربارەی هێرشکردنە سەر(نەجد) لە دژی بزووتنەوەی وەهابی لە نیمچە دورگەی عەرەبی، وە زنجیرە هێرشێکی کردە سەر(سودان النیلي) بە فەرماندەی(ابراهیم پاشا)ی کوڕی، هەروەها بەشداری لەناوبردنی شۆڕشی یۆنانیەکان کرد بەڵام بەهۆی دەست پێشخەریەکەوە ڕاگیرا، بەهۆی بەشداری کردنی لەم شەڕەوە محمد علی داوای لە دەوڵەتی عوسمانی کرد سوریای پێ ببەخشن بەرامبەر ئەو بەشداریکردنەی دژی دامرکاندنەوەی شۆڕشی یۆنانییەکان کردی دەوڵەتی عوسمانیش بەم داوایەی محمد علی ڕازی نەبوو

گوێی پێ نەدا، محمد علی بەم هەڵوێستەی عوسمانیەکان زۆر تورە بوو بۆ بەدەست هێنانی ئەو داواکاریەی لە دەوڵەتی عوسمانی کردبوی لە ساڵی(١٨٣٢) هێزێکی بە سەرکردایەتی کوڕەکەی(ابراهیم پاشا) نارد تاکو گەیشتە ئەنادۆڵ بەلام ئارەزوو مەبەستی ئەوە نەبوو دەوڵەتی عوسمانی لەناوببات بەڵکو دەیویست هێزو(هیمنە)ی خۆی و ولایەتە عەرەبیەکانی پیشانی هەڵوێستی دوژمنکارانەی باب عالی بدات، ئەوەبوو باب عالی بە پاڵپشتی ئەوروپیەکان توانیان سنورێك بۆ دەسەڵاتی محمد علی دابنێن، ئەم بەشداری کردنەی ئەوروپیەکان لەبەر دەوڵەتی عوسمانی نەبوو بەڵکو لەبەر پاراستنی بەرژەوەندیەکانی خۆیان بوو چونکێ لەو کات دەوڵەتی عوسمانی بێ هێز ببوو زەویەکی فراوانیشی لەژێر دەستدا بوو چاویان لە دابەش کردنی میراتی دەوڵەتی عوسمانی کردبوو، بەرامبەر هەر هێزێك دەوەستانەوە ئەگەر مەترسی هەبوایە بۆ سەر بەرژەوەندیەکانی خۆیان[٣٢]، وە محمد علی لە رووی سیاسیەوە مەیلی بۆ سیاسەتی فەرەنسی دەچوو.

**محمد علی و دژایەتی کردنی وەهابیەکان:**

دوای ئەوەی دەوڵەتی عوسمانی رووبەرووی مەترسی وەهابیەکان بوەوە لە نیمچە دورگەی عەرەبی سوڵتان مەحمودی دووەم لە رێگەی والی دیمەشق هەر وەك لەو نامەی والی دیمەشق بۆ محمد علی نارد و پەیوەندی پێکرد بۆ ئەوەی دژایەتی وەهابیەکان بکات و حیجاز لەژێر دەستیان رزگار بکات، وا دیار بوو هەمان مەبەستیش لای محمد علی لە هزر و عەقلیدا چەکەرەی کردبوو، بۆیە محمد علی هێزێکی گەورەی بە سەرکردایەتی(توسون پاشا)ی کوڕە گەورەی خۆی ئامادەکرد لە ساڵی(١٨١١) هێزەکە لە دەریای سوورەوە بۆ بەندەری یەنبوع پەڕییەوە دواتر مەککەو مەدینەی داگیرکرد، وەهابیەکان لە بەردەمیاندا

پاشەكشەیان كرد تا هاوینی ساڵی(١٨١٢) بەسەریان دادان و تێكیان شكاندن هەر بۆیە محمد علی ناچار بوو خۆی بچێت بۆ حیجاز و سەرپەرشتی هێزەكە بكات[٢٣].

دوای ئەوەی محمد علی بەشداری شەڕی یۆنانی كرد و شەڕەكەش لە ساڵی ١٨٢٦ كۆتایی هات و لە پێشتریش دا بزووتنەوەی وەهابی لەناوبردبوو بێ ئەوەی هیچ دەسكەوتێكی هەبێت لە لایەن دەوڵەتی عوسمانییەوە لەسەر ئەو بنەمایە و چەند فاكتەرێكی تری فراوانخوازی و بەرژەوەندیەكانی خودی محمد علی ستراتیژی ناوچەكانی شام لە ڕووی سیاسی و جوگرافی و ئابوریەوە هێرشی كردە سەر شام و داگیری كرد[٢٤].

داگیركردنی شام لە لایەن محمد علی زەنگێك بوو بۆ دەوڵەتی عوسمانی و دەروازەیەكیش بوو بۆ پێشەوەچوونی بەرەو ناوچەكانی تری ژێردەستی عوسمانی چونكە شارەكانی شام یەك لە دوای یەك دەكەوتنە دەستی سوپای محمد علی دواتر چیای تۆرۆسیان بڕی گەیشتنە ئەستەمبۆل، دەسەڵاتی سوڵتان ڕووبەڕوی مەترسی بوەوە ڕەنگە ئەوەش بۆ ئەوە بگەڕێتەوە كە لەبەری ئەو بەری تەنگە بسفۆرەوە گوێی لە دەنگی تۆپەكانی میسر بێت، ئەم كارەی محمد علی بووە هۆی دڵەڕاوكێ لە پایتەختی وڵاتە گەورەكانی ئەوروپا چونكە وایانزانی لەم نزیكانە ئەستەمبۆل داگیر دەكرێت و میراتی پیاوە نەخۆشەكە لە جیاتی خۆیان دەكەوێتە دەست محمد علی ئەوەی زیاتر دەوڵەتە ئەوروپیەكانی ترساند ئەوەبوو كە سوڵتان محمودی دووەم لە یەك لە چركە ساتەكانی مەترسیدا پەنای بردە بەر ڕوسیا بەبێ ئەوەی پرس و ڕاوێژ بە وەزیرەكانی بكات، ڕووسیا هەشت كەشتی جەنگی ڕەوانەی بسفۆر كرد بە بیانوی بەرگری كردن لە سوڵتان و دەوڵەتەكەی كە لەسەرو بەندی هەرەسهێنان دابوو، ابراهیم پاشا دەیویست لە

پێشڕەوی سوپاکەی بەردەوام بێت و ئەستەمبول داگیر بکات تاوەکو دەوڵەتانی ئەوروپی سەغڵەت بکات، ئەو بە چاوێکی سەربازیەوە دەیڕوانیە کارەکە بەڵام محمد علی باوکی دەیویست پێشڕەویەکە ڕابگرێت و بە چاوێکی دبلۆماسیانە سەیری ڕووداوەکانی دەکرد ئەوەبوو محمد علی یەك لە دوای یەك نامەی بۆ کوڕەکەی دەنارد بۆ ئەوەی شەڕ ڕابگرێت، ابراهیم پاشا بە نا بەدڵی شەڕەکەی ڕاگرت و گوێ ڕایەڵی باوکی کرد دوای دانوستان و مانۆڕی سیاسی کە بالوێزی وڵاتانی ئەوروپی هەوڵ و کۆششی زۆریان بۆ کرد تا لە کۆتایی مانگی نیسانی ١٨٣٣ ئاشتی لە نێوانیاندا بەرقەرار بوو کە بە ڕێکەوتنامەی کۆتاهیە ناسراوە بە ناوی شارێکی تورکیایە سوپای محمد علی گەیشتبوە ئەوێ لە گرنگترین بەندەکانی ئەو ڕێکەوتنامەیە ئەوەبوو کە محمد علی سەرەڕای میسر حوکمڕانی شامیش بکات بە مەرجێ لەدوایدا نەبێت بە دەسەڵاتێکی میراتگری[٣٥].

ڕێکەوتنامەی کوتاهیە وەك ئاگربەستێکی کاتی وابوو محمد علی بەو ڕێکوتنامەیە ڕازی نەبوو ئامادە نەبوو ڕێکەوتنامەکە ئیمزا بکات، بەڵام لەژێر فشاری دەوڵەتە ئەوروپیەکان بە ناچاری ڕێکەوتنامەکەی ئیمزا کرد، لە بەرامبەریشدا سوڵتان هەستی بەبێ هێزی و شەرمەزاری دەکرد کە بەرامبەر والیەکی خۆی ئاوا شکست بخوات بۆیە خۆی بۆ گێڕانەوەی سەروەری دەوڵەتی عوسمانی ئامادە دەکرد و بڕیاریدا سوپاکەی بەهێز بکات تا بتوانێت بەسەر سوپای میسردا سەربکەوێت بۆ ئەم مەبەستەش چەند ئەفسەرێکی بە ئەزمونی وەك(فۆن ملباخ، فیشەر، فون ونك، بارون فون مولتکە)ی داواکرد تاکو سوپاکەی لەسەر شێوازێکی نوێ ڕابهێنێت و بەرەو پێشیان ببات، لە دوای بەسەربردنی ئەو ماوەیە لە ساڵی ١٨٣٩ سوڵتان محمود پێی وابوو سوپاکەی بەهێز بوەو بە جۆرێ دەتوانێ خۆی بەرامبەر سوپای میسردا ڕابگرێت و تێکی بشکێنێت

هەروەها چاوەڕوانی ئەوەشی لە خەڵکی شام دەکرد لە کاتی هەڵگیرسانی شەڕەکەدا لە دژی سوپای میسر و ابراهیم پاشی کوڕی محمد علی ڕاپەڕن و شۆڕشی دژی بەرپا بکەن و لە دواوە زەفەری پێ ببەن بەرەو رووی شکستیان بکەنەوە[٢٦]. بۆیە دواین کاری سوڵتان ئەوەبوو کە پێش مردنی فەرمانی بە حافز پاشا کرد کە هێرش بکاتە سەر ئیبراهیم پاشا لە حەلەب، وا دیار بوو محمد علی دڵخۆش بوو بەوەی کە بەرپرسیاریەتی دەست پێ کردنی شەڕ بکەوێتە ئەستۆی سوڵتان و فەرماندە سەربازیەکەی، بۆیە فەرمانی بە کوڕەکەی دا لە ناوەڕاستی مانگی حوزەیراندا هێرش بکاتە سەر سوپای عوسمانی لە شەڕی نسیبین سوپای عوسمانی زیانێکی زۆری لێکەوت و حافز پاشا بەزۆر توانی خۆی لە هێرشی سوپای میسری ڕزگار بکات لە لای خۆشیەوە ابراهیم پاشا توانی شوێن پێی سوپای عوسمانی هەڵگرێت و بەرەو مەرعەش و مەلتیە، لەو شەڕەدا هێزی سەربازی بە تەواوی تێکشکا و سوڵتان محمودیش بەوە ڕانەگەیشت کە هەواڵی ئەو تێکشکانەی بەرگوێ بکەوێت کە لە ڕۆژی(٣٠ی حوزەیرانی ١٨٣٩)دا کۆچی دوایی کرد هەرچەندە ئەو سیاسەتمەدارێکی سەرکەوتو نەبوو کە نەیتوانی بەرنامەی چاکسازیەکانی جێبەجێ بکات، بەڵام یەکێکە لە سوڵتانە باشەکانی دەوڵەتی عوسمانی[٢٧]، بەم شێوەیە بۆ جاری دووەم سوپای میسر سەرکەوتنی بەدەست هێنا ترس و بیمیش لە لای ئەوروپیەکان زیاتر بوو بۆیە لە ساڵی ١٨٤٠ پەیماننامەی لەندەنیان بەسەر محمد علی دا سەپاند و دەوڵەتی عوسمانیش پەسەندی کرد لە گرنگترین بەندەکانی ئەم ڕێکەوتنامەیە ئەمانە بوون:

١- فەرمانڕەوایی میسر دەدرێتە محمد علی بە شێوەیەکی میراتگری دەتوانێ هەتا لە ژیاندا مابێ فەرمانڕەوایی ناوچەکانی خواروی وڵاتی شام بکات کە ناسراوە بە ولایەتی عەککا کە شاری عەککاش دەگرێتەوە بەو مەرجەی کە ئەمە

قبوڵ بکات و لە ماوەی(١٠)ڕۆژدا دەبێ دورگەی کریت و وڵاتە عەرەبیەکان و هەرێمی ئەدرنە چۆل بکات کەشیتگەلی دەریایش بۆ عوسمانیەکان بگێڕێتەوە.

٢- ئەگەر لە ماوەی ئەو(١٠)ڕۆژەدا ڕازی نەبوو ئەوا تەنها ولایەتی میسری پێ دەدرێ وە ئەگەر ڕازیش نەبو ئەوا (١٠)ڕۆژی تری پێ دەدرێ وە ئەگەر لە ماوەی ئەو(١٠)ڕۆژەش وەڵامی نەدایەوە ئەو کات سولتان بۆی هەیە لە ولایەتی میسریش بێ بەشی بکات.

٣- محمد علی پاشا دەبێ باج بدات بە باب عالی ئەو ڕێژەیەش دیاری دەکرێت بەپێی ئەو وڵاتانەی کە پێی دەدرێن.

٤- لە میسر و عەککا یاسای عوسمانی جێبەجێ دەکرێت و محمد علی جێنشینەکانی بەناوی سولتانەوە باج کۆدەکەنەوە.

٥- هێزە دەریایی و وشکانیەکانی میسر دەبن لە هێزی دەوڵەتی عوسمانی.

٦- هاوپەیمانان بۆیان هەیە ئەگەر محمد علی ئەمەی قبوڵ نەکرد هێز بەکاربهێنن بۆ جێبەجێ کردنیان لەسەر داوای سولتان هەموو ڕێگەیەك بگرنە بەر بۆ پارێزگاری کردن لە تەنگە ئاویەکانی عوسمانی لە هەر جۆرە هێرشێك.

٧- بەریتانیا بە هاوکاری نەمسا بۆی هەیە یارمەتی دانیشتوانی وڵاتی شام بدات کە گوێ ڕایەڵی محمد علی نەکەن.

٨- کەشتیە بەریتانی و ڕوسی و نەمساویەکان بۆیان هەیە بچنە نێو گەروی بسفۆر بۆ پارێزگاری کردن لە ئەستەمبۆل ئەگەر سوپای میسر هێرش بکاتە سەری[٣٨].

**باسی دووەم/بزووتنەوەی وەهابی(موحدین)ەکان:**

**بـارودۆخی ناوچـەی نەجـد پـێش سـەرهەڵدانی بزووتنـەوەی ئـاینی فکـری وەهابیەت:**

پـێش ئـەوەی باسـی دەرکـەوتن و ژیـانی(محمـد عبـدالوهاب)ی دامەزرێنـەری بزووتنـەوەی وەهـابی بکـەین وا پێویـست دەکـات زانیاریمـان هـەبێت لەسـەر بـارودۆخی ئـاینی و سیاسـی و کۆمەلایـەتی شـوێنی دەرکـەوتنی بیروبـاوەڕی وەهابیەت.

**أ- لە ڕووی ئاینی:**

ناوچەی نەجد وەك شوێنی دەرکەوتنی وەهابیەکان لـە ڕووی ئاینیـەوە چـەند دیاردەیەکی ناشیاو سـەری هەڵدا بـوو وەك بـە پـیرۆز زانینـی مـەزارو قـەبرەکان زۆربـوونی سـووی پـارە و بـەزۆر بەشـودانی کـچ و بڵاوبونـەوەی لەشفرۆشـی و بەگەورە زانین و داواکردن و پشت بەستن بەشتی لاوەکی دارو بەرد گوایە ئەمانـە هۆکارن بۆ پاراستنی کوڕەکانیـان و بەجێگەیانـدنی داخوازیـەکانیان، ئەمانـە لـە پێشتردا نەبوونەو پێچەوانەی ئاینی ئیسلام بووە، وە نەدەبوو لە نیمچە دورگـەی عەرەبیـدا شـتێکی وا هـەبێ چـونکە شـوێنی دەرکـەوتنی ئـاینی ئیـسلام بـووە هەروەها زانستە ڕاستەقینەکانی ئیسلام لەوێوە سەرچاوەی گرتووە ناکرێ چـەند دیاردەیەکی خراپ و بیری پێچەوانە دژی ئاینی ئیسلام سەرهەڵ بدات بەتایبـەتی لە نیمچە دورگەی عەرەبی(سعودیە).

**ب- لە ڕووی کۆمەلایەتی:**

(نەجـد) لـە ڕووی کۆمەلایـەتی لـە بـارودۆخێکی نائـارام و دووبـەرەکی و چینایەتی دابوو، بەڕادەیەك لەناو یەك گوند یاخود یەك بنەماڵە و خێزان نـاکۆکی دروست ببوو هەروەها تالان کاری و دزی ڕێگری بـە شـێوەیەکی بـەربڵاو پـەرەی

سەندبوو لە لایەن ئەو کەسانەی سەرپێچی دەسەڵاتیان دەکرد و فەرمانەکانی کارگێڕی ناوچەکەیان پێشێل دەکرد و ملکەچیان پێوە نەدەکرد، هەموو شتێکیان خستبووە ژێر ڕکێفی خۆیان.

ج- لە ڕووی سیاسیەوە:

لە ڕووی سیاسیشەوە پێش هاتنی عوسمانیەکان بۆ ناوچەکە دەسەڵاتەکان دابەش ببونە سەر چەند میرنشینێکی بچووك هەریەك لەو میرنشیانە ناوچەی دەسەڵاتیان زۆر کەم بوو لە چەند گوند و شارۆچکەیەك تێپەڕی نەدەکرد، هیچ لایەك نەبوو لە ژێر یەك هێزی یەکگرتوو کۆیان بکاتەوە تاکو ئارامی بۆ ناوچەکە بگەڕێتەوە و خەڵکەکەی هەست بە ژیانێکی خۆش بکەن بەڵکو هەر لە ناکۆکی دابوون و زۆر جاریش شەڕ و ناکۆکی لە نێوانیان ڕوودەدا و هێرشیان دەکردە سەر یەکتر سەرەڕای بەردەوامی شەڕ لە نێوان میرنشینە نزیك و هاو سنورییەکان، هێرشی کاروانچییەکان کە بە ناوچەکەدا تێ دپەڕین بارودۆخێکی ناجێگیری لە ناوچەکە دروست کردبوو، دوای ئەوەی دەسەڵاتی عوسمانییەکان گەیشتە ناوچەی(حیجاز) لە ساڵی(١٥١٧) بەحرێن لە ساڵی(١٥٥٥) هاتە ژێر دەسەڵاتی عوسمانی ئەمەش ڕێ خۆشکەر بوو بۆ ئەوەی نەجد بخەنە ژێر دەسەڵاتی خۆیان لە لایەن والی و کاربەدەستانی ناوچەکە کارەکان بەڕێوەدەبران بەڵام وەلائیان بۆ دەوڵەتی عوسمانی دەبێت و لەژێر سەرپەرشتی ئەواندا دەبن لە ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوای ناوچەکە، دواتر بە فەرمانی دەوڵەتی عوسمانی دەستیان کرد بە هێرش کردنە سەر ناوچەی نەجد و توانیان تا ساڵی(١٦٥٨) زۆربەی ناوچەی نەجد دەست بەسەر دابگرن. بەڵام دوای ماوەیەك ناوچەکە جارێکی تر ڕووبەڕوی شەڕ و ئاژاوە دەبێتەوە بە هۆی بێ هێز بوونی دەوڵەتی عوسمانی لە بەحرێن و ناوچەکە بە شێوەیەك تەنها چوار کەسی لە کاربەدەستەکان جێهێشت

بۆ بەڕێوەبردنی کارەکان ئەوانیش بریتی بوون لە(فاتح پاشا، علی پاشا، محمد پاشا، فاتح پاشا) کاتێ هۆزەکان هەستیان بە لاوازی دەسەڵاتی عوسمانی کرد بۆ بەدەست هێنانی بەرژەوەندی دارایی پلەوپایەی دەسەڵات لە ناوچەکە سەرۆکەکەیان توانی دەست بەسەر بەحرێن دابگرێت و کاربەدەستانی عوسمانی دەربکات کە حوکمڕانی ناوچەکەیان دەکرد لە ساڵی(١٦٦٩) بەردەوام بوو لە فراوانکردنی دەسەڵاتەکەی تاکو گەیشتە دەوڵەتی کوێتی ئێستا بخاتە ناو سنوری دەسەڵاتەکەی وە چەند ناوچەیەکیشی لە نەجد دەست بەسەرداگرت لە ساڵی(١٦٧٠) بەم شێوەیە دوو هێزی ڕکابەر لە ناوچەی نەجد دەرکەوتن لە کەرتی ڕۆژئاوا کاربەدەستانی مەککە و لە ڕۆژهەڵات کاربەدەستانی بەحرێن، ناوچەکەیان کردبوو بە شوێنی ڕکابەری و ململانێی نێوانیان بۆ فراوانکردنی دەسەڵاتیان لە ناوچەکە.

ئەم هەموو ڕووداوە بارە ناجێگیریەی باڵی بەسەر ناوچەکە داکێشابوو خەڵکی ناوچەکەی هەراسان و بێزار کردبوو هەستیان بە ژیانێکی ناخۆش و خراپ دەکرد، دەرکەوتنی هەرکەسێك هاتبوایە داوای چاکسازی بکردایە دەبونە پاڵپشت و هاریکاریشی دەبون بۆ سەرکەوتن، چاکسازی لایەنی ئاینی بۆ پڕکردنەوەی بۆشایی ڕۆحی و گەڕانەوەی بەها ئەخلاقیەکان، چاکسازی کۆمەڵایەتی بۆ نەهێشتنی جیاوازی چینایەتی و ململانێ بڵاوکردنەوەی برایەتی و دادوەری، چاکسازی سیاسی بۆ دابین کردنی هێمنی و ئاسایش و بەڕێوەبردنی ناوچەو هەرێمەکان لە لایەن کەسانی دڵسۆز و نەهێشتنی دیاردەی گەندەڵی و دزی و جەردەیی، لەو کاتەدا کەسێك بە ناوی محمد عبدالوهاب سلیمان دەرکەوت داوای چاکسازی ئاینی دەکرد بە گەڕانەوە بۆ سەر ڕێگای ڕاستەقینەی ئیسلام و نەهێشتنی دزی و جەردەیی و خراپەکاری ڕەنگە هەر ئەم دروشم و چاکسازیەش

بووبن بە یارمەتیدەر بۆ سەرکەوتنی بانگەوازی وەهابیەت کە بە شێوەیەکی خێرا بڵاوببێتەوە و سەرکەوتن بەدەست بهێنێ[٢٩].

**ژیاننامەی(محمد کوڕی عبدالوهاب)ی دامەزرێنەری بزووتنەوەی وەهابیەت:**

محمدی کوڕی عبدالوهاب کوڕی سلێمان لە ساڵی(١٧٠٣ز) لە عوینەی سەر بە شاری نەجد لەدایك بووە لە هۆزی بەنی تەمیمە، یەکێك بووە لە هۆزە بەناوبانگەکانی ناوچەکە، وە باوکی بە یەکێك لە پیاوە زانا و ناودارەکانی ناوچەی نەجد و حیجاز دادەنرا لەبەر ئەوی دادوەری عوینە بوو چەند قوتابیەکیشی پێ گەیاندووە لەسەر مەزهەبی حەنبەلی. محمد کوڕی عبدالوهاب هەر لە منداڵییەوە بە کەسێکی زیرەك و بەهرەدار ناسرابوو قۆناغی یەکەمی خوێندنی لە لای باوکی دەست پێکرد، لە ماوەیەکی کەمدا توانی قورئانی پیرۆز لەبەر بکات کە تەمەنی لە(١٠)دە ساڵی تێپەڕ نەکردبوو دواتر دەستی بە خوێندنی زانستە شەرعیەکانی ئیسلام کرد لە پێشەوەی هەموو زانستەکانیش(فقهی حەنبەلی) بوو لەبەر ئەوەی لە خانەوادەیەکی زانست دۆست و پلەوپایە پێگەیشتبوو، ببووە هۆکاری زیرەکی لە خێرا وەرگرتنی زانست و زانیاری شارەزابوون لەسەر زانست و بوارەکانی ئاینی، بۆ ئەم مەبەستەش چەندین شوێن گەڕاوە زۆربەشیان لەژێر فەرمانڕەوایەتی عوسمانیدا بوونە، لە یەکەم گەشتی دا بە چوونە حەج(مەککە) دەستی پێکرد، گەشتەکانی دواتریشی بۆ(مەدینە، بەغداد، بەسرە، شام، هیند، ئێران) بەجێ گەیاند لە ئەنجامی ئەم گەشتانەدا توانی ئاشنایەتی بە چەندین کەسایەتی ناودار و خاوەن زانستەکان پەیدا بکات و خۆیان پێ بناسێنێت و لێیان نزیك بێتەوە بۆ ماوەیەکیش دەرسی لە لای هەندێ لەو زانایانە خوێندووە، کاری محمد کوڕی عبدالوهاب لە دوو ئەجێندا خۆی دەبینێتەوە:

١- کۆکردنــەوەی زانیــاری جــۆراو جــۆر لەســەر شــەریعەت و جیــاوازی بــیرو بۆچونەکانی زانایان دەربارەی ڕایە جیاوازەکان و بیرو باوەڕی ئیسلامی.

٢- بڵاوکردنــەوەی بیروبــاوەڕی خــۆی کــە لــە فکــری ســەلەفیەت خــۆی دەبینێتەوە، تاکو لە داهاتوو بتوانێ لەو ناوچە و هەرێمانەی پێیدا گەڕاوە ببێتــە پاڵپــشتیەك بــۆ بڵاوبونــەوەی بیروبــاوەڕی ســەلەفیەت بــە ڕوانگــەی محمــد عبدالوهاب.

**گەڕانەوەی محمد عبدالوهاب بۆ لای باوکی:**

لــەو کاتــدا نەخۆشــی(تــاعون) لــەوناوە بڵاودەبێتــەوە گــەورەو بەڕێوەبــەری ناوچەکە بەهۆی ئەم نەخۆشیەوە دەمرێت کەسێکی تــر شــوێنی دەگرێتــەوە لــە کاتی دەست بەکاربوونی لە ڕووی فکر و چۆنیەتی بیرکردنــەوەیان لەگــەڵ بــاوکی محمــد عبــدالوهاب نــاکۆکی و کێــشە دەکەوێتــە نێوانیانــەوە بــەم هۆیــەوە فــەرمانڕەوای ناوچــەکە بــاوکی محمــد(عبــدالوهاب) کــە پیــشەی دادوەری بــەجێ دەگەیانــد لەســەر کارەکــەی لای دەدات، لەبــەر ئــەوە بــە ناچــاری ناوچــەکە جــێ دێڵێت بەرەو شوێنێکی تــر بــەناوی(حــریملاء) کــە یەکێکــە لــە شــارەکانی(نەجــد) لەوێ نیشتەجێ دەبێت، کاتێ هەواڵەکەی بە محمدی کوڕی عبدالوهاب دەگات کە باوکی تووشی گرفتێکی وا بووە گەشتەکەی دەپــچڕێنێت و دەگەڕێتــەوە بــۆ لای باوکی لە(حریملاء) لە ساڵی(١٧٣٨) لەگەڵ باوکی دەست دەکــەن بــە گوتنــەوەی وانەی زانستی و پێگەیاندنی چەندین قوتابی لەو شوێنە لەگــەڵ بــەردەوام بــوونی چوار ساڵ لە گوتنەوەی وانەی ئاینیەکان محمد عبدالوهاب شێوازەکەی دەگۆڕێت و پــێ دەنێتــە قۆنــاغێکی تــر هــەوڵ دەدات بــە بڵاوکردنــەوەی بۆچــونەکانی لــە ئەنجامی ئەو زانست و زانیارییەی بەدەستی هێنابوو بۆ ئەوەی بیکات بە پــەیڕەو و ڕێبــاز بــۆ ئــەوەی خــەڵکی لەســەر بــڕۆن هــەروەك لــە پێــشەوە ئامــانج و

مەبەستەکانی کاری محمد عبدالوهاب خستەڕوو، لە ئێستادا جێبەجێی دەکات وەك سەرەتایەك لە بڵاوکردنەوەی بیروباوەڕەکەی، بۆ پەردان و پێشوەبردنی کارەکەی دەستی کرد بە نووسینی چەند نامە و نوسراوێك بۆ چەند گەورەیەکی هۆزەکان لە ناوچەی نەجد وە لە هەمان کاتیشدا هەستا بە نووسین و دانانی پەرتووکێك بە ناونیشانی یەکتاپەرستی(کتاب التوحید) کە هەموو بۆچوون و بیروباوەڕی محمد عبدالوهاب لەخۆ دەگرت، دەکرێ ئەمە پێناسەیەکی دروست بێ لە بۆچوونەکان و بیروباوەڕی ئیسلامی، بە هۆی ئەو پێداگرییەی لەسەر پەرستشە ڕاستەقینەکان و دوورکەوتنەوە لە بە پیرۆزدانان و پەرستنی شتە لاوەکیەکانی وەك دارو گۆڕو پیاوچاکان و کردنیان بە پەیوەند(وسیلة)ی نێوان خۆیان و خوا، ئەمەش لەگەڵ بارودۆخی خەڵکەکە نەدەگونجا لەبەر ئەوەی ئەمانە ببوونە شتێکی عادەتی، بەم هۆیەوە ناکۆکی کەوتە نێوان محمد و باوکی عبدالوهاب سلیمان ئەم ناکۆکیە چالاکی و کارەکانی محمدی عبدالوهاب تووشی شەلەل کرد و نەیتوانی بەرەو ڕووی باوکی بێتەوە بۆیە بە شێوەیەکی وشیارانە مامەڵەی لەگەڵ ئەم ناکۆکی ململانێیەی باوکی کرد تاوەکو باوکی کۆچی دوایی کرد. بەڵام دوای وەفاتی باوکی چالاکیەکانی بە شێوەیەکی بەرچاو زیادی کرد بۆ بڵاوکردنەوەی بیروباوەڕ و پێگەیاندنی شوێنکەوتەکانی لەسەر ڕێبازەکەی، هەرچەندە شوێنکەوتەی بیرو باوەڕەکەی زیادی کرد بەڵام لە بەرامبەریشدا ناحەزی و دژایەتیەکانیش زیادی کرد بیرو ڕای محمد عبدالوهاب یان بە دڵ نەبوو کەوتنە بەربەرەکانی کردن و پلان گێڕی بەڕادەیەك تا گەیشتە هەوڵی لەناوبردنیشی درا لەلایەن ئەو کەسانەی کە دژایەتی بڵاوبونەوەی بیروباوەڕی وەهابیان دەکرد، ئەمە بووە هۆی ئەوەی(حریملاء) جێ بهێڵێت لە ساڵی(١٧٤٣) بگەڕێتەوە بۆ شوێنی لەدایك بوونی خۆی(عویینە) کاتی گەڕانەوەی بۆ عویینە

پێشوازیەکی گەرمی لێکرا لە لایەن(عوسمانی کوڕی معمر) ئەمیری ئەو کاتی عویینە بوو کە لە کۆنەوە یەکتریان دەناسی یارمەتیەکی زۆری دا ڕێ خۆشکەرێکیش بوو بۆ بڵاوکردنەوەی بیروباوەڕەکەی عوسمانی کوڕی معمر هەر بەوەندە وازی نەهێنا بەڵکو هەستا بە ناردنی نامە و ڕوونکردنەوە بۆ ئەو هۆزانەی لەژێر دەسەڵاتی ئەودا بوون داوای لێکردن بە وەرگرتن و پەیڕەوکردنی بیروباوەڕی وەهابی، محمدی کوڕی عبدالوهاب توانی عوسمان ی کوڕی معمر ڕازی بکات ئەگەر بێت و یارمەتی و پشتگیری بکات لە بڵاوکردنەوەو جێبەجێ کردنی بیروباوەڕەکەی، لە داهاتوودا دەیکات بە گەورەو سەرداری هەموو نەجد لە سعودیە کاتێ محمدی عبدالوهاب هەستی کرد عوسمان یامەرتی دەدات و پشتگیری دەکات سووربونی خۆی دووپات کردەوە لە بڵاوکردنەوەی بیروباوەڕەکەی و بەئاشکرا فەرمانی جێبەجێ کردنیشی بەسەر خەڵك ڕاگەیاند وە دژی هەندێ لە بیروباوەڕی خەڵکەکەیە کە لە لای ئەو بەشتی زیاد کراو لە ئاین و بێ بایەخ بوون کەچی لە لای خەڵك بە بەشێك لە ئاین دادەنران، وە فەرمانی دەرکرد بە ڕووخانی قوبەی سەر گۆڕی(زەیدی کوڕی خەتاب)و هەندێ لەمەزارەکانی تر ئەمەش نارەزایەتێکی زۆری لێکەوتەوە لە لای خەڵکەکە بە گشتی و خەڵکی عویینە بەتایبەتی[٤٠].

**بیروباوەڕی محمد عبدالوهاب:**

گومانی تێدا نییە سەرهەڵدانی هەر بیروبۆچون و پەرچە کردارێك لە ئەنجامی دروست بوونی کۆمەڵێ کارو دیاردەی نامۆ بە کۆمەڵگە دەبن بە کێشەو سەرهەڵدەدەن و کەسانێکیش بە مەبەستی چاکسازی و کارکردن لەژێر کاریگەر بوون بە بیری خۆیانەوە دەکەونە جوڵەکردن، بۆ چاکسازیکردن لەو بوارانەی پێیان هەڵەیە لە کاروباری ڕۆژانە بزووتنەوەی وەهابی کە لە لایەن(محمد

عبدالوهاب سلیمان)ەوە دامەزرا. پێی وابوو خەڵکی لەو سەردەمەدا تووشی شەپۆلی خراپەکاری و کاری نابەجێی هاوبەش پەیداکردن و پەرستن و سەردان کردنی گۆڕی پیاوچاك و زانایان بوونەتەوە، بۆیە بەرەنگاربوونەوەی ئەم ڕواڵەتە نەفامیانەی بە زیادکراو لە دین دەزانی و بە ئەرکی خۆی زانی بنبڕی ئەم بە پیرۆز زانینە بکات. هەروەها لە چوارچێوەی ئەو ڕێکەوتنە دوو قۆڵیەی لە نێوان(محمد عبدالوهاب)و (عوسمان کوڕی معمر)ی پاڵپشتی بزووتنەوەکە محمد عبدالوهاب چەند بڕیارێکی دەرکرد بۆ بەرەنگاربونەوەو نەهێشتنی شتە زیادکراوەکان لە دین و چاکسازی ئاینی بە گەڕانەوە بۆ سەر ڕێگای ڕاستی ئیسلام ئەمە بۆچوونی دامەزرێنەری بزووتنەوەکەیە، چوارچێوەی کارەکانیشی لەم خاڵانە خۆی دەبینێتەوە:

* بڵاوکردنەوەو بانگەوازکردن بۆ یەکتاپەرستی بە پاڵپشتی عوسمانی کوڕی معمر چونکە لە ڕێکەوتنەکەی نێوانیان لە لایەن محمد عبدالوهاب بەڵێنی پێدرابوو بیکات بە گەورەو سەرۆکی هەموو نەجد.

* فەرمان کردن بە چاکەو قەدەغەکردنی شتە خراپەکانی دژ بە ئاین و بیروباوەڕی وەهابین ئەم کارەش لە لایەن ئەو قوتابیانەی لە دەوری کۆبونەوە جێبەجێ دەکرا.

* بڕیاردان بە بڕینی ئەو دارانەی خەڵکی بە پیرۆزیان دەزانی و هاوبەش پەیداکردن بۆ(خوا) دادەنا بەتایبەتی گۆڕی(زەیدی کوڕی خەتاب) کە ببووە شوێنی داواکردنی کوڕ و منداڵ و مرازەکانی خەڵك، هەروەها ئافرەتێکی بە ئاشکرا ڕەجم کرد دوای خۆی دانی نا بە زیناکردن، ئەم خاڵە بووە هۆی تورەبوونی خەڵکی ناوچەکە و ناڕەزاییان دەربڕی بەرامبەر کارەکانی محمد

عبدالوهاب لەگەڵ هەموو ئەو کارانەشدا لە لایەن عوسمان گەورەی عویینە پشتگیری دەکرا.

لە لایەن هەندێ کەسی ناحەزی(محمد عبدالوهاب و عوسمان معمر) هەواڵدرایە(میر سلیمان) بەوەی سەرەرای ئەنجام دانی چەند کارێکی ناشیاو محمد عبدالوهاب هەوڵ دەدات ناکۆکی و دووبەرەکیش لە نێو هۆزەکاندا بنێتەوە لەبەر ئەوە کاتێ ئەم هەواڵانە بە(میر سلیمان کوری حمید)ی گەورەو بەرێوەبەری هەموو ناوچەکانی(احساء و قتیف)و دەوروبەری گەیشت بووە هۆی تورەبوون و نارازی بوونی بەم هەڵسوکەوتانەی محمد عبدالوهاب بۆیە نامەیەکی هەرەشە ئامێزی بۆ(عوسمان معمر) نارد تێدا نووسی بوو ئەو کەسەی لە لای تۆیە مەبەست پێی محمد عبدالوهاب بوو، هەرچی ویستی بیکا کردی هەرچی ویستی بیڵێ گوتی، هەر بە گەیشتنی ئەم نووسراوەی من بۆ لات راستەوخۆ هەڵدەستی بە کوشتنی وە ئەگەر نەیکوژی ئەوا هەرچی پارەو داهاتت هەیە لای ئێمە دەیبرین، ئەم پارەو داهاتەی پێی دەدرا دەکری وەکو بودجەیەك بووبێ بۆ پێویستی و بەرێوەبردنی ناوچەکەی پارەکەش بە(١٢٠٠)هەزار و دووسەد لیرەی زێر لەگەڵ خواردن و جل و بەرگ. بە گەیشتنی ئەم نامە پر هەرەشە ئامێزە عوسمان معمری توشی شۆك کرد لە بەردەم دوو هەڵبژاردندا خۆی بینیەوە یەکەمیان هەڵبژاردنی محمد عبدالوهاب بوو کە پاڵپشتی لێدەکرد دووەمیان ئەو برە بودجەیە بوو کە لەلایەن میر سلیمان حمیدی گەورەو فەرمانرەوای تەواوی ناوچەکە پێی دەدرا، هەڵبژاردنی یەك لەو دوو لایەنەی زۆر لاسەخت بوو بە هەر شێوەیەك بێت هەڵبژاردەی دووەمی وەرگرت رەنگە ئەمەش دوو ئارا لەخۆ بگرێت:

١- ئەگەر محمد عبدالوهاب ی هەڵبژاردبایە ئەوا ئەو یارمەتیەی لێ دەبڕا وە ئەو هێزو توانایەشی نەبووە بەرامبەر مەترسی و هێرشی فەرمانڕەوای گشتی ناوچەکە خۆی ڕابگرێت لەوانە بوو بەم هۆیەوە بیکرێتە سەری لە بەرامبەریشدا محمد عبدالوهاب دەتوانێ بچێتە شوێنێکی تر بەکاری بانگەوازی خۆی هەڵبستێت و لەژێرەوەش یارمەتی و پاڵپشتی بێت لە بڵاوکردنەوەی بانگەوازەکەی ئەمەش بە کارێکی هونەری و ژیرانەی عوسمان معمر دادەنرێت.

٢- بڕینی ئەو یارمەتیەی لە لایەن ئەمیر و گەورەی ناوچەکەوە بۆی دەهات لەوانە بوو تووشی بارێکی قورسی دارایی کردبووایە وە لەکەداربوون و نەمانی ئەو پلەو پایەی کە هەیبوو، وە هیچ خزمەتێکی ئەوتۆی پێ نەدەکرا بەبێ بوونی توانای دارایی بۆ خەڵکی ناوچەکەی خۆی و بزووتنەوەی وەهابی کە ئومێدێکی پێی هەبوو بەپێی ئەو ڕێکەوتنەی نێوانیان، بۆیە لە هەموو بارەکاندا واباشتر بوو محمد عبدالوهاب ناوچەکە جێ بهێڵێت.

لەبەر ئەوە(عوسمان معمر) ناردی بە دوای محمد عبدالوهاب هەواڵەکەی پێ ڕاگەیاند و پێی گوت فەرمانی کوشتنی تۆم لە لایەن(میر سلیمان کوڕی حمید)ەوە بۆ هاتووە توانای شەڕکردنی ئەویشم نییە بەڵام شێخ لە وەڵامدا پێی گوت ئەگەر پشتگیریم بکەیت دەبیتە گەورەی نەجد بەڵام عوسمان ئەمەی بەهەند وەرنەگرت و بۆ جاری دووەم پێی گوت فەرمانی کوشتنی تۆم پێکراوە و ناتوانم سەرپێچی بکەم لەبەر ئەو ڕێکەوتنەی لە نێوانماندا هەیە وە لەگەڵ بەهای مرۆڤایەتی و خاوەن پیاوەتی ناگونجێ لە شاری خۆم بت کوژم بۆیە داوات لێدەکەم ناوچەکە جێ بهێڵیت و بەرەو شوێنێکی تر بڕۆی، عوسمان یەکێك لە پیاوەکانی خۆی بە ناوی(الفرید الظیري) لەگەڵ محمد عبدالوهاب نارد تاکو لە شار دەیباتە دەرەوە و شاربەدەر کرا بەرەو(درعییە)ی بەڕێکەوت[٤١].

**بڵاوبونەوەی بیروباوەڕی وەهابی لە سعودیە و ناوچەکانی دەوروبەر:**

محمد عبدالوهاب دوای ئەوەی لە(عویەینە) دەرکرا بە ناچاری ڕووی کردە شارۆچکەی درعیە کە لە ژێر دەسەڵاتی بنەماڵەی سعود دابوو لە ساڵی(١٧٤٤) ڕاستەوخۆ چووە ماڵی(ئەحمەدی کوڕی سوەیلم) کە یەکێك بوو لە قوتابیە شوێنکەوتوەکانی، بە شوێنێکی گونجاوی زانی بۆ بڵاوکردنەوەی بیروباوەڕی وەهابی و چالاکیەکان، لەنێو قوتابیە شوێنکەوتووەکانی سێ برای گەورەی درعیە هەبوون بە ناوەکانی(ئنیسان، مشاری، فرحان) بەڵام دوای ماوەیەکی کورت بۆی دەرکەوت چیتر بەم شێوەیە ناتوانێ بمێنێتەوە چونکێ لەلای میری درعیە وا دادەنرا کە بەشێوەیەکی نایاسایی هاتۆتە ناوچەکەی، بەڵام بە پێداگریەکی زۆر لە خزمەکانی میری درعیە بەتایبەتی خێزانەکەی ڕازی بوو لەوێ بمێنێتەوە، لە هەندێ سەرچاوەکان ئاماژە بە بڕوا پێ هێنانی خێزانی میری درعیە دەکەن بە بیروباوەڕی وەهابی، هەروەها چەند ئاماژەیەکی تریش ئەمە بە هۆکاری ڕازی کردنی مێردەکەی میری درعیە دادەنێن بەوەی هەوڵی لەگەڵ داوە بە ڕازی کردنی وە لە سودو قازانجی محمد عبدالوهاب ئاگادار کردۆتەوە کە لە داهاتودا دەبێتە پاڵپشت بۆ دەسەڵاتەکەی دواتریش گەیشتنە ڕێکەوتنێك لەم بارەیەوە، بەڵام ڕێکەوتنە بنچینەیەکە لە نێوان(محمد عبدالوهاب)و(محمد کوڕی سعود) کاتێ چوە ماڵی(ئەحمەدی کوڕی سوەیلم) لەوێوە دانیشتن و گفتوگۆ دەستی پێکرد، دوای گفتوگۆیەکی زۆر محمد عبدالوهاب هەمان پێشنیاری ئاراستەی میری درعیە کرد کە پێشتر لەگەڵ میری عوینە لەسەری ڕێکەوتبون، کە ئەگەر پشتیوانی بڵاوکردنەوە و بانگەوازەکەی بکات ئەوە دەیکات بە گەورەو میری هەموو ناوچەی(نەجد) سعودیەی ئێستا، ئەنجامی دانیشتنەکە بە ڕازی

بوونی محمد کوڕی سعود گەیشتە کۆتـا بـاس بـەڵام محمـدی کـوڕی سـعود دوو مەرجی بۆ محمد عبدالوهاب دانا:

١- ئەگەر بەهۆی پشتیوانی میرنشینەکەی محمد عبـدالوهاب سـەرکەوت ئـەوا جێیان نەهێڵێ و پشتیان تێ نەکات.

٢- نەبێتە ڕێگر لەبەردەم ئەو دەسکەوتانەی لە خەڵکی ناوچەکە بە ناوی باج و خەراج وەری دەگرێت.

دواتر ڕێکەوتنەکە مـۆرکرا بەدەسـت خـستنە ناودەسـتی محمـد عبـدالوهاب و محمد سعودی میری ناوچەکە و گوتی: (الدم بالدم والهدم بالهدم) واتە: خوێنی تۆ خوێنی منەو ماڵی تۆ ماڵی منە، هەروەها سەبارەت بە مەرجی دووەم گـوتی ئـەم دەسـکەوتانەی لـە شـەڕەکاندا بەدەسـت دێـن(غنیمـة) جێگـای ئـەو باجانـە بـە زیادەوە پڕدەکاتەوە پێویست ناکات لە خەڵکی وەربگیرێن.

لە دەرئەنجامی ئەو ڕێکەوتنـەی نێـوان کـوڕی عبـدالوهاب و کـوڕی سـعود لـە سـاڵی(١٧٤٤-١٧٤٥)محمـدی کـوڕی سـعود مـاڵی محمـدی کـوڕی عبـدالوهاب ی هێنایە نزیـك مـاڵی خـۆی، وە هەنـدێ ئامـاژەی تـر هـەن لەسـەر دابـەش کردنـی کارەکان بەوەی هەر یەکێك بە کاری خۆی هەڵبستێ بۆ ئەوەی بزووتنەوەکـە زوو گەشە بکات، محمد عبدالوهاب کارەکانی خۆی لە ڕووی ئاینیەوە بەجێ دەگەیاند و محمد سعودیش لە لایەنی بەڕێوەبردن و فەرمانڕەوایـەتی کـاری خـۆی دەکـرد، ئـەم ڕێکەوتنـەی نێوانیـان سـەردەمێکی نـوێی لـە مێـژووی ناوچـەی نەجـد هێنـا کایـــەوە ئـــەویش دروســـت بـــوونی دەوڵـــەتی ســـعودیەیی یەکـــەم بـــوو لـــە ساڵی(١٧٤٥)[٤٢].

**فراوانبوونی میرنشینی درعیە:**

میرنشینی درعیە دەستی کرد بە فراوانکردنی دەسەڵاتی خۆی لە ناوچەکانی دەوروبەری کاتێ توانی ناوچەکانی(العینة وحریملاء) بخاتە ژێر دەسەڵات و بیانگرێتەخۆ ئەمە بووە هۆی سەرهەڵدانی ناکۆکی لەگەڵ(ریاز) محمدی کوڕی سعود توانی دەسەڵاتی خۆی بەسەر هەموو ناوچەکاندا بسەپێنێت جگە لە ریاز نەبێت، لە دوای مردنی کوڕەکەی بەناوی(عبدالعزیز محمد سعود) شوێنی دەگرێتەوە توانی دەست بگرێت بەسەر ریاز لە ساڵی(١٧٧٣) دوای گرتنی ریاز بەرەو ناوچەی(قصیم) بۆ ماوەی چەند ساڵێك شەڕ بەردەوام بوو(١٧٧٤-١٧٨٧) لەدوای ئەویش ڕووی کردە ناوچەی(الاحساء) لە ساڵی(١٧٩٣) توانی ئەویش بخاتە ژێر دەسەڵاتی خۆی دواتریش بەرەو ڕۆژئاوای ناوچەکە کەوتە ڕێ و توانی شاری(تایف) لە ساڵی(١٨٠٢)و شاری(مەککە) لە ساڵی(١٨٠٣) بگرێت دوای شەڕێکی ماوە درێژ لەگەڵ شەریفی مەککە(غالب کوڕی مساعد) هەروەها عبدالعزیز کوڕی محمد سعود توانی باشوری عێراقیش بگرێت و سنووری دەسەڵاتەکەی فراوان بکات تاکو گەیشتە شاری کەربەلا گۆڕی ئیمام(حسین کوڕی علی) ڕوخاند و تەختی کرد ئەو پارەو پولەی لەناویدا بوو هەمووی برد بە بیانوی ئەوەی ئەوە کارێکی ناڕەوایە هاوبەش پەیداکردنە بۆ(خوا) ئەمەش بە هۆکارێکی سەرەکی ڕق لێبونەوە و دژایەتی کردنی شیعەکان دادەنرێت لە بزووتنەوەی وەهابی و محمد عبدالوهاب بگرە دەوڵەتی سعودیەشی لەگەڵ دابێت تاکو ئێستاش ئەم ڕق و کینەیە بەردەوامە، لە ساڵی(١٨٠٣) عبدالعزیز محمد سعود مرد لەدوای ئەو کوڕەکەی بەناوی(سعود عبدالعزیز محمد سعود) هاتە سەر دەسەڵات کە بە (سعود الکبیر) سعودی گەورە ناسراوە. لە کۆتایەکانی ساڵی(١٨٠٣) سعود کبیر توانی باشوری عێراق بگرێت بەڵام نەیتوانی بچێتە ناو

بەسرەو زبیر، بۆ جاری دووەم دەستی بە هێرش کردەوە لە ساڵی(١٨٠٥) گەمارۆی شارەکانی(نەجەف، سەماوە، بەسرە، زبیر)ی دا هێرشی سێیەمی کە بە هێرشێکی گەورە دادەنرێت بۆ سەر ناوچەکە(١٨٠٨)، وە عبدالله کوڕی نارد بۆ سەرپەرشتی کردن لە ساڵی(١٨١٠) بەڵام سەبارەت بە رۆژئاوای نەجد بنەماڵەی سعود و بزووتنەوەی وەهابی توانیان دەست بەسەر حیجاز دابگرن لە ساڵی(١٨٠٤)و سوپاکەیان لە ساڵی(١٨٠٥) چووە ناو شاری مەدینە ئەو کاتە شریف ی مەککە(غالب کوڕی مساعد) هەستی بە بێ هێزی دەکرد بەرامبەر هێزی بزووتنەوەی وەهابی و بنەماڵەی سعود یاخود دەوڵەتی سعودیەی یەکەم بۆیە داوای رێکەوتنی کرد لەگەڵ دەوڵەتی سعودیە، لەسەر چەند بابەتێك رێکەوتنامەیەکیان مۆرکرد کە لەم خاڵانەی خوارەوە پێکهاتبوو:

١- رێگەدان بە وەهابیەکان بۆ ئەنجام دانی حەج وە لە دوای تەواوبونیان لە حەج راستەوخۆ بۆ شوێنی خۆیان بگەڕێنەوە.

٢- شاری مەککە و شوێنەکانی تر کە سەر بە دەسەڵاتی(شەریف غالب)ن ملکەچی فەرمانی دەوڵەتی سعودیە بن واتە دەبن بە بەشێك لە دەوڵەتی سعودیە.

٣- مانەوەی شەریف غالب بە فەرمانڕەوای مەککە بەڵام فرمانەکان لە دەوڵەتی سعودیەوە وەردەگرێت.

ئەم هەموو پێشکەوتن و دەسکەوتانەی دەوڵەتی سعودیە بەدەستیان هێنا گروتین و متمانەی زیاتری بە سعودیە بەخشی، ئەوانەی هەڵگری بیروباوەڕی وەهابیەتیش نەبوون وە توانیان لە ماوەیەکی کەم دا هەموو ناوچەکانی عمان و ئەو بەشەی لە باشوری عێراق مابوو بخاتە ژێر دەسەڵاتی خۆی لە دوای چەندین شەڕ و پێکدادانی نێوانیان بەم شێوەی بیروباوەڕی وەهابی لە ناوچەکەدا

تەشەنەی کردو بڵاوبوەوە و یەمەن و دەوروبەریشی خستە ژێر دەسەڵاتی خۆی دوای ماوەیەك زۆربەی نیمچە دورگەی عەرەبی دانیان بە دەسەڵات و بانگەوازی وەهابیەت دانا جگە لە بەحرین و چەند ناوچەیەکی تر کە سەر بە دەسەڵاتی ئینگلیز بوون(٤٢).

**هێرشی محمد علی بۆ سەر نیمچە دورگەی عەرەبی:**

هەروەك لە پێشەوە ئاماژەمان پێکرد ناوچەکە دابەش کرابووە سەر سێ بەش یاخود سێ هێز بەم شێوەیەی خوارەوە:

١- دەوڵەتی عوسمانی کە ئەو کات بەرەو بێ هێزی لاوازی دەچوو ببووە هۆی وەستانی کاری فراوانخوازی و دەرکەوتنی بۆشایی لە کاری ئیسلامی لە ناوچەکە بە شێوەیەکی رووکەشی بە ناوی ئیسلام فەرمانڕەوای لە ناوچەکەدا دەکرد.

٢- دەسەڵات و هێزی محمد علی کە فەرمانڕەوایی لە میسر دەکرد، کەوتبووە ژێر کاریگەری ئەوروپا بەم هۆیەوە چەند کارێکی ئەنجام دا کە مەبەستی تایبەتی خۆی هەبوو لە ناوچەکە بە گشتی میسر بەتایبەتی.

٣- دەوڵەتی سعودیە لە دوورگەی عەرەبی کە کاری دەکرد بۆ زیندووکردنەوەی بیری جیهادی و پەیڕەوکردنی بنەماکانی سەلەفیەت بە بۆچوونێکی تایبەت، خەڵکی ناوچەکەش پشتگیریان بوون شوێنیان کەوتن وە ڕازی بوون بە بیروباوەڕیان کاریان بۆ کرد و خەباتیان دەست پێکرد لە پێناو سەرخستنی بیروباوەڕەکەیان.

دەوڵەتی عوسمانی هەستی بە بوونی مەترسی ئەو فراوانبوونە بەرچاوە کرد کە لە سەردەمی عبدالعزیزی کوڕی محمد و سعود کبیری کوڕی تەشەنەی کرد،

وە نەیتوانی ڕێگا لە بانگەوازەکەیان بگرێت، بۆ ئەم مەبەستە چەندین هەوڵی دا لە دوو کاتی جیادا فەرمانی دایە والی بەغدا و والی شام بۆ هێرش کردنە سەر دەوڵەتی سعودی بەڵام تووشی شکست هاتن، لە هەمان کاتدا محمد علی ترسی لێ نیشت لە بەرامبەر مەبەستی جێبەجێ کردنی پلانەکەی کە کاری بۆ دەکرد. لە لایەکی ترەوە دەوڵەتانی ڕۆژئاوا(ئەوروپا) لە مەترسی تەشەنە کردنی بیروباوەڕی وەهابی فراوانخوازی دەوڵەتی سعودی بێ بەش نەبوون بەهۆی بەرزکردنەوەی دروشمی جیهاد کردن لەسەر بنەمای ئیسلامیەتی ئوسولی ترسان ئەوەیە کە گەشە بکات و شوێنی عوسمانیەکان بگرێتەوە، لەبەر ئەوەی دەوڵەتی عوسمانی بەرەو لاوازی چوبوو نەدەتوانی فەرمانڕەوایەتی تەواوی ناوچەکان بکات، وە دەوڵەتانی ئەورووپی چاویان لە میراتی دەوڵەتی عوسمانی بوو تاکو بەسەر خۆیان دابەش بکەن. ئەم چەند هۆکارە خۆی و بابەتیانە بوونە هۆی ئەوەی سوڵتان محمودی دووەم ڕێگا لە فراوانبوونی زیاتری دەوڵەتی سعودی بگرێت، بۆ ئەوەی بەهەر هۆیەك بێت لەناویان ببات و کۆتایی بەم فکرە و دەوڵەتە بهێنێت کە ببووە جێگای ترس و دڵەڕاوکێی هێزەکانی ناوبراو ئەوانە هاندەر بوون بۆ ئەوەی سوڵتان پشت بە سوپای محمد علی ببەستێت بۆ لێدان و لەناوبردنی دەوڵەتی سعودی، سوڵتانی عوسمانی لەمەدا مەبەستی خۆی هەبوو وەك:

١- ڕێگری کردن لە فراوان بوونی دەوڵەتی سعودی و لەناوبردنی بیری وەهابی سەلەفیەت کە دەبووە مەترسی بۆی لە داهاتوو.

٢- بەیەك دادانی دوو دوژمنی خۆی کە هەردووکیان لەگەڵ دەوڵەتی عوسمانیدا ناکۆك بوون.

سیاسەتی محمد علی لەوەی سولتان محمود بەهێزتر بوو بەوەی کە بە داواکاری سولتانی عوسمانی ڕازی بوو ڕووبەڕووی دەولەتی سعودی بێتەوە، مەبەست و ئامانجی خۆی لە بەجێ گەیاندنی داواکاری سولتان هەبوو کە لە داهاتوودا بەدیار دەکەوێ کە ڕووبەڕووی دەولەتی عوسمانی دەبێتەوە.

سولتانی عوسمانی جدەی دایە محمد علی تاکو ڕووبەڕوی دەولەتی سعودی بێتەوە، لە هەمان کاتدا سولتان دەیویست خەلك و هێزەکانی دەوروبەری خۆی بە دوورگەی عەرەبی سەرقاڵ بکات تاکو بەخۆشی بتوانێ ئینکیشاریەکان لەناو ببات، محمد علی نوێنەرێکی نارد بۆ دورگەی عەرەبی بۆ ئەوەی لە نزیکەوە لە بارودۆخ و کاروباری ناوچەکە بکۆڵێتەوە و زانیاری لەسەر کۆبکاتەوە، وە بزانێت هەڵوێست و بیرو بۆچونی شەریفی مەککە(غالب کوڕی مساعد) لەسەر بارودۆخی ناوچەکە چۆنە، کاتێ زانیاریەکان بۆ محمد علی هاتنەوە پێی دڵخۆش بوو لەگەڵ پلان و نیازەکانی دەگونجا، لە یەکەم هەڵوێستیدا هێرشێکی کردە سەر مەمالیکەکان بە سەرکردایەتی(توسون)ی کوڕی بەم شێوەیە خۆی لە مەمالیکەکان ڕزگار کرد.

هێرشی سەر دەولەتی سعودی لە(١٨١١) دەستی پێکرد کە پێکهاتبوو لە دە هەزار سەرباز کە هەشت هەزاریان لە ڕێگەی دەریایی گواسترانەوە بۆ مینای ینبوع دوو هەزاریان لە ڕێگەی وشکانی گواسترانەوە، سەرکردەی گشتی هێزەکان(ئەحمەد توسون ی کوڕی محمد علی) بوو کە تەمەنی لە شانزە ساڵی تێپەڕ نەدەکرد وە هێزەکانی لە ینبوع بەیەکگەیشتن و توانیان دەستی بەسەر دابگرن، دواتر هێرشەکە بە ئاراستەی شاری مەدینە دەستی پێکرد لەسەر ڕێگای خۆیاندا دەستیان گرت بەسەر ناوچەی بەدر بەڵام پێش ئەوەی بگەنە مەدینە ڕووبەڕووی سوپای سعودی بوونەوە کە ژمارەیان(١٥٠٠٠)پازدە هەزار کەس

دەبوو لە لایەن عبداللە ی کوڕی سعود کبیر سەرکردایەتی دەکران، وە سەرکردەیەکی تریش لەگەڵ سوپاکە دابوو کە میری عسیر بوو بەناوی(تامی بن شعیب)و (عوسمان المفیایفی) گەورەی تائیف لەم شەڕەدا سوپای میسری تێك شکاو نەیتوانی سەرکەوتن بەدەست بهێنێ، بەڵام بەهۆی هەڵەی سعودیەکان لە ڕووی نەهێنی و هەواڵ نێرانەوە سەرکەوتوو نەبوو لە چاودێری کردنی مەترسی ئەو هێزانەی هێنرایە سەریان بەم هۆیەوە سوپای میسری توانی سەرکەوتن بەدەست بهێنێ، سوپای میسر لە دوای ئەم شکستە دووبارە خۆی ڕێکخستەوە و خۆی بەهێزکرد و داوای سوپای زیاتری کرد، ئەوەبوو توسون یارمەتی زیاتری بۆ هات و توانی هێرشەکەی فراوانتر بکات و دەستی بەسەر ناوچەی صفرا داگرت چووە ناو شاری مەدینە لە ساڵی ١٨١٢ دواتر بەرەو مەککە بەڕێکەوتن بە سەرپەرشتی غالب کوڕی مساعد توانیان مەککەش داگیر بکەن هەروەها شاری جەددەشیان دەست بەسەرداگرت لەم جەنگە عوسمان المفایفی گەورەی تایف بەدیل گیرا و ڕاستەوخۆ ڕەوانەی میسر کرا لەوێشەوە بۆ ئەستەمبۆل نێردرا و لە ئەستەمبۆلیش چارەنووسی ژیانی ون کرا. دوای داگیرکردنی مەککە و جدە لە لایەن هێزەکانیەوە محمد علی خۆی هات بەڕێوەبردنی کاروباری مەککەی دایە دەست شەریف غالب، بەڵام دواتر دەستگیری کرد و ڕەوانەی میسری کرد لەوێشەوە ڕەوانەی ناوچەی سالوینك ی کرد لەوێمایەوە تاکو مرد.

توسون ویستی هێرشەکەی فراوان بکات بەرەو نەجد و بەرەی تایف بەڵام دواجار تووشی شکستی گەورە بوو لە ناوچەی(تربە) وە سوپایەکی نارد بۆ هێرش کردنە سەر ناوچەی عسیر لە ڕێگەی(قنفزە) بەڵام لەوێشەوە تووشی شکست بوو هەروەها میسریەکان پێشڕەویان کرد بەرەو ڕۆژهەڵات لە شاری مەدینەوە(الحناکیە) تووشی شکان هاتن ئەوەبو میسریەکان لە هەموو لایەکەوە

توشی شکست و زیان بوونەوە بەرامبەر هێزەکانی سعودیە، بەڵام زۆری پێ نەچوو سعود کبیر لە ساڵی ١٨١٣ کۆچی دوایی کرد و عبدالله ی کوڕی فەرمانڕەوایی گرتە دەست و جیاوازیەکی زۆری هەبوو لەگەڵ باوکی، وەکو باوکی بە تواناو لێهاتو نەبوو لە بەڕێوەبردنی دەوڵەت زاڵبون بەسەر کێشەکان و کۆنترۆڵکردنی بارودۆخی وڵات، ئەم بێ هێزیەی عبدالله هانی محمد علی دا تاکو خۆی ئامادە بکاتەوە بۆ لەناوبردنی بانگەوازی سەلەفیەتی موەحدینەکان و دەوڵەتی سعودی کە بڵاوکەرەوەی ئەم بیرە سەلەفیە بوو، پاشان بەرەو عسیر بەڕێکەوت و گەمارۆی دا لە هەردولا لای ڕۆژهەلات و ڕۆژئاوا کەچی پێشتر سوپاکەی لە دو بەرەی جەنگ زۆر بە خراپی تێك شکا بوو بەڵام هەر وازی نەهێنا لەو کاتەشدا عبدالله ی کوڕی سعود خەریکی چارەسەرکردنی چەند کێشەو ناکۆکیەکی ناوخۆی بوو کە نەیتوانی سەرکردایەتی بەرەی جەنگ بکات ئەوەبوو سەرکردایەتی جەنگی سپارد بە(فیصل)ی برای و کردی بە گەورەی سوپاکە، لە ناوچەی بەسل و ڕووبەڕوی سوپای میسر بونەوە بە سەرکردایەتی محمد علی بەڵام توشی شکستێکی گەورە بوونەوە، محمد علی ئەم سەرکەوتنەی بە هەلێکی باش زانی بۆ خۆ ئامادەکردنی هێرشی تر، ئەوەبوو هێرشێکی فراوانی دەست پێکرد بە توندترین شێوە بەرەو ڕووی سوپا و خەڵکی ناوچەکە بوونەوە بە ڕادەیەك خەڵکەکە لە ترسی ئەو توندو تیژی و تۆقاندنە پێش هاتنی سوپای میسری لە شوێنی خۆیان ڕایاندەکرد و ماڵەکانیان چۆل دەکرد، بەکارهێنانی ئەو توند و تیژیەی محمد علی بەرامبەر خەڵکی ناوچەکە و سوپای سعودی دەکرێ بۆ ئەو شکستانە بگەڕێتەوە کە لە سەرەتادا بەدەستی ئەوانەوە تووشی هاتبوو. سوپای میسر بەردەوام بوو لەسەر پێشڕەویەکەی تاکو گەیشتنە ناوچەی شەهران و سەرکەوتنی بەدەست هێنا دواتر گەیشتە سەرعیر ئەمیرەکەی ناوی

تامی کوڕی شعیب بوو بە دیلی گرت و دەست و پێی بە زنجیر بەست و لەگەڵ خۆی گێڕا دواتر بردی بۆ میسر پاشانیش ڕەوانەی ئەستەمبولی کرد. توسون کوڕی محمد علی چووە مەدینە و بەرپرسیاریەتی مەدینەی وەرگرت بۆیە بەهێزێکی سەربازیەوە هێرشی کردە سەر ڕۆژهەڵاتی شاری مەدینە تاکو گەیشتە شارۆچکەی(الرس) لە ناوچەی(الخبرا) نیشتەجێ بوو، لەم لاشەوە سوپای عبدالله ی کوڕی سعود هات و گەیشتە ناوچەکە و ڕێککەوتنامەیەك لە نێوانیان مۆرکرا کە بەڕێکەوتنامەی(الرس) ناونرا کە لەم چەند خاڵەی خوارەوە پێکهاتبوو:

١- وەستاندنی شەڕ لە نێوان هەردوولا.

٢- کشانەوەی سوپای محمد علی لە ناوچەی نەجد و بەڕێوەبردن و فەرمانڕەوایکردنی نەجد لە لایەن سعودیەکان.

٣- حیجاز لە ژێر دەسەڵاتی محمد علی دا دەمێنێتەوە و بەناوی عوسمانی فەرمانڕەوایەتی لێ بکرێت.

٤- هیچ گرفتێك بۆ حاجییەکان دروست نەکرێ.

٥- مسۆگەرکردنی سەلامەتی ڕێگای هاتوچۆکردن و گواستنەوەی کەلوپەل لە نێوان نەجد و شام و میسر و ئەستەمبول.

بەپێی ئەم ڕێکەوتنامەیە میسریەکان نەجدیان جێهێشت وە توسون گەڕایەوە میسر بەڵام محمد علی ئەم ڕێکەوتنامەیەی ڕەتکردەوە هێرشێکی تری نوێی دەست پێکرد بە سەرکردایەتی ابراهیم پاشای کوڕە گەورەکەی سوپای هەردولا لە ڕۆژهەڵاتی مەدینە بەیەك گەیشتن و شەڕ لە نێوانیان دا دەستی پێکرد ابراهیم پاشا توانی سەرکەوتن بەدەست بهێنێ و دەست بگرێت بەسەر ناوچەکانی(الرس، الخبرا، عنیزە) دواتر بەرەو درعیە بەڕێکەوت کە پایتەختی بزووتنەوەی وەهابی بوو خەڵکی درعیە شەڕێکی مان و نەمانیان کرد بۆ پاراستنی درعیە لە هێرشی

میسرییەکان بەڵام لەوە زیاتر نەیانتوانی بەرگەی هێرشی میسر بگرن بۆیە عبداللە ی کوڕی سعود ناچار بوو خۆی بدات بەدەست سوپاکە لە ساڵی ١٨١٦ نێدرا بۆ میسر و لەوێشەوە ڕەوانەی ئەستەمبول کرا لە ئەستەمبولیش لە سێدارە درا، هەروەها ابراهیم پاشا فەرمانی دا بە دورخستنەوەی هەردوو بنەماڵەی ئال سعود و ئال شێخ بۆ میسر تەنها ئەوانە مانەوە کە خۆیان ون کرد یاخود لە دەستی ئەواندا ڕایان کرد، دواتریش درعیە وێران کرد و خانوەکانی ڕوخاند و دارخورماکانیشی بڕی لە ساڵی ١٨١٩ دواتریش گەڕایەوە میسر بەم شێوەیە دەوڵەتی سعودیەی یەکەم کۆتایی هات(٤٤).

**گەڕانەوەی بزووتنەوەی وەهابی(موەحیدین):**

دوای ئەوەی دەوڵەتی سعودیەی یەکەم لە لایەن محمد علی لەناوچو بزووتنەوەی وەهابی بۆ جاری دوەم ڕیزەکانی خۆیان ڕێکخستەوە و توانیان درێژە بە بڵاوکردنەوەی بیرو باوەڕەکەیان بدەن کە لە پێشتریشدا توانی بوویان زۆربەی ناوچەکانی دوورگەی عەرەبی بگرێتەوە و بیخەنە ژێر دەسەڵاتی خۆیان، بۆیە سەرهەڵدانەوە و چالاکیان بۆ جاری دووەم ئاسانتر بوو زۆر بە ئاسانی توانیان چەند زانایەکی بەناوبانگ بخەنە ژێر کاریگەری بیروباوەڕی وەهابی ئەم زانایانەش بوونە هۆکارێك بۆ گواستنەوەی بیری وەهابی بۆ وڵاتەکەیان، گرتنە دەستی فەرمانڕەوایەتی چەند ناوچەیەك ئەمەش هۆکارێکی تر بوو بۆ دوبارە زیندوبونەوە و بوژانەوەیان(٤٥).

**سەرچاوە و پەراوێزەکان:**

١- هيد من كندر-فيرنر هيلغمن، اطلس-dtv تاريخ العالم من البدايات حتى الزمن الحاضر، ترجمة: إلياس عبدو الحلو، الطبعة ٢، بيروت، ص٢٠٩.

٢- د.محمد سهيل تەقوش، پوختەی مێژووی ئیسلامی، وەرگێرانی: نیهاد جلال حبیب، چاپی یەکەم، دار الفکر، بیروت، لبنان، ٢٠٠٩، ل٤٠٧.

٣- د.حکیم أحمد مام بەکر و م.عدنان ئەمین محمد، بزووتنەوەی چاکسازی عوسمانی لە سەردەمی سوڵتان مەحمودی دووەم(١٨٠٩-١٨٣٩)، گۆڤاری مێژوو، ژمارە ٢، چاپخانەی منارە، هەولێر، بەهاری ٢٠٠٧، ل٢٠٢.

٤- كامران عبدالصمد الدوسكي، كوردستان العثمانية في النصف الأول من القرن التاسع عشر دراسة تاريخية تحليلية، ماجستير، كلية الآداب، جامعة صلاح الدين، ٢٠٠٠، ص٦٢؛ د.حکیم أحمد مام بكر و م.عدنان ئەمین محمد، هەمان سەرچاوە.

٥- محمد حرب، السلطان عبدالحميد الثاني اخر السلاطين العثمانين الكبار، الطبعة الأولى، ديمشق، ١٩٩٠، ص١٥؛ د.حکیم أحمد مام بكر و م.عدنان ئەمین محمد، هەمان سەرچاوە.

٦- ابراهيم خليل أحمد، تاريخ الوطن العربي في العهد العثماني(١٥١٦-١٩١٦)، الموصل، د.ت، ص١٧٨؛ د.حکیم أحمد مام بەکر و م.عدنان ئەمین محمد، هەمان سەرچاوە.

٧- محمد فريد بك المحامي، تاريخ الدولة العلية العثمانية، الطبعة ١١، دار النفاس، بيروت، لبنان، ص٣٩٩.

٨- محمد فريد بك المحامي، نفس المصدر، ص٣٩٧.

٩- محمد فريد بك المحامي، نفس المصدر، ص٣٩٨.

١٠- بۆ زانیاری زیاتر تەماشای ئەم سەرچاوەیە بکە نوبل باربەر، فەرمانڕەوایەتی قۆچی زێڕین لە سوڵتان سلێمانی قانونیەوە تا ئەتاتورک، وەرگێڕانی ڕێبوار کەریم وەلی، چاپی یەکەم، هەولێر، ٢٠٠١، ل١٠٤.

١١- أحمد أمين، زعماء الاصلاح في العصر الحديث، القاهرة، ١٩٤٨، ص٢٧؛ د.حکیم أحمد مام بەکر و م.عدنان ئەمین محمد، سەرچاوەی پێشوو.

١٢- محمد فريد بك المحامي، المصدر السابق، ص٢٩٣.

١٣- محمد كمال الدسوقي، الدولة العثمانية والمسألة الشرقية، القاهرة، ١٩٧٦، ص١١٢؛ د.حکیم أحمد مام بەکر و م.عدنان ئەمین محمد، سەرچاوەی پێشوو.

١٤- محمد فريد بك المحامي، المصدر السابق، ص٤٣٠.

١٥- محمد فريد بك المحامي، نفس المصدر، ص٤٣٠-٤٣١.

١٦- احمد عبدالرحيم مصطفى، في اصول التاريخ العثماني، ط١، بيروت، ١٩٨٢، ص١٥٢؛ د.حكيم أحمد مام بەكر و م.عدنان ئەمین محمد، سەرچاوەی پێشوو.

١٧- نۆبل باربەر، سەرچاوەی پێشوو، ل١١٥.

١٨- د.حكيم أحمد مام بەكر و م.عدنان ئەمین محمد، بزووتنەوەی چاكسازی عوسمانی لە سەردەمی سوڵتان مەحمودی دووەم(١٨٠٩-١٨٣٩)، سەرچاوەی پێشوو، ل٢٢٤-٢٣٦.

١٩- سعدى عثمان هروتى، دراسة في تطور سياسة الهيمنة العثمانية في كوردستان(١٥١٤-١٨٥١)، الطبعة الأولى، مطبعة خانى، دهۆك، ٢٠٠٨، ص١٧٧-١٨١.

٢٠- د.محمد سهيل تەقوش، پوختەی مێژووی ئیسلامی، سەرچاوەی پێشوو، ل٤٢٢.

٢١- د.محمد سهيل تەقوش، پوختەی مێژووی ئیسلامی، هەمان سەرچاوە، ل٤٢٣.

٢٢- د.محمد سهيل تەقوش، پوختەی مێژووی ئیسلامی، هەمان سەرچاوە، ل٤٢٤-٤٢٥.

٢٣- د.علی محمد صلابی، دەوڵەتی عوسمانی،

٢٤- د.محمد سهيل تەقوش، پوختەی مێژووی ئیسلامی، سەرچاوەی پێشوو، ل٤٣٠-٤٣٢.

٢٥- د.ئەلبێرت عيسى، ناسیۆنالیزمی عەرەبی لە ئیمپراتۆریەتی عوسمانیەوە بۆ عێراقی سەردەمی فاشیزم، چاپی یەكەم، سلێمانی، ٢٠٠٨، ل٢٣-٢٥.

٢٦- دەوڵەتی عوسمانی، وەرگێڕان: د.محمد عبدالله كاكەسور، گۆڤاری مێژوو، ژمارە ١٤، چاپخانەی گۆڤار، ساڵی چوارەم، بەهاری ٢٠١٠، ل٢٠٩-٢١٠.

٢٧- انترنت، ويكيبديا، الموسوعة الحرة، محمد علي.

٢٨- د.علي وردي، لمحات اجتماعية من تاريخ العراق الحديث، الطبعة الأولى، الناشر: شركة دار الوراق، ٢٠٠٧، ص٢٨.

٢٩- ج.ود.سورديل، معجم الاسلام التاريخي، ترجمة: الدكتور أ.الحكيم، الدار اللبنانية للنشر الجامعي، انطلياس، لبنان، ٢٠٠٩، ص٨٥٢-٨٥٣.

٣٠- د.علي وردي، لمحات اجتماعية من تاريخ العراق الحديث، المصدر سابق، ص٢٨.

٣١- د.عبدالعزيز نوار، النهضة العربية الحديثة، الطبعة الأولى، الناشر: عين الدراسات والبعوث الانسانية والاجتماعية، ٢٠٠٢، ص٢٣٤.

٣٢- ج.ود.سورديل، معجم الاسلام التاريخي، ترجمة: المصدر سابق، ص٨٥٢-٧٥٣.

٣٣- د.علي وردي، لمحات اجتماعية من تاريخ العراق الحديث، المصدر سابق، ص٣٠.

٣٤- د.محمد سهیل تەقوش، عوسمانیەکان لە دامەزراندنی دەوڵەتەوە تا کودەتا بەسەر خەلافەتدا، وەرگێڕان: نەریمان خۆشناو-مستەفا سەید مینە، چاپی دووەم، کتێبخانەی ئاوێر، ل٤١٣.

٣٥- د.علي وردي، لمحات اجتماعية من تاريخ العراق الحديث، المصدر سابق، ص٣٩.

٣٦- د.علي وردي، لمحات نفس المصدر، ص٥٤.

٣٧- د.محمد سهیل تەقوش، عوسمانیەکان لە دامەزراندنی دەوڵەتەوە تا کودەتا بەسەر خەلافەتدا، ل٤٢٤-٤٢٥.

٣٨- د.محمد سهیل تەقوش، عوسمانیەکان لە دامەزراندنی دەوڵەتەوە تا کودەتا بەسەر خەلافەتدا، هەمان سەرچاوە، ل٤٣٣-٤٣٤.

٣٩- محمود شاكر، التاريخ الاسلامي العهد العثماني، الطبعة الرابعة، المكتب الاسلامي، ٢٠٠٠، ج٨، ص٢٥٤.

٤٠- أ.د.زكريا قورشون، العثمانيون وآل سعود في الأرشيف العثماني(١٧٤٥-١٩١٤م)، الدار العربية للموسوعات، الطبعة الأولى، بيروت، لبنان، ص٣٣.

٤١- د.محمد أحمد درنيقة، الشيخ محمد بن عبدالوهاب، الدار العربية للموسوعات، الطبعة الأولى، ٢٠٠٨، ص٣٥.

٤٢- أ.د.زكريا قورشون، العثمانيون وآل سعود في الأرشيف العثماني(١٧٤٥-١٩١٤م)، المصدر سابق، ص٤٢-٤٤.

٤٣- محمود شاكر، التاريخ الاسلامي العهد العثماني، المصدر سابق، ص٢٥٧-٢٥٩.

٤٤- محمود شاكر، نفس المصدر، ص٢٦٠-٢٦٣.

٤٥- انترنت، ويكيبيديا، الموسوعة الحرة، الوهابية.

# تەریقەتی سەفەوی و هەنگاونان بەرەو بنیادنانی دەوڵەت

مصطفی محمد / قوتابی ماستەر

تەوەرەی یەکەم

(کورتەیەکی مێژوویی لە بارەی سەرهەڵدانی تەریقەتی سەفەوی)

دیارە ئەم تاج و تەختە بەرهەمی هەوڵ و ماندوویوونی ژمارەیەك لە کەسایەتیە دەروێش و سۆفیەکانی (تەریقەت)[١]ی سەفەوی بوو کە هەر لەسەردەمی (شێخ سەفیەدینی ئەردەبێلی). کە دامەزرێنەری رێبازی دەروێشی سەفەویەکان بوو هەر لەکۆتایی سەدەی ١٣ سەرەتای سەدەی ١٤ز دەستی بەبلاوکردنەوەی رێبازە تایبەتیەکەی خۆی کردووە، شێخ سەفیەدین نەك تەنیا دامەزرێنەری رێبازێکی فکری یاخود ئاینی بووە، بەڵکو وەك کەسایەتیەکی خاوەن ئەزموون و دەست رۆیشتوو لە مێژووی سیاسی ئێرانی سەردەمی خۆی کاریگەریەکی زۆری هەبووە ، لەگەڵ ئەوەشدا شێخ سەفییەدینی ئەردەبیلی بە یەکێك لە زاناو موریدو قوتابی شێخ زاهیدی گەیلانی هەژمار دەکرێت ، لەبەر لێهاتووی بەرزی کەسایەتی بیبی فاتیمەی کچی دەدات بە شێخ سەفییەدین ، لە دوای مردنی شێخ زاهیدی گەیلانی ، پایەکی بەرز وەردەگرێت و بە هۆی بوونی ئەو زانستەی کە هەیبووە بۆتە جێگای متمانەو رێز لێنان لەلایەن ئەبو سعید بهادرخانی ئیلیخانی وەزیرەکەی رەشیددین و میر ئولوس چوپان سەرۆکی هۆزی

سـەلدوزی مـەغۆلی، لەگـەڵ ئەوەشـدا ئامـادە نـەبوو هـیچ پۆسـتێکی سیاسـی وەربگرێت ، بەڵکو وەك پیاوچاکێکی خودایی ناوبانگی دەرکردبوو[٢].

هەرچەندە بـەگوێرەی خـاوەن پـەرتووکی عـالم ارای عباسـی رەگ و ریـشەو بنەچەی سەفەوییەکان لە رێگەی رێکخستنی شـەجەرەیەك دەیانگەرێنێتـەوە بـۆ سـەر ئیمـام عـەلی( ر. خ ) لەگـەڵ ئەوەشـدا زۆر لـە مێژوونوسـان کـۆکن و لـەو باوەرەدان کە شێخ سەفییەدین سوننە مەزهەب بووەو لەسەر مەزهەبی شافیعی، هیچ کاتێك لەسەر مەزهەبی شیعە نەبووە[٣].

لەدوای کۆچی دوایی شێخ سەفییەدین لە ساڵی ١٣٢٨ ز ، کـورە گـەورەکـەی بە ناوی سەدرەدین جلەوی ئەم رێنمایی و بنەمایانـە دەگرێتـە ئەسـتۆ ، هـەر لـە دوای بـاوکی دەبێتـە سـەر دەسـتەی موریـدەکانی و شـوێنکەوتووانی ، چـونکە کەسـێکی زۆر لێهـاتوو بـووەو هیـچی لـە بـاوکی کـەمتر نـەبووە لـە پێنـاو بلاْوکردنەوەی رێچکەو رێنماییە ئایینیەکان[٤].

بە مردنی سەدرەدین ئیمامەت دەگوازرێتەوە بۆ کورەکـەی بـە نـاوی خواجـە عەلی ، گرنگترین تایبەتمەندی لەو کەسایەتیە بـریتی بـوو لـە هـەڵگرتنی نازنـاوی سوڵتان ، بە واتایەکی دیکە سوڵتانی پیاو چاکەکان[٥].

خواجە عەلی لە ماوەی ژیانیدا توانی سـێ جـار دیـدار لەگـەڵ (تـەیمورلنگ)[٦] ئەنجام بدات و لە گرنگترین کارەکانی کـە ئـەنجامی دا لـە مـاوەی ژیانیـدا تـوانی باوەر بە تەیمورلنگ بێنێت کە لێبوردن دەربکات بۆ ئەو دیلانەی کە لـە (جـەنگی ئەنقرە)[٧] ١٤٠٢ ز کەوتبوونە دەست تەیمورلنگ دوای شکست خواردنی بایەزیـدی سولتانی عوسمانی، کاتی گەرانەوەی بـۆ سـەمەرقەند لـە ئـەردبیل دیـدار لەگـەڵ خواجە عەلی ئەنجام دەدات و داوای ئازادکردنی دیلەکانی لێکرا لە لایـەن خواجـە عەلییەوە . دواتر ئەوانە دڵسۆزی خۆیان بۆ خواجە عەلی راگەیاند و نەوەکانیان

لە دواتر رۆڵی سەرەکی دەگێرن بۆ دامەزراندنی دەولەتی سەفەوی و پتەوکردنی پێگەی دەولەتەکە[٨].

تەریقەتی سەفەوی لەناو ئێلە تورکمان و ئازەرییەکان و ئازەربایجان و ئەنادۆڵ پەرەی دەسەند ، رۆژ لەدوای رۆژ دەسەڵاتی ئایینی ودونیاییان بەهێزتر دەبوو، بۆ ئەم مەبەستەش موریدەکانی سەفەوی لەسەردەمی سولتان حەیدەر بۆجیاکردنەوەی خۆیان لە خەڵك کلاوێکی سووریان لەسەر دەنا، خەڵك پێیان دەگوتن( قزڵباش)[٩]، بەڵام خۆیان پێیان دەگووت تاجی حەیدەری[١٠].

هەرچەندە شێخ سەفیەدین کەسایەتییەکی سونە مەزهەب بووە لەسەر رێچکەی شافیعی، دواتر یەکێك لە نەوەکانی بە ناوی خواجە عەلی دێتە سەر مەزهەبی شیعە گەری دوانزە ئیمامی ، لەگەڵ ئەوەشدا لە سەرەتادا تەریقەتی سەفەوی مۆرکێکی ئایینی پێوە دیار بووەو دوور بووە لە سیاسەت ، بەڵام لە سەردەمی یەکێك لە نەوەکانی دیکەی شێخ بە ناوی جونەید موریدەکانی خۆی رێکخست لە شێوەی یەکەی سەربازی[١١].

لەماوەی ژیانیدا شێخ جونەید هەوڵی دەدا پەرە بە مەزهەبی شیعەگەرایی بدات، دواتر ئەو تەریقەتە سۆفیگەریەی مۆرکێکی ئایینی پێوە دیاربوو گۆرانکاری بەسەردا هێنا کە بووە هێزێکی ناوخۆیی بەهێز کە بتوانێت هەرکارێك ئەنجام بدات لەکاتی گونجاندنی بارودۆخدا، هەروەها بەهێز بوونی شێخ جونەید و فراوانبوونی دەسەلاتی، بووە هۆکارێك کە فەرمانرەوای (قەرەقوینلو)[١٢] لێی بکەوێتە گومان لەرەفتارەکانی، بۆیە دواتر بریاری دوورخستنەوەیان دا بۆ دەرەوەی وڵات[١٣].

دەرکردن و دوورخستنەوەی شێخ جونەید لە ئەردەبیل، دەگەرێتەوە بۆ خراپی پەیوەندی نێوان شێخ جونەید و شێخ جەعفەری مامی کە داوای

ڕێبەرایەتی تەریقەتی سەفەوی دەکرد، لەئەردەبیل و هەلقوستنەوەی ئەو ناکۆکیە لەلایەن (جیهانشاه کوری قەرە یوسف)[14] فەرمانرەوایی قەرەقۆینلو و زۆر بە وردی چاودێری ئالۆزی و گرژییەکانی نێوانیانی دەکرد، زیاتریش پالپشتی شێخ جەعفەر دەکات بەهۆی ئەو پەیوەندیە خێزانییەی نێوانیان، لەرێگای پێدانی کچێکی جیهانشاه بە کورێکی شێخ جەعفەر لەلایەك و مەترسیەکانی جیهانشاه لە فرەوان بوونی دەسەلاتی شێخ جونەید[15].

دوای دوورخستنەوەی شێخ جونەید تووشی سەخترین ژیان دەبێتەوە ، تەنانەت وەك رەوەندێکی لێ دێت لە شوێنێك بۆ شوێنێك دەروات ، بەلاَم لە کۆتایدا لە چیاکانی ئارسوس لە کەنداوی ئەسکەندەرونە لە یەکێك لەقەلاَ کۆنەکانی خاچ هەلگرەکان نیشتەجێ دەبێت لەگەلَ شوێن کەوتووانی ، سەرەرای ئەوەش لەکارکردنی بێ وچان دەبێت لە پێناو گەشە پێدانی مەزهەبی شیعەگەرایی ، ئەم هەولآنەشی دووبارە دەبێتە هۆکار کە (جقمق)[16]سولتانی مەمالیك لێی بکەوێتە گومان و هەولی دەستگیرکردنی دەدات، بەلاَم دەتوانێ خۆی رزگار بکات و پەنا بباتە بەر ئۆزۆن حەسەن دوژمنی سەر سەختی دەولەتی عوسمانی لەدیاربەکر ئەمەش رێگای لەبەردەم شێخ جونەید والاَکرد بۆ بلاَوکردنەوەی هزرەکەی بێ ئەوەی دژایەتی بکرێت[17].

شێخ جونەید لەلای فەرمانرەوای (ئاق قۆینلو)[18]مایەوە، دواتر پادشای ئاقوینلو لەگەلَ ئەم بنەمالَەیە خزمایەتی دامەزراند ، ئەوەبوو خەدیجەی خوشکی خۆیدا بەشێخ جونەیدی نەوەی شێخ سەفییەدین ئەردەبیلی، هەوالی خواستنی خوشکی ئۆزۆن حەسەن لەلایەن شێخ جونەید بە هەموو لایەکەوە بلاَوبۆوە، تەنانەت جیهانشاه فەرمانرەوای ئاق قۆینلو ئەو پەیوەندییەی بەمەترسی بۆ سەر دەسەلاتەکەی دانا و شێخ جونەیدیشی بە دوژمنی سەرسەختی خۆی ئەژمارکرد[19].

بوونی رکابەرییەکی توند لەنێوان هێزەکانی (قەرەقوینلو) بەسەرکردایەتی سولتان جیهانشاه کە ئەوکات فەرمانرەوایی ئازەربایجان بووە، کە لەقۆناغی لاوازی و رووخان بووە بەرامبەر بەهێزێکی دیکە بەناوی (ئاق قوینلو) بە سەرکردایەتی ئۆزۆن حەسەن، هەرچەندە شێخ جونەید لە رووی هێزەوە زۆر بە توانا بووەو سەرەرای پالپشتییەکانی ئۆزۆن حەسەن، بەلام نەیتوانی ئەردەبیل لەسولتانی قەرەقوینلو وەربگرێتەوە، هەربۆیە بەناچاری روودەکاتە (شێروان)[20] بۆ جەنگ کردن دژی (چراکس)[21]ە، بەلام رووبەرووبونەوەی لەلایەن فەرمانرەواکەی میر خەلیل شێروانشاه دوای شەرێکی توند شێخ جونەید دەکوژرێت لەگۆرەپانی جەنگ لەدۆلی قەرەسوو سالی ١٤٦٠ز[22].

دوای ئەم رووداوەش بەیەك سال شێخ حەیدەر لە ئامەد لە دایك دەبێت و لەلایەن ئۆزۆن حەسەنەوە چاودێری دەکرێت و گەورە دەبێت ، تا ئەوکاتەی فەرمانرەوای ئاق قوینلو دەتوانێ کۆتایی بەدەسەلاتی قەرەقوینلو بێنێت و جیهانشاه بکوژێت،پایتەختەکەی لە ئامادەوە بگوازێتەوە تەورێز، کە ئەوکات حەیدەر تەمەنی تەنها نۆ سالانەو دەگەرێتەوە ئەردبیل بۆ ئەوەی ببێتە جێنشینی باوکی بۆ رێبەرایەتی تەریقەتی سەفەوی[23].

شێخ حەیدەر بەردەوام دەبێت لەسەر رێچکەی باوکی و یارمەتیدانی بەردەوامی لەلایەن ئۆزۆن حەسەن، هەروەها پەیوەندیە خزمایەتیەکەیان زیاتر پتەوتربوو، دوای ئەوەی ئۆزۆن حەسەن هەلسا بەپێدانی کچەکەی خۆی بە ناوی مارتا بەشێخ حەیدەر، کە ئیسماعیل میرزای سەفەوی یەکێك لە نەوەکانی شێخ حیدەرەو لە دواتردا بناغەی دەولەتی سەفەوی بە شێوەی پراکتیکی لە سەر دەستی بنیاد دەنرێت، هەروەها دوای سەرکەوتنی ئۆزۆن حەسەن بەسەر جیهانشاه کوری قەرە یوسف میری قەرە قوینلو وسولتان (ئەبو سەعید)[24]ی

مـیری تـەیمور رێگـای والآ کـرد بـۆ ئـۆزۆن حەسـەن ببێتـە فـەرمانڕەوای زۆر لەویلایەتەکانی ئێران[25].

کاتێك ئۆزۆن حەسەن کۆچی دوایی دەکات لەساڵی ١٤٧٨ز هێشتا شێخ حەیدەر تەمەنی نەگەیشتبوە هـەژدە ساڵی و هـەوڵی زۆری داوە تـا مەرامـەکانی باوکی بهێنێتە دی و تۆڵەی خوێنی باوکی لە شێروانشاە بکاتەوە[26].

بۆ بەدیهێنانی ئەم مەبەستە هـەولی جدی دەدا بۆ چەکدارکردنی هـەوادرو لایەنگرانی ، تا کار گەیشتبۆوە ئەو ڕادەیەی کە ماڵەکەی ببێتە ئـەنباری چـەك، مێژوونوسێکی ئێرانی بەسەر سوورمانەوە دەنووسێت (( لەئـەردەبیل[27] لـەجێی قەلەم نرەی شمشێرەکان دەبیستران ))[28].

لـە یەکـەمین هەنگاویـدا شـێخ حەیـدەر لەساڵی ١٤٨٣ز بـۆ بەدەستهێنانی دەسـکەوتی جـەنگی دوای وەرگرتنـی ڕەزامەنـدی شێروانـشاە فـەرمانڕەوایی ناوچـەکە تـوانی سـەرکەوتن بەدەسـت بێنـێ بەسـەر چەرکسەکان، دوای ئـەم سـەرکەوتنانە حەیـدەر بـیری لـە پـەلاماردانی شێروانشاەفەرخ یەسار کـردەوە، تاوەکو تۆڵەی خوێنی باوکی بکاتەوە[29].

هەروەها لەساڵی ١٤٨٨ز ڕوودانی شەڕێکی لێکەوتەوە لە نێوان شێروانشاە و شێخ حەیدەر کە سەرکەوتن بۆ هێزەکانی شێخ حەیدەر بوو تەنانـەت بـارودۆخی شـەڕەکە وایکـرد کـە شێروانـشاە ڕوو لـە قـەلای گوڵـستان بکـات و دواتـر داوای یارمەتی لە میر یعقوب بکات کە کوڕی ئۆزۆن حەسەن بـووە،چـونکە مـیر یعقـوب مەترسی و دڵەڕاوکێی زۆری لەسەر بـووە بەرانبـەر بـە فـراوان بـوونی دەسـەڵاتی شێخ حیدەر لەناوچەکە، بۆیـە کەوتـە یارمـەتی دانـی شێروانـشاە و لـە ئاکامـدا شەڕێکی خوێناوی ڕویدا کە تێیدا شێخ حیدەر کوژرا لە تـەمموزی سـاڵی١٤٨٨ز، لە سنووری تەبەرستان لە دامێنی چیاکانی ئەلبورز[30].

پاش تێکشکان وکوژرانی شێخ حیدەر دواتر سەری شێخ بەبڕاوی لە مەیدانێك لە (تەورێز)[٣١] بەدارەوە هەلواسرا، هەربۆیە دەست بەجێ سوڵتان یعقوب فەرمانیدا هەرسێ شاەزادە(عەلی،ئیسماعیل،ئیبراهیم)و مارتای دایکیان ببرێتە لای مەنسور بەگی حاکمی شیراز لە ویلایەتی فارس تا لە ئەستەخر زیندانی بکرێن[٣٢].

سەبارەت بەموریدەکانی سەفەوی دوای کوشتنی شێخ حیدەر، هەڵسان بەدانانی عەلی لەجێگای باوکی وەك رێبەرو (مرشد) سوڵتانیان[٣٣].

دوای مردنی سوڵتان یەعقوب لە ساڵی ١٤٩٠ز، دووبەرەکی و ململانێ باڵی کێشا بەسەر بنەماڵەی ئاق قوینلو لەئاکامدا (بایسەنقەر) توانی دەست بەسەر دەسەڵاتدا بگرێت لەساڵ١٤٩٠ز ، بەڵام رووبەروبونەوەی بەرامبەر ئامۆزاکەی رۆستەم میرزا کە دژی وەستا بوو، چونکە خۆی ئارەزووی وەرگرتنی دەسەڵاتی هەبووە، هەربۆ ئەم مەبەستەش سوڵتان بایسەنقەر داوای لە حاکمی (شێروان) کرد بۆ لێدانی ئامۆزاکەی، لەبەرامبەردا رۆستەم میرزا هەستی کرد ناتوانی رووبەرووی ئەم هێزە و هاوپەیمانەکەی ببێتەوە، بۆیە پەنای بردە بەر ئازادکردنی نەوەکانی شیخ حەیدەر لە ئەستەخر و داوایکرد لێیان بە کۆکردنەوەی هێز بۆئەوەی رووبەرووی بایسنقەر بێتەوە، هەر بۆیەش (عەلی)کوڕە گەورەی شێخ حیدەر توانی ژمارەیەکی زۆر لە هەوادارانی کۆ بکاتەوە و پاڵپشتی لە میرزا بەگ بکات لە ئاکامدا لەشەڕێکی یەکلاکەرەوەدا نزیك (ئاهر) ڕوستم میرزا توانی زاڵ بێت بەسەر هێزەکەی بایسنقر و دواتر کوژرانی[٣٤].

دوای ئەم ڕووداوەش سوڵتان عەلی لەجاران بەهێزتر بوو، بۆیەش ڕوستەم میرزا لێی کەوتە ترسەوەو هەولیدا بەفێڵێك لە ناوی ببات، بۆیە سوڵتان عەلی و

موریدەکانی بەردەوام بوو لە بەرەوپێشچوون بۆئەوەی سەرکردایەتی دەوڵەتی سەفەوی بکات لەئەردەبێل، بەڵام پێش گەیشتنی ڕووبەڕووی هێزەکانی ڕۆستەم میرزا دەبێتەوە و دەکوژرێت، هەندێکیش پێیانوایە کە خنکا بێت[٣٥].

لەلایەکی تر دەنگۆی ئەوە هەبوو کە لەڕێگای داوەتکردنیان بۆ تەوریزو هەر لەوێش (عەلی) دەست بەسەر دەکات و دواتریش فەرمانی کوشتنی دەدات[٣٦].

ڕوودانی لەناوبردنی سولتان عەلی لە سالی ١٤٩٤ز بووە هۆکارێك کە موریدە دلسۆزەکانی تەریقەتی سەفەوی هەولیاندا هەردوو براکەی تری سولتان عەلی (ئیسماعیل و ئیبراهیم) بگەیننەوە ئەردەبیل و لەهەولی زۆردا بوون بۆ پارێزگاریکردن لێیان،هەروەها شاردنەوەیان لە نێردراوانی ڕۆستەم میرزا، و قۆزتنەوەی دەرفەتێك و توانیان بیانگەیەننە گەیلان، لە سەرەتادا توانیان بیانگەیەننە رشت و مانەوەیان بۆ ماوەی چەند هەفتەیەك دواتر ڕۆیشتن بە ئاراستەی (لاهیجان) لەژێر چاودێری کارکیا میرزا عەلی بۆماوەی چەند ساڵێك دەمێنێتەوە،و هەرچەندیش کارکیا میرزا عەلی لەدەست و پەیوەندەکانی ئاق قوینلو بووە[٣٧].

لەماوەی سالانی ١٤٩٥ز بەدواوە میرەکانی ئاق قوینلو بەربوونە گیانی یەکتری بەتایبەتی لەنێوان ئەحمەد بەگ کوری ئۆغرلوی نەوەی ئۆزۆن حەسەن و ڕۆستەم میرزای ئامۆزای، لەئاکامی ململانێیەکە ڕۆستەم میرزا لەسالی ١٤٩٦ز دەکوژرێت، هەرچەندە بەمەش ناکۆکییەکان کۆتایی نەهات، بەلکو تا دەهات ناکۆکییەکان چڕتر دەبۆوە، لەئەنجامدا لەنزیك ئەسفەهان سالی ١٤٩٧ز ئەحمەد بەگ دەکوژرێت ، دواتر دووبەرەکی و ناکۆکی لەسەر دەسەلات دابەش دەبێتە سەر سێ بەرە کە هەر یەکەیان خۆیان بەشایەنتر دادەنا بۆ وەرگرتنی دەسەلاتی رەها لەولاتدا، لەوانە مراد کوری یەعقوب میرزاو محمد میرزای کوری یوسف بەگ

و براکەی بە ناوی ئەلوەند میرزا، لە کۆتایدا ئەلوەند میرزا توانی زاڵ بێت بەسەر رکابەرەکانی و فەرمانرەوایی تاکە کەسی پیادە بکات ، هەرچەندە یەکگرتنی سولتان مراد و ئەلوەند میرزا هیچ سودێکی بەدەسەلاتی ئاق قوینلی نەگەیاند، چونکە ململانێی دوورو درێژی نێوان بنەماڵەکەیان هۆکارێك بوو بۆ لاوازبوونی دەولەتەکەیان و دواتر روخانی بەدەستی شاە ئیسماعیل سەفەوی[٢٨] .

بۆمان دەردەکەوێت تەریقەتی سەفەوی ببووە بزوتنەوەیەکی ئایینی – رامیاری ئەوەندە بەهێز بەشێوەیەك کوژرانی یەك لەدوای یەکی سەرکردەکانی نەبووە هۆی هەڵوەشاندنەوەیان، بەلکو زەمینەی خۆشکرد دەسەلاتی سیاسی بگرنە دەست، لەلایەکی دیکە بارودۆخەکە بواری رەخساند بۆ کەسایەتی شاە ئیسماعیل دوای کوژرانی عەلی برای ببێتە رێبەری (مرشد) تەریقەتی سەفەوی و هەلومەرجی نالەباری بارودۆخی سیاسی لەنێوان بنەماڵەی ئاق قوینلو هەموو بەیەکەوە رێگایان خۆش کرد بۆ شاە ئیسماعیلی تەمەن سێزدە ساڵ کە بکەوێتە خۆ ئاشکرا کردن لە لاهیجان دواتر بەرەو ئەردەبیل کەوتە رێ، تا دەهات ژمارەی لایەنگرانی روو لەزیادبووندا بوون، دوای رووبەرووبونەوەیەکی خوێناوی شاری تەورێزی گرت بەمەش کۆتایی بە فەرمانرەوایی ئاق قوینلو هێناو بەردی بناغەی دەولەتێکی نوێی ئایینی شیعەگەرایی سیاسی لەئێران هێنا کایەوە .

تەوەرەی دووەم

((شاە ئیسماعیلی سەفەوی و بنیادنانی دەوڵەت))

شاە ئیسماعیل رۆژی سێشەمە سالی ١٤٨٦ز نزیکەی یەك سال پێش کوژرانی حەیدەری باوکی لەمەیدانی جەنگدا لەدایك بووە، دوای ئەم رووداوە مارتای دایکی شاە ئیسماعیل لەگەل براکانی بەفەرمانی سولتان یعقوب لە ئەستەخر زیندان دەکریت، تاکو ئەوکاتەی رۆستەم میرزا لە پێناو بەرەنگاربونەوەی نەیارەکانی رزگاریان دەکات، بەلام دواتر لەریگای فێلّ و تەڵەکەوە دەتوانیت زالّ بیت بەسەر (علی ) لەئاکامدا مارتاو منداڵەکانی روو لەگەیلان دەکەن کە ئەوکات تەمەنی شاە ئیسماعیل سەفوی تەنها ١٢سال دەبیت، هەروەك لە پێشودا باسمان کرد کە حاکمی لاهیجان زۆر بەرێزەوە پاریزگاری لیّ دەکات تاکو ئەو کاتەی بارودۆخ لە باردەبیت، گۆرانکاریەکیی گرنگ لە مێژوی ئێران دێتە ئاراوە، ئەویش کۆتایی هینا بەفەرمان رەوای ئاق قوینلی و دامەزراندنی دەولەتێکی خاوەن مۆرکی ئاینی سیاسی شیعەگەرایی بەسەرکردایەتی شاە ئیسماعیلی سەفەوی.

دامەزراندن و سەرهەلدانی دەولەتی سەفەوی لەسەر دەستی شاە ئیسماعیل لە ئیران، کاریگەریەکی گشتگیری هەبوو لە هەموو بوارەکانی سیاسی و کۆمەلایەتی و ئاینی نەك تەنها لەسەر ئیران، بەلکو لەسەر عیراق و تورکیا و ئەفغانستان و هیند، بەتایبەتی دوای سەپاندنی مەزهەبی شیعەگەرایی (دوانزە ئیمامی)[٣٩] بەزۆری لەسەرئیرانیەکان و کردنی بەمەزهەبیکی فەرمی حکومەتی ئێران[٤٠].

هــەروەها ئــەم ســەردەمە بریتــی و لەســەردەمی دەمــارگیری هۆزایــەتی ومەزهەبی شیعەگەرایی دەستیکردبوو بەبڵاوبونەوە لەولات ، لەگەل ئەوەش شاه ئیسماعیل بە رەچەلەك تورکە بۆیە زۆر ئاسان بووکە پـشت ببەسـتێ بـە هـۆزە تورکەکان کە پەیوەست بوون بە دەمارگیری هۆزایەتی و مەزهەبی شیعەگەرایی، بەتایبەتی ئەو هۆزانەی ناسراون بە (حەوت هۆزەکە) کە ئەوانیش بریتی بوون لـە (ئۆستاجلو ، شاملو ، تکالو ، بهارلو ، زولقەدر، قاجار ، ئەفشار ، کە دواتـر رۆڵی سەرەکی دەبینی لە بنیادنانی پیگەو دەسەلاتی سەفەوی لەئێران[٤١] .

شاه ئیسماعیل دەستی کرد بەکۆکردنەوەی هێز و لەیەکەم چالاکی پەلاماری (باکو شماقە) ی دا مەبەستیش لەم چـالاکیە دابـین کـردی هـەرێمێکی سـەربەخۆ تاکو لە داهاتودا بتوانێت لەوێوە دەست بکات بەهەلمەت بۆ دەست گرتن بەسـەر عەرشی فارس[٤٢] .

هەروەها یەکێك لە ئامانجە کۆنەکانی شاه ئیسماعیل تۆلەکردنەوەی خـوێنی باوکی بوو لەحاکمی شێروان و لەلایەکی دیکە داگیر کردنی ناوچەی دەولەمەنـدی شـیروان کـە پێداویـستی ئـابووری بـۆ لایـەنگرانی دابـین دەکـات، هەربۆیـەش لـە رووبەڕووبونــەوەی شــاه ئیــسماعیل دەتوانێــت زال بێــت بەســەر لەشــکری شیروانشاه، خودی شیروانشاه بەدەسـی شـاهگولدی ئاغـا دەسـتگیرکراو کـوژرا، بەم جۆرە قەلای گولستان لەسالی ١٥٠٠ز لەلایەن شاه ئیسماعیل داگیرکراوە[٤٣] .

لەوکاتەدا ناکوکی و شەرەکانی نێوان محمد مـیرزا و ئەلوەنـد مـیرزا ،کـورانی یوسف میرزای بایندەری[٤٤] بەسـوودی شـاه ئیـسماعل گەرایـەوە بـەجۆریك شـاه ئیـسماعیل تـوانی لـەماوەی یـەك سـالدا بـاکور کـۆنترۆل بکـات و سـنووری حکومەتەکەی بگەیەنێتە سنووری جورجیا[٤٥] .

سەبارەت بەئەلوەند میرزای ئاق قۆینلی بەهێزێکی نزیکەی سی هەزاریەوە رووبەرووی هێزیکی پێکهاتووی لە حەوت هەزار کەسی بە سەرکردایەتی شاه ئیسماعیل بۆوە، لەدەوروبەری نەخچەوان لەشوێنیك بەناوی (شوورو) کەتیایدا سوپای میرزا ئەلوەند بەسەختی تێکشکاو ئەمەش بووە هۆکاریك کە ئازەربایجان بکەوێتە ژێر کۆنترۆلی شاه ئیسماعیل ، دواتر بەرەو تەوریزی پایتەختی ئاق قوینلی لەشکرکێشی کرد و پێشوازی شایستەی لیکرا لەلایەن خەلکی شارەکە، بەکۆنترۆل کردنی تەوریز لەلایەن ئیسماعیلەوە وەچەرخانیکی گەورە لەمێژووی ئێران هاتەئاراوە، کە بریتی بوو لەپاشایەتی بنەمالەی سەفەوی[٤٦].

لێرەدا بۆمان دەردەکەوێت، یەکیك لە گرنگترین فاکتەری شکست خواردنی هێزیکی خاوەن چەکی بەهێز و تەکنیکی بەرامبەری بەهێزیکی هۆزگەری وکەم ئەزمون دەگەرێتەوە زیاتر بۆ بیزار بوونی خەلك لە جەوروستەمی فەرمانرەوای ئاق قوینلی لەلایەك و خراپی باروو دۆخی ئابووری و سیاسی و کۆمەلایەتی کە هەموو ناوچەکانی ژێر دەسەلاتی ئاق قۆینلی گرتبۆوە.

دوابەدوای دانیشتنی شاه ئیسماعیل لەسەر تەختی شاهانە لە سالی ١٥٠١ز لە تەوریز هەلسا بەجێگیرکردنی پایەکانی شاهانەی لەسەر چوار بناغەی پتەو، کە برییتی بوون لەمانەی خوارەوە :

١- سیادەت : شاه ئیسماعیل بەگویرەی شەجەرەیەك کە یەکێك لە باپیرانی سازی کردبوو خۆی بە نەوەی ئیمام عەلی دادەنا .

٢- تەریقەت : شاه ئیسماعیل خۆی بە رێبەری تەواوی (مرشدی کامل) تەریقەتی سەفەوی دادەنا و لە راستیشدا نەوەی شیخ سەفیەدینی ئەردەبیلی دامەزرێنەری ئەم تەریقەتە بوون[٤٧].

٣- تەشەییوع : شاه ئیسماعیل لەیەکەم ڕۆژی ڕاگەیاندنی شاهانەی خۆیەوە مەزهەبی شیعەی کردە مەزهەبی فەرمی دەوڵەتەکەی و لەوتاری هەینیدا ناوی دوانزە ئیمامەکە بگوترێت و نەفرەتی سێ خەلیفەکەش بکریت، هەرچەندە لەلایەن ڕاوێژکارانەوە ئامۆژگاری کرا ئەم کارانە نەکات، چونکە سێ بەشی خەڵکەکە سونە مەزهەبن وناکرێت گوتەی ناشیرین بە سێ خەلیفەکە بگوترێت لەمینبەری مزگەوتەکان، بەلام وەلامی شاه ئیسماعیل بۆ ئەم مەبەستە بریتی بوو لەوەی ئەو ڕاسپاردراوە بۆ ئەم کارەو خوداو ئیمامەکان لە گەلیدان و لەهیچ کەسێك ناترسێت، ئەگەر هاتوو لە ناو خەڵکدا وشەی نارەزایی هەبێت،ئەوشمشێرەکەم لە کالان دەردەکەم و نایەلم یەکێکیان بە زیندوویی بمێنێتەوە[٤٨].

٤- ئێرانی بوون :شاه ئیسماعیل لە هەولی ئەوە دابوو کە سەرزەمینی دێرینی ئێران لە دەوڵەتێکی یەکگرتوودا یەك بخات و فەرهەنگی ئێرانی زیندوو بکاتەوە[٤٩].

لێرەدا دەکرێت بلێین سەرزەمینی ئێران بەرێژەیەکی بەرز سونە مەزهەب بوونە ، بەلام پەیرەوکردنی سیاسەتی توندو تیژی وسەپاندنی مەزهەبی شیعەگەری بە زۆری هۆکارێك بووە بۆ چاوترسانی خەڵکی سادە،چونکە شاه ئیسماعیل زۆر دڕندانە کەوتە گیانی زانایانی سونە مەزهەب، هەر لە ڕێگای ئەم سیاسەتە توانی پێگەی دەسەلاتەکەی کە مۆرکی ئاینی مەزهەبی شیعە گەری هەبووە بیسەپێنێت.

لەلایەکی دیکە شاه ئیسماعیلی سەفەوی بۆ بەهێز کردنی پێگەی دەوڵەتەکەی پێویست بوو ناکۆکی و ڕکابەرەکانی لەناوەوەی شکست بدات، چونکە ئێران لەم سەردەمەدا دابەش ببووە سەر چەند هەرێمێك کە خاوەن

فەرمانڕەوایی تایبەتی خۆیان بوون، وەك بنەماڵەی گورگانی لەهەرات و مراد میرزا سوڵتانی ئاق قۆینلۆ لە عێراق و فارس، هەروەها حەسەن کیا فەرمانڕەوایی رەها لەناوچەکانی فیرۆزکوە و غورو(سمنان)[٥٠] و رۆژئاوای خۆراسان، عەلائەلدولە زولقەدر لە میرنشینی زیلقەدر لەنێوان سنووری عوسمانی و مەمالیکەکان ، چەندین میری تر کە فەرمانڕەوایی چەندین ناوچەیان کردووە، لە ئێران بەشێوەیەکی سەربەخۆ وەکو موراد بەگ بایندەر لەیەزد، باریل بگ برناك لە بەغدا و قازی محمد لەکاشان وسوڵتان حسین میرزا تەیموری لە بەشێك لە خۆراسان و میر زولنون لە قەندەهار و بدیعولزەمان میرزا تەیموری لە بەلخ و ئەبولفەتح بەگ بایندەری لە خۆراسان[٥١].

سەرەڕای ئەم هێزانەش چەندین هێزی دەرەکی تر کە مەترسی بوونە بۆ سەردەسەڵاتە تازەکەی شاە ئیسماعیلی سەفەوی، لەوانە لە باکوورو خورئاواوە دەوڵەتی عوسمانی سونە مەزهەب کە رووبەڕوی هێزەکانی ئەورووپا بووە لە بەلقان، لەلایەکی تر لەئاوەکانی کەنداوی عەرەب بەتایبەتی لەباشووری رۆژئاوای وڵاتەکەی دەرکەوتنی کەشتیگەلی پرتوگالی دوای دۆزینەوەی رێگای (رأس الرجاء الصالح)[٥٢] وەك هێزێك کە دەتوانێ دەست بەسەر تواناکانی کەنداو بگرێت بەتەواوەتی، هەروەها لەباکوری رۆژهەڵاتیش بوونی هۆزە ئۆزبەکیەکان بەسەرکردایەتی محمد شیبەك خان کە کۆنترۆڵی خۆراسانی کردبوو، لەگەڵ بەشێك لە باکووری رۆژهەلاتی فارس، سەرەرای بوونی هۆزە ئەفغانیەکان لەرۆژهەڵات بەتایبەتی ناوچە بیابانە سەختەکان، لەرۆژئاواشی عێراق بوو، کە مراد کوری یعقوب دوا میری ئاق قۆینلۆ رووی تێ کردبوو[٥٣].

لێرەدا شاە ئیسماعیل بۆ بەرەنگاربوونەوەی نەیارەکانی ئەوپەری دەڵرەقی و توندوتیژی ودرندایەتی بەکارهێنا، بۆ نموونە لەشەڕی شێرواندا دوای کوشتنی

فەرخ یەسار، ئێسك و پروسكی خلیل ئەڵلای باوكی فەرخ یەساری لەگۆر دەرهێناو سوتاندی، لەتەوریزیش هەمان رەفتاری دووبارە كردەوە، تەنانەت لەبەغداش ئێسقانی ئەبو حەنیفەی لەگۆر دەركرد و سەگێكی لەجێگای ناشت، هەروەها دوای بەدیل گرتنی محمد كەرهی لەگەڵ حەوت كەسی تر لەناو قەفەزێك داینان و دواتر لەمەیدانێكی گشتی ئەسفەهان سوتاندنی، سەبارەت بەمحەمەد خانی (ئۆزبەك)[٥٤]ی دوای كوژرانی ، موریدەكانی شاە ئیسماعیل گۆشتەكەیان بەكاڵی خواردو دواتر پێستی سەریان پڕ لەكا كرد بۆ سوڵتان بایەزیدیان ناردو پەلەكانیان بۆ حوكمڕانی ناوچەكان نارد[٥٥].

گرنكترین كێشە كە رووبەرووی شاە ئیسماعیل بۆتەوە بەتایبەتی گرنگیدا بەئازەرییەكان و پشت پێ بەستنیان لەلایەكی دیكەوە خۆشی هەر ئازەری بووە، بۆیە هەموو پلەو پایە گەورەكانی دەولەتەكەی دابوو بەئازەرییەكان، ئەمەش بووە هۆكارێك كە دەنگی نارەزایی لەرەگەزی فارس هەلبستێت بەرامبەر بەم رەفتارە، چونكە لە مێژووی كۆنی ئێراندا خاوەن دەسەلات بوونە وەك ئیمپراتۆریەتی ئەخمینی و ساسانی، هەربۆیەش فارسەكان حەزیان نەدەكرد خەلكێكی تر فەرمانرەویان بكات، چونكە پێیان وابوو ئازەرییەكان خێلەكین و شارستانیەت لە رەگەزی فارسیەوە بووە، هەرچەندە شاە ئیسماعیل بیری لەچارەسەركردنی ئەم كێشەیە كردەوە بەدانانی كەسێكی رەگەز فارس لە دەرباری سەفەوی، بەلام پلەوپایە بەرزەكان هەر لەدەست ئازەرییەكان بوو، بۆیە هەرزوو كێشە لە سەر پلەو پایەكان دروست بوو ، جگە لەمەش پایتەختی دەولەت لەتەورێز بوو، كە شارێكی ئازەریە ، سەبارەت بەبارودۆخی ئابووری ولات لەو سەردەم تووشی قەیرانێكی دارایی زۆر ببۆوە ، بۆیە بۆ رزگار بوون لەم قەیرانە هەستان بە سەپاندنی باجی زۆر ئەمەش كێشەكەی زیاتر قوول كردەوەو هەروەها دوای رووبەروو بونەوەی لەگەڵ دەولەتی عوسمانی لە لایەك و

ئەفغانییەکان لەلایەکی دیکەوە کێشە ناوخۆیەکان و وای لە شاە ئیسماعیل کرد کە بیر لە هاوپەیمانی بەستن لەگەڵ هێزە ئەوروپاییەکان بکات بە تایبەتی لەگەڵ پورتوگالییەکان کە دوای دۆزینەوەی (رأس الرجاء الصالح) هاتبونە کەنداوی فارسی بەڵام ئەم هاوپەیمانیەتە سەری نەگرت[٥٦].

هەروەها هاندانی ئەوروپییەکان بۆ بەرەنگار بوونەوەی شاە ئیسماعیل بەرامبەر بە دەوڵەتی عوسمانی کە ببێتە هۆکارێك بۆ لابردنی پاڵەپەستۆی عوسمانییەکان لەبەرەی رۆژئاوا وە چەندین بەرنامە هەبووە بۆ لێك نزیك بوونەوە لە هێزە ئەوروپییەکان بەلأم دووری رێگا بەربەست بووە لە بەدیهێنانی ئەم مەبەستە[٥٧].

سەرەرای ئەوانەش شاە ئیسماعیل لە هەموو لەشکرکێشیەکانیدا لە هەر چوار لای قەلمرەوەکەیدا لە ماوەی چەند سالێکی کەمدا ئیمبراتۆریەتیەکی فرەوانی دامەزراند و سنوورەکەی دەگەیشتە سنووری کۆنی ئیمپراتۆریەتی ساسانی ئەمەش بووە هەرەشەیەکی مەترسیدار لەسەر دەولەتی عوسمانی ، بۆیە فەرمانرەواکانی عوسمانی فرەوانخوازییەکانیان لە ئەوروپا راگرت و کشان بۆ رووبەرووبونەوەی دەولەتی سەفەوی لە ئاکامدا لە سالی ١٥١٤ز لە چالدێران[٥٨] توانیان شکستی سەخت بە شاە ئیسماعیل بگەیەن و شاری تەورێزیش داگیر بکەن، بەلأم ئەم شەرە دەوڵەتی تازەی سەفەوی لە ناونەبرد، بەڵکو ئەم دەوڵەتە هەر ماوەو لە ململانێ دابوو لەگەڵ دەولەتە دراوسێکانی لەلایەك و گەلە نا ئازەرییەکان لەلایەکی دیکەوە ، هەر ئەم شکستەش بوو وای لە شاە ئیسماعیل کرد تووشی گۆشە گیری ببێت و لە ئاکامدا لە تەمەنی گەنجی سەری نایەوە لە سالی ١٥٢٤ز ، بەلام دوژمنایەتی قوڵی بە میرات بۆ جێنشینەکانی لە دوای خۆی جێهێشت[٥٩].

تەوەرەی سێیەم

## (( شاه ئیسماعیلی سەفەوی و جەنگی چالدێران ))

دەوڵەتی عوسمانی بە سەرکردایەتی سولتان (مەحەمەد فاتح)[٦٠] بە درێژایی سەدەی پانزدەهەم سەرقاڵی داگیر کردنی ئەوروپای کریستیانی بوو ، تا رادەیەك عوسمانییەکان توانیان زۆربەی ناوچەکانی رۆژهەلاتی ئەوروپا بخەنە ژێر رکێفی خۆیان ، ئەوکات ئیمپراتۆریەتی عوسمانی لەوپەری بەهێزی هەژمار دەکرا لە رووی سیاسی و سەربازی بە شێوەیەك کە بە بەهێزتین دەولەتی سەدەی پانزدەهەم ئەژمار دەکرا[٦١] .

لە دوای مردنی مەحەمەدی فاتح ، (بایەزیدی دووەم)[٦٢] دەسەلاتی دەولەتی عوسمانی دەکەوێتە ژێر دەستی ، هەروەك باوکی لە فرەوانخوازییەکانی لە ئەوروپا بەردەوام بوو ، بەلام لە کۆتاییەکانی حوکمرانیدا، بارودۆخی ولات بەرەو ئالۆزی و گرژی رۆیشت ، بە تایبەتی کێشەی مندالەکانی بایەزید لە سەر دەسەلات ، کەنەیتوانی وەکو پێویست چارەسەری کێشەکان بکات[٦٣] .

لەلایەکی دیکەوە ماوەی حوکمرانی بایەزید ەو پەیوەندیەکانی لەگەڵ شاه ئیسماعیل سەفەوی بە شێوەیەکی گشتی باش بووە ، بەلام دوای ئەوەی شاه ئیسماعیل هەلسا بە پەیرەوکردنی سیاسەتی توندوتیژی بەرامبەر بە سوننە مەزهەبەکان ، تاکە هەلوێستی تەنها ئاگادارکردنەوەی کە مامەلەی باش بکات .

شاه ئیسماعیلی سەفەوی ( ١٤٨٥ — ١٥٢٤ ز ) لە دوای ئەوەی دەولەتێکی شیعە مەزهەب لە ژێر ناوی دەولەتی سەفەوی لە سالی ١٥٠١ز دامەزراند، سەرهەلدانی ئەم دەولەتە تازەیە ئاگری شەری لە ناوموسلمان هەلگیرساند، ئاگرێك کە بە درێژایی چوار سەدە هەردوو دەولەتی عوسمانی و سەفەوی

داگرتەوە ، چونکە پەرەسەندنی مەزهەبی شیعەگەرایی لە ئێران و ئەنادۆل بووە هۆکارێك کە ( سولتان سەلیم)[٦٤] ی عوسمانی کە سوننە مەزهەبێکی دمار گرژ بوو، داوای خەلافەتی جیهانی ئیسلامی دەکرد ، نارەحەت بکات ، لەبەر ئەوە هەلسا بە پەیرەوکردنی سیاسەتێکی توندو تیژ بەرامبەر بە شیعە مەزهەبانی ئەنادۆل و کە لە هێرشێکدا نزیکەی چل هەزار کەسی لێکوشتوون[٦٥] .

شاە ئیسماعیل دوای دەست بەسەردا گرتنی تەورێز لە سالی ١٥٠١ز هاتە سەر تەختی شاەیەتی و بریاریدا بە سەپاندنی مەزهەبی شیعە وەك مەزهەبی رەسمی ولات ، بەرامبەر بەمەش بۆ سەپاندنی سیاسەتەکەی هیچ بەزەیی بەکەسدا نەدەهاتەوە زۆر بە توندی کەوتە گیانی خەلکی شارەکان و ئامادە نەبوو یەك هەنگاو پاشەکشە بکات لە بریارەکانی خۆی ، هەروەها هەولیدا پەرە بە مەزهەبی شیعە بدات لە دەرەوەی سنوورەکانی ولاتیش ، لەم رووە مەلبەندی ئەنادۆل بۆ شاە ئیسماعیل لە هەموویان گرنکتر بوو ، چونکە خەلکێکی زۆر عەلەوی بوون و لەلایەکی دیکە پەیرەوکردنی ئەو سیاسەتە زیاتر بۆ تەنگاوکردنی سولتانی عوسمانی بوو[٦٦] .

پیادەکردنی ئەو سیاسەتانە لەلایەن شاە ئیسماعیل وای لە سولتانی عوسمانی کرد چەند نامەیەکی توند ئاراستەی شاە ئیسماعیل بکات و داوای لێبکات واز لە دەسەلات بهێنێت و بگەرێتەوە بۆ ناو تەکیەکەی خۆی ئەگینا ولاتی لێ داگیر دەکات[٦٧] .

دیارە شاهی ئێران دوای دەست بەسەرداگرتنی تەورێز و نەخجەوان لە سالی ١٥٠١ز دواتریش ناوچەکانی ئەرمینیای داگیر کرد و رۆژ دوای رۆژ سنووری دەسەلاتی خۆی فرەوانتر دەکرد ، سەبارەت بە ناوچەکانی کوردستانیش لەم هێرشانە بێ بەش نەبوونە ، لەوانە هەردوو شاری دیاربەکرو وان ، هەروەها

میرنشینەکانی چمشگزك[٦٨] وئەگیل[٦٩] و پازوکی[٧٠] و پالنگان، بەلام نەیتوانی موکری و جەزیرە داگیر بکات ، هەروەها سیاسەتی توندوتیژی سەفەویەکان لە ناوچە کوردنشینەکان لە تالان و کوشتارو سەپاندنی بەزۆری مەزهەبی شیعە بەسەر خەلکەکەدا بووە هۆکارێك کە کوردەکان خۆیان دووربگرن لە ستەمی دەسەلاتدارانی سەفەوی[٧١] .

لەلایەکی دیکەوە شاە ئیسماعیل سەفەوی لە سالی ١٥٠٥ز هێرشی کردە سەر (سارم کوری سەیفەدین) فەرمانرەوای ناوچەی موکری و و لە هەمان سالدا ، سی و چوار میرو بەگی کورد بە نیازی دەربرینی وەفاداری چوون بۆ تەورێز ، بەلام بەبێ هیچ بیانوویەك فەرمانی کوت و بەندیان درا لەلایەن شاە ئیسماعیل و خرانە بەندیخانە و دواتریش خاکی کوردستان بەسەر سەرکردە قزلباشەکان دابەشکرا ، ئەم هەل و مەرجەش بە قازانجی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی تەواو بوو، چونکە کوردەکان لە داهاتوودا دەبنە هێزێکی کاریگەر لە شەرەکانی عوسمانی و سەفەوی[٧٢] .

سولتان سەلیمی یەکەم بە چاکی بارودۆخی خراپ و نالەباری سیاسەتی شاە ئیسماعیل سەفەوی دژ بو کوردەکان قۆزستەوە و هەستا بە ناردنی (مەلا ئیدریسی بەدلیسی)[٧٣] بۆ ناوچەکانی کوردستان ، بە مەبەستی راکێشانی میرانی کورد بەلای سولتانی عوسمانی ، مەلا ئیدریسی بەدلیسی خاوەن دەسەلات ورێزیکی تایبەت بوو لە ناو کورداندا ، بە گوێرەی شەرەف نامە لەو سەردەمەدا پتر لە بیست میری کورد بە هۆی کاریگەری ئیدریس بەدلیسیەوە نامەیان بۆ سولتان سەلیم ناردو ئامادەیی و پشتگیری تەواوی خۆیان بۆ سولتان سەلیم راگەیاند دژ بە دەولەتی سەفەوی ، لە بەرانبەریشدا سولتانی عوسمانی بەلێن و گفتی پارەو پول و پلەو پایەی پێبەخشین[٧٤] .

دوای جەنگی چالدێران مەلا ئیدریس بەدلیسی وەك نوێنەری رەسمی سولتان سەلیم ناسرا لە ناوچە کوردیەکاندا ، توانی لەگەڵ میرە کوردیەکان پەیمانێك ببەستێ کە بە پیمانی ١٥١٤ز دەناسرێت لە مێژوودا[٧٥] .

سەبارەت بە بەندەکانی ئەو پەیماننامەیە ، مانەوەی میرنشینە کوردییەکان و پارێزگاریکردن لە سەر ئازادی و سەربەخۆییان و دانپێدانانی دەولەتی عوسمانی بە مافی میرەکان لە فەرمانرەوایکردنی پشتاوپشت لە میرنیشینەکانیان و هەروەها پێوستە لەسەر میرانی کورد یارمەتی دەولەتی عوسمانی بدەن لە جەنگەکانی لە کاتی پێویستدا و لەبەرامبەریشدا دەولەتی عوسمانی هاوکاری کوردەکان دەکات لە هەر رووداو مەترسیەکی دەرەوە، لەگەڵ ئەوەشدا میرنیشینەکان و میرە کوردییەکان وەك بەشێك لە دەولەتی عوسمانی پێویستە باجی سالانە بدەن بە دەولەت[٧٦] .

بە شێوەیەکی گشتی فرەوانخوازیەکانی دەولەتی سەفەوی و هەولدانیان بۆ بلاوکردنەوەی مەزهەبی شیعە لە ناوچەکانی ژێر دەسەلاتی عوسمانی ، بووە هۆکارێك کە سولتانی سلیمی یەکەم واز لە فرەوانخوازیەکانی لە بەرەی رۆژئاوا بێنێت و سنوورێك بۆ فرەوانخوازییەکانی سەفەوی لە رۆژهەلات دابنێت ، کە ورده ورده دەبووە ئاستەنگ لە بەردەم دەولەتی عوسمانی ، سەرەتا توانی سوود وەربگرێت لە فەتوایەکی (شەیخولئیسلام)[٧٧] بۆ جیهاد کردن دژ بە دەولەتی سەفەوی کە وەك ئەرکێکی ئاینی هەژمار کرا ، دواتریش ململانێی عوسمانی – سەفەوی پێی نایە قۆناغی دەستپێکردنی یەکەمین جەنگ لە نێوانیادا لە سالی ١٥١٤ز کە ناسراوە بە جەنگی چالدێران[٧٨] .

بەر لە باسکردنی رەوت و رووداو پەرەسەندنەکانی جەنگی چالدێران ، پێویسنە هۆکارو پالنەرەکانی جەنگەکە روون بکرێتەوە لە نێوان هەردوو ولاتدا ،

کە خۆی لە چەندین هۆکاری جۆراوجۆردا دەبینێتەوە ، بە گوێرەی ئاماژە کردنی زۆربەی هەرە زۆری مێژوونوسان هۆکارەکەی دەگەڕێنەوە بۆ هۆکاری مەزهەبی ، بە تایبەتی سیاسەتەکانی شاە ئیسماعیل وهەولدانی بۆ بلاوکردنەوەی مەزهەبی شیعە لە ناوچەکە و دروستکردنی کوشتارگەیەك بۆ سوننە مەزهەبەکان لە بەغدا[79] .

لەلایەکی دیکەوە پالنەری دیکە بۆ هەلگیرساندنی جەنگی چالدێران ، دورست بوونی مەترسی لە ناوچوونی شوێنە پیرۆزەکان ( مەککە و مەدینە )[80] و هەروەها لایەنی ستراتیژی ناوچەکانی رۆژهەلاتی ئیسلامی لە رووی ئابووری و سیاسی و سەربازی کە رۆژ دوای رۆژ دەکەوتنە ژێر قەلمرەوی دەولەتی سەفەوی[81] .

هەندێك سەرچاوەی مێژوویی ئاماژە بە بابەتی کێشەی شەخسی دەکەن لە نێوان سولتان سەلیم و شاە ئیسماعیل ، کە رق و کینەی لە مێژینەیان بەرامبەر بە یەکتر ، هەروەها ئالوگۆرکردنی نامەکانی هەردوولا بەر لە هەلگیرساندنی جەنگەکە کە پر بوو لە هەرەشەو قسەی نابەجێ رێگا خۆشکەر بوو بۆ قولکردنەوەی ململانێی و ناکۆکیەکان[82] .

هەروەها پەیوەندیەکانی نێوان دەولەتی سەفەوی و مەمالیکەکان لە شام و میسر ، بەردەوام مەترسیان لەسەر دەولەتی عوسمانی دروست دەکرد ، بە تایبەتی دەربارەی مەمالیکەکان وەك پەناگەیەك بوو بۆ هەموو ئەو کەسانەی کە لە دەسەلاتی عوسمانی یاخی دەبوون و سەرەرای دەرکەوتنی پورتوگالیەکان لە کەنداوی فارس زال بونیان بەسەر ناوچەکە[83] .

سەبارەت بە رەوت و پەرەسەندنەکانی نێوان عوسمانی و سەفەوی ، لە ٢٣ی ئابی سالی ١٥١٤ز سولتان سەلیم بەرەو چالدێران ئاراستەی گرتەبەر

بەمەبەستی رووبەروو بوونەوەی سوپای سەفەوی ، هەرچەندە شاە ئیسماعیل هەولی زۆریدا بۆ راکێشانی ڤینیسیا و ئەوروپا بۆ ناو شەڕەکە بەلام هەولەکانی بێهوودە بوو ، چونکە ڤینیسیا لە شەڕێکی دۆڕاو بەرامبەر بە عوسمانییەکان هاتبووە دەرەوە ، کە ئاکامەکەی روخانی ژێرخانی ئابووری ڤینیسیای لێکەوتبۆوە ، لەلایەکی دیکەوە ئەوروپاییەکان بە هۆی سەرقال بوونیان بە کێشەی ناوخۆییەوە نەیانتوانی هیچ یارمەتییەك پێشکەش بکەن[٨٤] .

بەر لە هەلگیرساندنی جەنگەکە شاە ئیسماعیل سەفەوی دوو فەرماندەی بە هێزی هەلبژارد بۆ ئەنجامدانی کردە سەربازییەکان بەناوی ( مەحەمەد خان ئۆستاجلۆ)[٨٥] و (نور عەلی خەلیفە)[٨٦] هۆکاری دەستنیشانکردنی ئەو دوو کەسە دەگەڕێتەوە بۆ ئاگاداربوونی تەواویان لەسەر شێوازەکانی جەنگی عوسمانی هەبووە ، بەلام زۆری سوپای عوسمانی لە رووی ژمارەوەو پێشکەوتوویی پێداویستیەکانی جەنگی لە تۆپخانەوەو چەکی بەهێز ، لە بەرامبەر چەکە کۆنەکانی سەفەوی ، بوونە هۆکار بۆ شکست خواردنی سوپای سەفەوی و بریندار بوونی شاە ئیسماعیل و سەرکەوتنی یەکجارەکی لەم شەڕەدا لە ٢٨ی ئابی ١٥١٤ز[٨٧] .

لەم جەنگەدا مەحەمەد خان ئۆستاجلۆ فەرماندەی سوپای سەفەوی بە کوژراوی تەرمی لە مەیدانی جەنگ کەوتبوو ، هەروەها یەکێك لە ژنەکانی شاە ئیسماعیل بە ناوی تاجلی خانم بەدیل گیرا ، سولتانی عوسمانی وەك تۆلە سەندنەوەیەك لە شاە ئیسماعیل ژنەکەی لە یەکێك لە نووسەرەکانی مارەکرد، سوپای عوسمانی روویکردە تەورێز و دەستی بەسەر گەنجینەی شاە ئیسماعیلدا گرت و رەوانەی ئیستانبولی کرد[٨٨] .

جەنگی چالدێران چەندین دەرئەنجامی لەسەر هەردوو دەولەت دروستکرد ، سەبارەت بە دەولەتی سەفەوی و شاه ئیسماعیل بەر لە جەنگی چالدێران ، لە جەنگەکانی هیچ شکستێکی نەخوارد بوو ، بەلکو ئەم شکستە کاریگەریەکی یەکجار خراپی دروست کرد لەسەر دەولەتی سەفەوی بە شێوەیەکی گشتی و خودی شاه ئیسماعیل بە تایبەتی[٨٩] .

لەلایەکی دیکەوە سولتان سەلیم چل کەسی شارەزا و بازرگان و هونەرمەند و دەست رەنگینی لە تەوریزەوە گواستەوە بۆ ئیستانبوڵ[٩٠] .

سەبارەت بە ئێرانیەکانیش جەنگی چالدێران سەرەرای شکست خواردنیان لە جەنگەکە بەلام دوو گرنگی زۆری هەبووە بۆیان لە داهاتوودا :

١. سوپای ئێران تێگەیشتن لەوەی کە سوپای (یەنی چەری)[٩١] ئەو سوپایە نیە کە لە سەرووی هەموو شتێك بن ، چونکە تا ئەوکاتیش لە رۆژئاوا بەبیستنی ئەو ناوە خەلکی تووشی لەرزین دەبوون .

٢. لە دوای ئەم جەنگە سولتانەکانی عوسمانی لە دوای سولتان سەلیم حیسابێکی تایبەتیان بۆ ئێران کرد[٩٢] .

دەکرێت بلێن جەنگی چالدێران ، جەنگێکی یەکلاکەرەوە نەبوو ، چونکە دوای گەرانەوەی سولتان سەلیم دووبارە شاه ئیسماعیل هەلسایەوە بە رێکخستنی سوپاو هەرەشەی دروست کرد لەسەر تخوبەکانی دەولەتی عوسمانی ، لەلایەکی دیکەوە سەرکەوتنی عوسمانییەکان لەم جەنگە سەرەرای بە هێزبوونی سوپای عوسمانی بەلام رۆلی کورد لە بەشداریکردن شان بەشانی عوسمانیەکان هاوکێشەی جەنگەکەی بە قازانجی عوسمانی تەواو کرد ، هەرچەندە دەرئەنجامی ئەو جەنگە بووە هۆی دابەش بوونی کوردستان لە نێوان هەردوو دەولەت ، ئەمەش نەبووە مایەی سەرفرازی و بەدیهێنانی هێمنی و

ئاسایش بۆ کورد ، بەلکو بە پێچەوانەوە لە ماوەی ئـەم سـێ سـەد سـاڵەی دوای جەنگی چالدێران کوردستان بووە گۆڕەپان و مەیدانی شـەڕی نەپسـاوەی نێـوان ئەم دوو وڵاتەدا ، کە لـە کۆتایـدا دەبێتـە هـۆی لـێکترازان و ڕوخـانی میرنیـشینە سەربەخۆکان و دواتر بەستنەوەیان بە دەسەڵاتی ناوەندی .

١ ) تەریقەت لە ووشەی ( الطریق ، الطریقة ) لەسەر شێوازی ( سنن و سنە و حجە و محجە) لەزمانی عەرەبیدا هاتووە بەواتای ئادابی زیکرکردن لەپێناو بیروباوەری خودا، کە ڕێبازی سۆفیەکانە ، بەگوێرەی ئەرکەکانی (خۆبرسیکردن ، گۆشەگیری و زیکرکردن و کەم دواندن ) هەروەها سۆفی خۆی بە شێخەوە دەبەستێتەوە، بەم جۆرە هەموو جەستەی سۆفی لەلایەن شێخەوە بەرێوەدەبردرێ، لەلایەکی دیکەوە شێخەکان زۆرجاران بە هەزاران سۆفیان هەبووە . بۆزیاتر زانیاری بڕوانە : عبدالوهاب الشعرانی ، الانوار القدسیة فی معرفة قواعد الصوفیة ، بیروت ، ١٩٦٢م ، ص ٥٦

٢ ) حسن کریم جاف ، موسوعە تاریخ ایران السیاسی ، ط٢ ، المجلد الثالث ، الدار العربیة للموسوعات ، بیروت ، ٢٠٠٨ ، ص١٥ " عبدالحسین زرین کوب ، روزگاران تاریخ ایران از اغاز تا سقوط سلطنت پهلوی ، چ٥ ، انتشارات سخن ، تهران ، ١٣٨٣ شمسی ، ص ٦٤٢

٣) امیر محمود خواندامیر ، تاریخ شاه اسماعیل و شاه طهماسب صفوی ، تصحیح و تحشیه : محمد علی جراحی ، چ١ ، نشر گسترده ، تهران ، ١٣٧٥ شمسی ، ص ١٠ " حسن کریم جاف ، الوجیز فی تأریخ ایران ، ط٢ ، ج٣ ، مطبعة مؤسسة ئاراس ، اربیل ، ٢٠٠٨ ، ص١٤

٤ ) عبدالعزیز سلیمان نوار ، تاریخ الشعوب الاسلامیة ، ج١ ، دار النهضە العربیە ، بیروت ، ١٩٧١ م ، ص ٢٢

٥) حسن کریم جاف ،الوجیز فی... ، ص١٥

٦ ) لە دوای کوژرانی ئەمیر حوسەین ، گەورەکانی ئۆلۆس و جەغتای و پشت ڕووبار ( ما وراء النهر ) لە دەوەرەی تەیموور کۆبونەوەو بە ڕێکەوتن وەك گەورەی خۆیان لە ساڵی ٧٧١ کە تەمەنی ٣٤ ساڵ دەبوو دەست نیشان کرد، و لەقەبی ساحێبقەرانیان پێدا ، دوای وەرگرتنی دەسەلات ، پایتەختی گواستەوە سەمەرقەندو دەستی گرت بەسەر خەزێنەی چەندین ساڵەی میر حوسەین و دابەشی کردە سەر سەرکردەکانی ، لە سەرەتاکانی فەرمانرەوایدا زۆر بە توندی کەوتە گیان نەیارەکانی و بە پێچەوانە زۆر نەرم و نیان بوو لەگەڵ هەواداران و لایەنگرانی ، بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە : حسین میر جعفری ، تاریخ تحولات سیاسی اجتماعی اقتصادیو فرهنگی ایران در دورە تیموریان و ترکمانان، چ٥ ،انتشارات دانشگاه اصفهان ، سازمان مطالعە وتدوین سمت، تهران ، ١٣٨٥شمسی، ص ٢١

٧ ) هۆکاری سەرهەلدانی ئەوجەنگە دەگەرێتەوە بۆ رادەستنەکردنەوەی ئەحمەد جەلایری میری عێراق لەلایەن سولتان بایەزیدی یەکەم ، کە تەیمورلەنگ داوای لێکردبوو بە رادەستکردنەوەی ئەمەش وای لەتەیمورلنگ کرد بە هێزێکی زەبەلاحەوە هێرش بکاتە سەر ئاسیای بچووك و

دەست بگرێت بەسەر سیواس ئۆرتەغول کوری بایەزید بەدیل بگرێت، دوای سەربرینی ڕەوانەی کردەوە بۆسولتان بایەزید ، ئەمەش هۆکارێك بوو کە سولتان بایەزید سوپاکەی کۆبکاتەوە دژ بە تەیمورلەنگ لە دەشتی ئەنقرە لەسالی ١٤٠٢ز، لەئەنجامدا ڕووبەڕووی یەکتر بوونەوە بەلام زۆر لە سەربازانی عوسمانی کە لە میرنشینەکانی ( مەنتشا ، ئایدین ، صاروخان ، کرمیان ) بوون خۆیان دایە پال هێزی تەیمورلەنگ چونکە سەرکردەکانیان لە هێزی تەیمورلەنگدا بوون بەمەش هاوکێشەی شەرەکە گۆرانکاری بەسەردا هات و بایەزید شکستی خواردو کەوتە دەست تەیمورلەنگ ، هەرچەندە بایەزید لەسەرەتادا مامەلەی باشی لەلایەن تەیمەلەنگەوە لەگەلْ کراوە بەلام دواتر کە سێ جار هەولی راکردنی داوە بۆیە زیندانی کرا لە ناو قەفەزێکی ئاسنی تاکو مردنی لەسالی ١٤٠٣ز . بۆ زایاتر زانیاری بروانە : محمد فرید بگ المحامی ، تاریخ الدولة العلية العثمانية ، تحقيق : احسان حقی ،ط١٠ ، دارالنفائس ، بیروت ، ٢٠٠٦ ، ص ١٤٦-١٤٧

[٨]) عبدالعزیز سلیمان نوار ، المصدر السابق ، ص ٢٢

[٩]) قزلباش بە مانای کلاو سوور دێت ئەمانە چەند هۆزێکی تورکی شیعە مەزهەب بوون کە لە ناوچەکانی قەوقاز و کەنارەکانی باشووری دەیارەی خەزەر رۆژئاوای خۆراسان نیشتەجێ بوون و بە حەوت هۆزەکە ناسراون کە ئەمانەن( ئۆستاجلو ، شاملو ، تەکالو ، بەهارلو، زولقەدر، قاجار، ئەفشار ) ئەمانە دواتر بوونە کۆلگەی بنیادنانی دەولەتی سەفەوی لەکاتی شاە ئیسماعیل . بۆ زانیاری زیاتر بروانە : عبدالعزیز سلیمان نوار ، ص ٢٤-٢٥

[١٠]) نەوشیروان مستەفا ئەمین ، کوردو عەجەم ، چ٣ ، چاپخانەی ڕوون ، سلێمانی ، ٢٠٠٧ ، ل١٤

[١١]) عبدالحسین زرین کوب ، منبع سابق ، ص ٦٥٨ – ٦٥٩

[١٢]) زاراوەی تورکیە بە واتای ( مەڕی ڕەش ) بەلام تاکو ئێستا لەنێوان مێژوونوسان راڤەی جیاوازی بۆ دەکرێت ، هەندێك پێیانوایە سەرەتای ئەو ناوە دەگەڕێنەوە بۆ بەخێوکردنی مەڕی ڕەش ، هەندێکی دیکە پێیانوایە ئەو ناوە زیاتر لەوە هاتووە چونکە ئالاکەیان وێنەی مەڕی ڕەشی لەسەر نەخشێندراوە ، هەندیك بۆچوونی دیکە هەیە کە وشەی قەرە بە زمانی کۆنی ئازەربایجان بە واتای گەورە هاتووە وەك سەرکردەکانیان قەرە مەحەمەد و قەرە یوسف سەبارەت بە بنەچەشیان زانیاری کەم هەیە ، تەنها ئەوە نەبێت کە مێژوونوسێکی عوسمانی لە سەدەی پانزە بە ناوی مەولانا شوکوروللا دەلێت(( قەرەقۆینلوەکان دەگەڕێنەوە بۆ کەسێك بەناوی دەنیزخان بەلگەش بۆ ئەمە دەهێنێتەوە کە لە خودی جیهانشاە فەرمانرەوای

قەرەقۆینلو گوێی لێبووە ؛ قەرەقۆینلوەکان چەندین ناوی تریان هەبووە وەك باران ، بارانلو، بارانلی ، بۆ ئەم مەبەستەش مینۆرسکی تێروانینێکی هەیە دەڵێت (( بارانی ناوی هۆز نیە بەلکو ناوی ناوچەیە ، هەربۆیەش هەندێك لە مێژوونوسان لەو باوەڕەدان گەورەی قەرەقۆینلو فەرمانڕەوای ئەو ناوچەیە بووە یاخود هەر لەوێ لەدایك بووبێت .بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە : حسین میر جعفری، ص٢٢٦-٢٢٧

[١٣] ) مؤلف ناشناخته ، عالم ارای شاه اسماعیل ،با مقدمه و تصحیح و تعلیق : اصغر منتظر صاحب ، چ٢ ،انتشارات علمی فرهنگی ، تهران ،١٣٨٤ شمسی، ص٢٤

[١٤] ) یەکێك لە کورەکانی قەرە یوسف و کۆتا فەرمانڕەوایی قەرەقۆینلو بووە ، سەرەتا ناوی ماردین شاە بوو ، بەلام لەسەر راسپاردەی باوکی ناوی گۆراوە بۆ جیهانشاه ، چونکە لەو ناوچەیە وا باوبووە کە کچەکانیان بەم ناوە لێبنرێت ، لە ماوەی فەرمانڕەوای خۆشیدا دووجار لە سالانی ٨٤٤ ، ٨٤٧ هێرشی کردۆتە سەر گورجستان ، دواتریش لەبەرامبەر ئۆزۆن حەسەنی فەرمانڕەوای ئاق قۆینلو دەکوژرێت و کۆتایی بە دەسەلاتی قەرەقۆینلو هات .

[١٥] )والتر هینتس ، تشکیل دولت ملی ایران ، ترجمه : کیکاووس جهانداری ، چ٣ ، انتشاراتی خوارزمی ، تهران ، ١٣٦٢ شمسی ، ص ١٨

[١٦] ) سولتان زاهیر جقمق ( ١٤٣٨ – ١٤٥٣ز ) سولتانی مەملوکی ، لەسەردەمی فەرمانڕەوایی ئەو سولتانە کە هاوکات بووە لەگەڵ سولتان موورادی دووەمی عوسمانی پەیوەندیەکی بەهێزیان لەگەڵ یەکتردا بووە، بەشێوەیەك لەکاتی هاتنە سەردەسەلاتی ( جقمق ) سولتانی عوسمانی پیرۆزبای هاتنە سەردەسەلاتی لێکردووە، تەنانەت چەندین نامەو دیاری لە نێوانیان ئالوگۆر کراوە . بڕوانە : صلاح احمد هریدی ،دراسات في تاريخ العرب الحديث ،عين للدراسات والبحوث الانسانية الاجتماعية ، اسكندرية ، ٢٠٠٨م ، ص ١٣٢ – ١٣٣

[١٧] ) کارل بروکلمان ، تاريخ الشعوب الاسلاميه ، ترجمه : نبيه امين فارس ، منير البعلبكي ، الدار العلم للملاين ، بيروت ، ٢٠٠٥ م ، ص٤٩٤

[١٨] ) ناوێکی لێکدراوە لەسێ بەش پێکهاتووە ، ( ئاق ) بەواتای سپی دێت ، ( قۆین ، قۆیون) بەواتای مەر دێت ، هەمووی بەسەر یەکەوە واتای مەری سپی دەگەیەنێ ، لەگەڵ داگیرکردنی ئەنادۆل لەلایەن مەغۆلەکان ، ئەوانیش لەرۆژهەلاتی ئەو ناوچەیە نیشتەجێ بوون ؛ دواتر لەگەڵ لاوازی مەغۆلەکان لە ئاسیای بچووك لە سەدەی هەشتەم بە شێوەیەکی چالاك هاتنە ناو گۆڕەپانی سیاسی و دەسەلاتێکیان بۆخۆیان دامەزراند، کە پەیوەندیان لەگەڵ عوسمانیەکان

باش نەبووە . زیاتر زانیار بروانە : مالکولم ، تاریخ ایران ، ج۱ ،ترجمە : اسماعیل حیرت، کتابفروشی سعدی ، تهران ، بدون تاریخ ، ص۱٦۱ " حسین میر جعفری ، ص ۲۷۹

[۱۹]) حسن روملو ، احسن التواریخ ، ص ۹۰

[۲۰]) ویلایەتێکە سەر بە هەرێمی ئازەربایجان دەکەوێتە باکووری ڕووباری ئاراس لەرۆژئاوای دەریای خەزەر.

[۲۱]) نەتەوەیەکی کریستانین لە ناوچەی رۆژهەتی دەریای رەش کە هاوسێی گورجستان و رۆژئاوای داغستانە، بەشێوەیەکی بەردەوام هێرشکراوەتە سەر ئەو نەتەوەیە، چونکە کچ و کوری ئەم نەتەوەیە زۆر جوان بوونە لەبازارەکانی فرۆشتنی کۆیلە نرخێکی زۆر گرانبەهایان هەبووە . بروانە : امیر حسین خنجی ، نقش قزلباشان صفوی درتاریخ ایران ، ص ٤٦

[۲۲]) حسین میر جعفری ، منبع پیشین ، ص۲۹۰-۲۹۱ " نەوشیروان مستەفا ئەمین ، سەرچاوەی پێشوو ، ل ١٤ – ١٥ " عبدالعزیز سلیمان نوار ، المصدر السابق ، ص ۲۳

[۲۳]) والتر هینتس ، منبع پیشین ، ص ٥٣ – ٥٤

[۲٤]) ئەبو سەعید دوا سولتانی تەیموریە ، ئەوکات لە خوراسان بوو، پایتەختەکەی لە هرات و ئەویش خۆی بە پادشای ئێران دەزانی بەلام لە ڕووبەڕووبونەوەکانی لەگەڵ ئوزۆن حەسەن لە دەشتی مغان بەدیل دەگیرێت و دواتر دەکوژرێت .بروانە: امیر حسین خنجی، ص٤٨

[۲٥]) خورشاه بن قباد الحسینی، تاریخ ایلچی نظام شاه، چ۱ ، تصحیح و تحشیه و توضیح و اضافات : محمد رضا نصیری ، گولیچی هانەدا ،انجمن اثار و مفاخر فرهنگی ،تهران ، ۱۳۷۹شمسی ، ص۲ – ۳ " میشل م . مزاوی ، پیدایش دولت صفوی ،چ۲، ترجمە : یعقوب اژند ، نشر گسترده، تهران، ۱۳۸۸شمسی ، ص ٤٧-٤٨

[۲٦]) هاشم حجازی فەر ، شا ئیسماعیلی یەکەم و جەنگی چالدێران ، ل ٤٢

[۲۷]) دەکەوێتە هەرێمی ئازەربایجانی ئێرانی ، باشووری رۆژئاوای دەریای قەزوین

[۲۸]) والتر هینتس ، منبع پیشین ، ص ۹۰

[۲۹]) کارل بروکلمان ، المصدر السابق ، ص ٤۹٥

[۳۰]) حسین میر جعفری ، منبع پیشین ، ص ۳۱٦ " خورشاه بن قباد الحسینی، ماخذ پیشین، ص۳-٤ " ادوارد براون ، تاریخ الادب فی ایران ، ترجمە : محمد علاوالدین منصور ، ج٤ ، ط۱ ، مجلس الاعلی للثقافە ، القاهرە ، ۲۰۰۲ ، ص٥۳ " کارل بروکلمان ، المصدر نفسە ، ص ٤۹٥

[31]) بەناوبانگترین شارە لە هەرێمی ئازەربایجان و مەلبەندی هەرێمەکەیە و شارێکی جوان و ئاوەدان و دلگیرەو خاوەن شورەی بەتینە .بروانە: معجم البلدان ، یاقوت الحموی ، ج٢ ، ص ١٣

[32]) هاشم حجازی فەر ، هەمان سەرچاوە ، ل٤٥ " عبدالحسین زرین کوب ، همان منبع ، ص٦٦٢

[33]) نەوشیروان مستەفا ئەمین ، هەمان سەرچاوە ، ل ١٥

[34]) حسن کریم جاف ، الوجیز فی ... ، ص١٦

[35]) نەوشیروان مستەفا ئەمین ، سەرچاوەی پێشوو ، ل ١٥ " کارل بروکلمان ، المصدر السابق ، ص ٤٩٦

[36]) هاشم حجازی فەر ، سەرچاوەی پێشوو ، ل ١٧

[37]) ادوارد براون ، المصدر السابق ، ص ٥٥ " کارل بروکلمان ، المصدر نفسه ، ص٤٩٦

[38]) فاروق سومر ، نقش ترکان اناطولی در تشکیل و توسعه دولت صفوی ، چ١ ،ترجمه : احسان اشراقی ، محمد تقی امامی ، نشر گسترده ، تهران ، ١٣٧١شمسی ، ص٢٤

٣٩) پێیانوایە تەنها دوانزە ئیمامی پارێزراو ( معصوم ) مەرجی ئەوەیان تێدایە کە ببنە پێشەوای موسلمانان ، ئەوانیش عەلی کوری ئەبو تالیب ، حەسەن کوری عەلی ، حوسێن کوری عەلی ، عەلی زەینەلعابدین کوری حوسێن ، مەحەمەد باقر کوری عەلی ، جەعفەر سادق کوری مەحەمەد ، موسا کازم کوری جەعفەر ، عەلی رەزا کوری موسا ، مەحەمەد جەواد کوری عەلی ، عەلی هادی کوری مەحەمەد ، حەسەن عەسکەری کوری عەلی ، مەحەمەد مەهدی کوری حەسەن . بۆ پتر زانیاری بروانە : عبدالقادر صالح ، العقائد والادیان ، دارالمعرفه ، بیروت ، ٢٠٠٦م ، ص ١٠

[40]) حسن کریم جاف ، الوجیز فی ... ، ص ١٨ " پژوهش در دانشگاه کمبریج ، تاریخ ایران ، ترجمه : یعقوب اژاند ، چ٢ ،فراین ، تهران ، ١٣٨٤ شمسی

[41]) عبدالعزیز سلیمان نوار ، المصدر السابق ، ص ٢٤ – ٢٥

[42]) المصدر نفسه ، ص ٢٥

[43]) هاشم حجازی فەر ، سەرچاوەی پێشوو ، ل ٦١

[44]) بایەندەر بە واتای زەوی هەمیشە بەپیت و بەرەکەت دێت.

[45]) میشیل م . مزاوی ، منبع پیشین ،ص ١٦٤-١٦٦

[46]) مؤلف ناشناخته ، ماخذ پیشین ، ص٥٨ – ٥٩

[47]) نەوشیروان مستەفا ئەمین ، سەرچاوەی پێشوو ، ل١٦

[48]) حسن كريم جاف ، الوجيز ف ... ، ص١٨

[49]) نەوشیروان مستەفا ئەمین ، هەمان سەرچاوە ، ل ١٦

[50]) شارێکە کەوتۆتە باکوری بیابانی کوێر و رۆژئاوای دامغان . بروانە : لسترنج ، سرزمينهاى خلافت شرقى، ترجمه : محمود عرفان ، تهران، ١٣٧٣ ، ص ٣٩١

[51]) حسن كريم جاف ،الوجيز ف ... ، ص١٩

[52]) (راس ئـەجولهاس)ی پـێ دەوترێـت و دەکەوێتـە ئەوپـەری بەشـی باشـووری کیـشوەری ئـەفریقیا و لەبازنـەی پـانی ( ٣٥)ی باشـوور نزیـك شـاری کیـپ تـاون ، لەسـالی ١٤٨٨ز بۆیەکەمین جار دۆزەرەوەی پرتوگالی بەناوی دیاز ناوی لێنا سەریٚ گەردەلولـەکان لەبەر بـوونی گـەردەلولی زۆر لـەو ناوچـەیەدا ، هـەروەها مـەلیکی پورتوگـالی جۆنی دووەم نـاوی لێنـا ( راس رجاء الصالح ) لەبەر خۆشیەکانی لەدۆزینەوەی رێگایەکی دەریای نوێ بۆ هیند .

[53]) عبدالعزيز سليمان نوار ، المصدر السابق ، ص٢٦ – ٢٧

[54]) ئۆزبەکەکان رەگەزیان دەگەرێتەوە بۆ ئۆزبەك خانی نۆیەمین فەرمانرەوایی بنەماڵەی جوجی و نیشتمانی کۆنیـان بەرزاییـەکانی تورانە ، لەسـەرتادا بریتـی بـوون لەکۆمـەڵێك هـۆزی کۆچـەر لەناوچەکانی بـاکووری رۆژهـەڵاتی فارس ، دواتـر محەمـەد خـان تـوانی بەشێکی زۆریـان لـەژێر فـەرمانرەوایی خـۆی لەسـالی ١٥٠٠ز یـەکبخات و خـۆی بکاتـە پادشـای سـەمەرقەند، کـە ئێـستا شارێکی ئۆزبەکستانە . بۆ زیاتر زانیاری بروانە : حسن كريم جاف ، الوجيز...، ج٣ ، ص ٦٧

[55]) نەوشیروان مستەفا ئەمین ، سەرچاوەی پێشوو ، ل ١٨

[56]) عبدالعزيز سليمان نوار ، المصدر السابق ، ص٣٣

[57]) حسن كريم جاف ،الوجيز ف .... ، ص ٢٥

[58]) دەشتی چالدێران نزیکەی هەشتا کیلۆمەتر چوارگۆشەیە ، دەکەوێتە باکووری رۆژئاوای تەورێز بە دووری بیست فەرسەخ

[59]) نەوشیروان مستەفا ئەمین ، سەرچاوەی پێشوو ، ل ١٨

[60]) مەحەمـەدی دووەم ناسـراو بـە ( فـاتح )لـە تەمـەنی نـۆزدە سـاڵیەوە لـەدوای فـەرمانرەوایی باوکی مورادی دووەم ، دەبێتـە سـولتانی عوسمـانی مـاوەی فەرمانرەواییەکەی سـی سـاڵ بـوو( ١٤٥١ – ١٤٨١ز ) کە تێدا توانی دەست بگرێـت بەسـەر قوسـتەنتینە لەسـالی ١٤٥٣ز ناوەکەشـی گۆری بۆ ئیستانبول بەواتای شاری ئاشـتی دێـت ، لەگـەڵ ئـەوەش فرەوانخوازیـەکانی رووی لـە بەلقان کردوو هەریەکە لـە سربیا و بۆسـنەو هەرسـکی خـستە ژێـر دەسـەلاتی خـۆی، لەبەرەی

ئاسیاوە لە سلی ١٤٦١ز میرنشینی تەرابزۆن و لەسالی ١٤٦٨ز میرنشینی کرمانی خستە ژێر دەستی ، هەروەها لەسالی ١٤٧٥ز هەژموونی خۆی بەسەرنیمچە دورگەی قەرم سەپاند ، چەندبن پرۆژەی دیکە لەبەردەستی دابوو بەلام بەهۆکاری مەرگیەوە لەسالی ١٤٨١ز نەتوانرا پرۆژەکانی تەواو بکات . بۆ زیاتر زانیاری بروانە : مفید الزیدي ، موسوعة التاریخ الاسلامي ، دار اسامة ، عمان ، ٢٠٠٣ ، ص ١٩ – ٢٣

[٦١] ) ژان پل رو ، ترکیە ، ترجمە : خانبابابیانی ، نشرکتاب ، تهران ، ١٣٧١شمسی ، ص ١٧٢

[٦٢] ) بایەزیدی دووەم ١٤٨١ز لەدوای مردنی مەحەمەد فاتح فەرمانرەوایی دەولەتی عوسمانی دەگرێتە دەست لەسالی کە ئەوکات تەمەنی سی و پێنج سالان بوو، دوای رکابەری وململانێی توند لەگەڵ ( جم ) ی برای لەسەر دەسەلات ،بەلام ئەنکشاریەکان ئارەزووی هاتنە سەردەسەلاتی بایەزیان دەکرد کەلەئاکامدا لەنزیك شاری ( یەنی شەهر) سوپای جم لەبەرامبەر بایەزید شکست دەخوات و رووەکاتە تخوبەکانی میسر و لەسالی ١٤٨٢ز دوبارە دەگەرێتەوە ئەنادۆل بەیارمەتی مەمالیکەکان ، شەری ناوخۆ دەست پێدەکاتەوە و جارێکی دیکە شکست دەخوات و رووەکاتە دورگەی رودس و دواتر لەسالی ١٤٩٥ز کۆچی دوایی دەکات ، لەکۆتاییەکانی سەردەمی فەرمانرەوایی بایەزید بەتایبەت بارودۆخی ناوخۆ روو لەپەشێودی دابووە، بەتایبەت یاخی بوونی کورەکانی و دواتر سەلیمی یەکەم توانی لەسەر دەسەلات لایبدات و لەسالی ١٥١٢ز کۆچی دوای دەکات هەندێك لە مێژوونوسان لەو باوەرەدان کەلەلایەن سەلیمی کوریەوە ژەهر خوارد کرابێت لەترسی گەرانەوەی بۆ دەسەلات . بروانە : ودیع ابو زیدون ، تاریخ الامبراطوریة العثمانیة من التاسیس الی السقوط ، ط١ ،الاهلیة ، عمان ، ٢٠٠٣م ، ص٦٨ – ٧٦

[٦٣] ) اسماعیل اوزون حقی چارشلی ، تاریخ عثمانی ، جلد٢ ، نشر کیهان ، تهران ، ١٣٦٩شمسی ، ص٢٠٨

[٦٤] ) سولتان سەلیمی یەکەم ( ١٤٧٠ – ١٥٢٠ ز ) دوای ئەوەی توانی لە رێگای هێزی ئینکشاری تەنازول بە بایەزید بکات بۆ جێهێشتنی دەسەلات ، لەماوەی حوکمرانیەکەیدا کە تەنها نۆ سالْ بووە توانی زال بێت بەسەر رکابەرەکانی و لە ناویان ببات، لەسەر دەسەلات بە تایبەتی براو نەوەکانیان ، و هەروەها لەسەردەمی فەرمانرەوایدا گۆرانکاریەکی ریشەیی لە فرەوانخوازییەکانی دەولەتی عوسمانی هاتە ئاراوە ، ئەویش بریتی بوو لە راگرتنی فرەوانخوازییەکانی لە بەرەی رۆژئاواو رووکردنە رۆژهەلات بە مەبەستی دانانی بەربەستێك

لەبەردەم سەفەوییەکان بۆ زانیاری زیاتر بروانە: محمد علي عامر ، الدولة العثمانية – تاريخ ووثائق ، ط١ ، دار الرحاب ، دمشق ، ٢٠٠١ م ، ص ١٤٤-١٤٦

[٦٥] ) هامر پوور گشتال ، تاريخ امبراطوری عثمانی ،ج١ ،نشر زرين ، تهران ، ١٣٦٧شمسی ، ص٨٢٣

[٦٦] ) علی شريعتی ، تشيع علوی و تشيع صفوی ، نشر ازادی ، تهران ، ١٣٦٢شمسی ، ص ٥٨

[٦٧] ) هامر پوور گشتال ، همان منبع ، ص ٨٢٣

[٦٨] ) ئەو میرنشینە دەکەوێتە باکوری مەلاتیە ، و ناوچەی دەرسیم لەژێر فەرمانرەوایی ئەو میرنشینەدا بوو ، ئێستاش ( چمشگزك ) دەکەوێتە ویلایەتی تونجلی کوردی لە تورکیا . سعدی عثمان هروتی ، كوردستان والامبراطورية العثمانية ، ص ٢١

[٦٩] ) شاروچکەیەکی بچووکە لە هەرێمی ئەرغنی سەر بەدیاربەکر کە دەکەوێتە دووری ٣٢ کم لەباکوری رۆژئاوای دیاربەکر .

[٧٠] ) ئەو میرنشینە دەکەوتە باکووری دەریاچەی وان و مەلبەندی میرنشینەکە لەشاری مەلازگرد بووە ، ئەوکات دەسەلاتی بەسەر هەموو ئەرجیش و عادجوازز لەشگرد و کیفی ، لەوماوەیەدا خاید بەگ کوری شەهسوار بەگ فەرمانرەوای دەکرد . سعدی عثمان هروتی، ص ٢١

[٧١] ) سعدی عثمان هروتی ، كوردستان والامبراطورية العثمانية ، ط١ ، مطبعة خاني ، دهۆك ، ٢٠٠٨م ، ص٣١-٣٢ " شمسی محمد ئیسکەندەر ، مێژووی کورد لە سەدەی شانزەنزەهەمدا ، وەرگێران : شوکور مستەفا ، هەولێر ، ١٩٩٨ز ، ل٧١

[٧٢] ) حوسێنی مەدەنی ، کوردستان و ستراتیژی دەولەتان ، بەرگی یەکەم ، هەولێر ، ٢٠٠٠ز ، ص٩١

[٧٣] ) لەسالی ١٤٥٢ز لەدایك بووە و لەسالی ١٤٧٨ز پەیوەندی بە سولتان یەعقوب فەرمانرەوایی ئاق قوینلو کردووە ، لەسالی ١٥٠١ز چۆتە ئیستانبول و دوای ئەوەی دەسەلاتی ئاق قوینلو بەدەستی شاە ئیسماعیل دەروخێت و لەلایەن سولتان بایەزید پێشوازێکی گەرمی لێکراوە ، دواتر لەسەردەمی سولتان سەلیمی یەکەم بەشداری جەنگی چالدێرانی کردووەو لەسالی ١٥١٧ز بەشداری شالاوی عوسمانی کردووە بۆ سەر میسر دژ بە مەمالیکەکان و لەسالی ١٥٢٠ز لە ئیستانبول دوای ماوەیەکی کەم لە مردنی سولتان سەلیم کۆچی دوایی دەکات . بۆزیاتر زانیاری بروانە : سعدی عثمان هروتی ، ص ٤٩ – ٥٢

[٧٤] ) شمسی محمد ئیسکەندەر ، سەرچاوەی پێشوو ، ل ٧٢

[75] ) محمد رسول هاوار ، کوردو باکوری کوردستان لە سەرەتای مێژووە تا شەری دووهەمی جیهان ، ب١ ، سلیمانی ، ٢٠٠٠ز ، ل ١٩٣

[76] ) سعدي عثمان هروتي ، المصدر السابق ، ص ٦٥-٦٦

[77] ) گەورەترین پایەی ئاینیە لە دەولەتی عوسمانی، چونکە سەرۆکایەتی دەزگای ئاینی دەکات لە دەولەت ، کە هێزێکی سەربەخۆیە لە دەولەت دوور لە دەسەلاتی سەدرولئەعزەم بەشێوەیەك هەریەکە لە قازی عەسکەری رۆملی و قازی عەسکری ئەنادۆل بەرپرسی حکومەتن لە پارێزگاریکردن و جێبەجێ کردنی شەریعەتی ئیسلامی . بۆ زیاتر زانیاری بروانە : خلیل اینالجیك ، تاریخ الدولة العثمانیة من النشوء الی الانحدار ، ترجمة : محمد . م . الارناؤوط ، ط١ ، دار المدار الاسلامی ، بیروت ، ٢٠٠٢م ، ص ١٥٤ – ١٥٨

[78] ) ویل دورانت ، تاریخ تمدن ،ج٦ ، نشر فرهنگی ، تهران ، ١٣٧٣ ، ص٨٠١

[79] ) سعدي عثمان ، المصدر السلبق ، ص ٣٧

[80] ) دوو شوێنی پیرۆزن سەبارەت بە جیهانی ئیسلامی و دەکەونە ولاتی عەرەبستانی سعودی .

[81] ) راجر سیوری ، ایران عصر صفوی ، ترجمه : کامبیز عزیزی ، چ١ ، نشر مرکز ، تهران ، ١٣٧٢ شمسی ، ص٤٢

[82] ) اسماعیل اوزون حقی چارشلی ، منبع پیشین ، ص ٢٨٠

[83] ) هامر پوور گشتال ، منبع پیشین ، ص ٨٢٥

[84] ) مەحەمەد سهێل تەقڤوش ، مێژووی دەولەتی سەفەوی ، وەرگێرانی : شاخەوان مەحەمەد ، چ١ ، چاپخانەی رۆژهەلات ، هەولێر ، ٢٠١٠ ز، ل ٩٨

[85] ) والی دەولەتی سەفەوی بووە لە دیاربەکر

[86] ) والی دەولەتی سەفەوی لە ئەزرنجان

[87] ) راجر سیوری ، منبع پیشین ، ص ٣٩-٤١

[88] ) تاریخ الدولة العلیة العثمانیة ، محمد فرید بیك المحامي ، تحقیق : احسان حقی ، ط١٠ ، دارالنفائس، بیروت ، ٢٠٠٦م ، ص ١٩٠

[89] ) راجر سیوری ، منبع پیشین ، ص ٤٤

[90] ) محمد فرید بیك المحامی ، المصدر السابق ، ص ١٩٠

[91] ) یەنی چەری بەواتای سوپای نوێ دێت ، بەلام ئەوروپیەکان جانیساری یاخود یانیساری پێ دەلێن ، دواتر ئەم ناوە بوو بە ئینکشاری ، کەلە نوسینی تورکی کۆنەوە بە یکی شار

هاتووە .بۆ زیاتر زانیاری دەربارەی ئینکشاری بروانە : هاملتون جیب و هارولد بوین ، المجتمع الاسلامی والغرب ، ترجمه : عبدالمجید حسیب القیسی ، ج١ ، ط١ ،دارالمدى ، دمشق ، بیروت، ١٩٩٧م ، ص ١٠٣ – ١١٥

[٩٢]) جیمزداون ، شاه اسماعیل صفوی ، ترجمه و اقتباس : ذبیح الله منصوری ، چ١٤ ، انتشارات زرین ، تهران ، ١٣٨٤شمسی ، ص٨٠٣

# ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە سەردەمی سەرۆکایەتی ( ریچارد نیکسۆن ) دا ( ١٩٦٩-١٩٧٤ )

فاروق محمد محمد ئەمین

پێشەکی

لێکۆڵینەوە لەمێژووی ئەمریکاو قۆناغەکانی گەشەکردنی گرنگی تایبەتی خۆی هەیە، ئەمریکا بە چەندین قۆناغدا تێپەڕیوەو کاریگەری لەسەر ڕوداوەکانی جیهان بەگشتیو هەردوو جەنگی جیهانی بەتایبەتی دیاو بەرچاو بووە،

لە دوای جەنگی دووەمی جیهانیەوە وەك زلهێزێكو هاتە سەر گۆڕەپانی سیاسی جیهانو بە کردەیی لە سیاسەتی دەرەوەیدا گۆشەگیری بەجێهێشتو لە بنەمای مۆنرۆ دورکەوتەوە، لە سیتەمی سیاسی دوو جەمسەری جیهاندا خاوەنداریو سەرپەرشتی جەمسەری ڕۆژئاوای دژ بە ڕۆژهەڵات دەکرد. کە کاریگەری لەسەر ئاراستەکردنی جیهانو چارەنوسی گەلان هەبوو، ك بێگومان گەلی کوردیش لەو کایگەرییە بەدەر نەبوو.

ئەمریکا لە سەردەمی سەرۆکایەتی (ریچارد نیکسۆن) جیامەند بوو بە چەند گۆڕانکاریەکی گرنگ لەسەر ئاستی ناوخۆو دەرەوەیدا، لەسەر ئاستی دەرەکی کە لەپەیوەندییەکانی نیکسۆندا ڕەنگی دەدایەوە، پەیوەنیەکانی لەگەڵ چین ئاسایی کردەوەو وەك یەکەم سەرۆکی ئەمریکا سەردانی چینی کرد، هەروەها

جەنگی سارد لەسەردەمی ئەمدا پێی نایە قۆناغێکی نوێوە کە بە قۆناغی ئارامیو ڕێکەوتن ناسراوە، سەردانی مۆسکۆی کردو بۆ یەکەمجار ڕێکەوتنی لە گەڵ سۆڤێت لە مەڕ کەمکردنەوەی موشەکی بالستیو چەکی ئەتۆمی کرد کە بە (سالت١) ناسرا.

بۆیەکەمجار لەسەردەمی ئیدارەی نیکسۆندا پەیوەندی لە نێوان ئەمریکاو گەلی کورد لە باشوری کوردستان دامەزرا، کە سەرئەنجام بە زیانی گەلی کورد تەواو بوو.

لە سەر ئاستی ناوخۆش ڕوبەڕووی قەیرانێکی گەورەی ناوخۆیی بۆوەکە بە ڕیسوایی (واتەرگێت) ناسراوە، سەر ئەنجام ناچاربوو دەست لەکار بکێشێتەوە.

ئەم توێژینەوەیەمان بەسەر چەند باسێکدا دابەشکراوە، لە بەشی یەکمدا پوختەیەك لە ژیانی نیکسۆنو بنەمای نیکسۆنو هۆکارەکانی دەردکردنی ئەو بنەمایەمان باسکردووە، هەرچی باسی دووەمیشە تەرخانکروە بۆ جەنگی ساردو ئەمریکا لە ژێر ناونیشانی ئەمریکاو جەنگی سارد لە پەیوەندییەکانی نیکسۆندا، لە باسی سێیەمیشدا تیشکمان خستۆتە ریسوایی واتەگێتو دەست لەکارکێشانەوەی نیکسۆن.

ئەویش بە پشت بە ستن بە چەند سەرچاویەکی کوردیو عەرەبیو چەند سایتێکی ئینتەرنێت، لە گرنگترینیان ڕێبازی سەرۆکەکانی ئەمریکا لە نوسینی سەلیم حوسنیو سەردار عەزیزو کتێبی جەنگی ساردی بریتا بجورنلۆند هەروەها التاريخ الدبلوماسی لە نوسینی ج. ب. دروزیل، وێرای چەند سەرچاوەیەکی تر.

بێگومان لەم توێژینەوەیەدا ڕوبەڕووی چەند کێشەو ئاستەنگێك بوینەوە، لەسەرو هەموویانەوە کەمی سەرچاوە لەسەر ئەو ماوەیەی توێژینەوەکەی ئێمەی

تیا ئەنجامدراوەو بە تایبەتیش لە سەر ڕیسوایی (واتەر گێت). هەروەها کەمی کاتی پێویست.

باسی یەکەم/ ژیانو بنەمای نیکسۆن:

پوختەیەك لەمەڕ ژیانی نیکسۆن:

ریچارد نیکسۆن لەساڵی ١٩١٣ لە شاری یوربالندەی سەر بە ویلایەتی کالیفورنیا لە خێزانێکی بە ڕەچەڵەك ئەڵمانی لەدایکبووەو سەر بە پارتی کۆمارییە،[١] لە ساڵی ١٩٢٧دا کۆلێژی یاسای لە زانکۆی (دیۆك) تەواو کردووەو خەریکی کار پارێزەری بووە، پاش هێرشی سەر بیرل هاربر پەیوەندی کردوە بە هێزی دەریایەوەو لە میانەی جەنگی دووەمی جیهانیدا پلەی بەرزبۆتەوە بۆ فەرماندەی هێز.[٢] لە ساڵانی (١٩٤٧-١٩٥٣) ئەندامی کۆنگرێس بووە.[٣]

لە دوو خولی یەك لە دوای یەك لەسەردەمی سەرۆك ئەیزنهاوردا (١٩٥٣-١٩٦١) جێگری سەرۆك کۆماری ئەمریکا بوو، لە ساڵی ١٩٦٠ دا کاندیدی سەرۆکایەتی بوو و لە بەرامبەر جۆن کەنەدیدا شکستی هێنا. دوای دوو ساڵ لەو وادەیەو کاتێك شکستی هێنا لە هەڵمەتی هەڵبژاردندا بۆ پۆستی حاکمی ویلایەتی کالیفۆرنیا، زۆربەی چاودێران پێیان وابوو کۆتایی بە ژیانی سیاسی هاتووە.[٤]

بەڵام دواتر بووە سیو شەشەمین سەرۆکی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە ماوەی ساڵانی ١٩٦٩-١٩٧٤.[٥] لە سەردەمی سەرۆکایەتی نیکسۆندا کۆتایی بە جەنگی ڤێتنام هات[٦]، و کاری کرد بۆ باش کردنی پەیوەندییەکانی لەگەڵ چینی گەلیو یەکێتی سۆڤیەتدا.[٧]

نیکسون لە سیاسەتی دەرەوەیدا دەستکەوتی رونو بەرچاوی بە دەستهێنا، ئەمەش بووە مایەی پەردە پۆشکردنی ئەدای خراپی لە ناوخۆدا. چووە

هەڵبژاردنی ساڵی ١٩٧٢و بەسەر پاڵێوراوی دیموکراتیەکاندا (جورج ماکغوفرن) کە سیناتۆری ویلایەتی (ساوب داکوتا) بوو سەرکەوت بە دەنگی ٤٩ ویلایەت بەرێژەی ٦٠,٦٪ لە کۆی دەنگەکان، کە ئەوەش بەرزترین رێژەی سەدییە لە مێژووی ئەمریکادا تۆمار کرابێت.[٨]

نیکسۆن یەکەم سەرۆکی ئەمریکایە بەهۆی ریسوایی (واترگیت) ەوە دەست لە کار دەکێشێتەوە.[٩] پاش ئەوەی دڵنیا دەبێت لەوەی کە زۆرینەی کۆنگریس دەنگ لەسەر لابردنی دەدەن، نیکسۆن لە رۆژی ٨ ئابی ١٩٧٤ دا لە وتارێکی تەلەفزیۆنیدا بە فەرمی دەستی لەکار کێشایەوەو، لە هەمان رۆژداو لە پاش خۆی جیرالد فۆردی جێگری چووە شوێنیو لێبوردنی گشتی بۆ نیکسۆن دەرکرد.[١٠]

نیکسۆن لە ساڵی ١٩٩٤داو بە نەخۆشی نەزیفی مێشك لە تەمەنی ٨١ ساڵیدا کۆچی دوایی دەکات.[١١]

بنەمای (دۆکترینی) نیکسۆن:

پاش ئەوەی (ریچارد نیکسۆن) (١٩٦٩-١٩٧٤) بوو بە سەرۆك کۆماری ئەمریکا، بە هاوکاری (هینری کیسنجەر) ی وەزیری دەرەوەی ستراتیژییەکی نوێی بۆ سیاسەتی دەرەوەی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا گەڵاڵە کرد، کە بە پرنسیپی نیکسۆن ناسرا.[١٢]

تێوەگلانی سیاسەتی ئەمریکا لە ڤێتنامو ئەنجامە سلبیەکانی کاریگەری هەبوو لە سەر دەرکردنی دۆکترینی نیکسۆن، ئیدارەی ئەمریکی پێی وابوو لەرێگەی رەوانەکردنی هێزێکی سەربازی گەورەی ئەمریکی بۆ ڤێتنام دەتوانن چۆك بە کۆمۆنیستەکان دابدەنو ناچار بە تەسلیم بونیان بکەن.[١٣] بەڵام ئەم ستراتیژەی ئەمریکا لە ڤێتنامدا پەیرەوی دەکرد ستراتیژێکی هەڵە بوو و لە بەدیهێنانی ئامانجەکانیدا سەرکەوتوو نەبوو.[١٤] نیکسۆن لەرێگەیدا، لە یەکەم

سەردانیدا بۆ ڤێتنام وەك سەرۆك کۆماری ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، لە دورگەی گوام (غوام) کۆنگرەیەکی ڕۆژنامەنوسی بەست لە ٢٥ تەموزی ١٩٦٩، ئەوەی ڕاگەیاند کە بە بنەمای نیکسۆن ناسرا.[١٥]

بنەمای نیکسۆن بریتیە لەوەی کە ویلایەتە یەکگرتووەکان هەڵدەستێت بە پێشکەشکردنی چەك‌و هاوکاری بۆ ئەو وڵاتانەی کە لە بەردەم مەترسی دەستدرێژی کردنە سەردان، ئەگەر ئەو وڵاتانە خواستیان هەبێت لە هەڵگرتنی بەرپرسیارێتی سەرەکی بە پێشکەشکردنی هێزی مرۆیی پێویست، بۆ بەرگریکردن لە خۆیان.[١٦]

پرەنسیپی نیکسۆن لە بەرامبەر هاوکاریو یارمەتیە سەربازیو ئابورییەکانیدا باری گرانی ئەرکەکانی بە دەوڵەتە هەرێمیە هاوپەیمانەکانی دەسپارد، زۆرجار پرەنسیپی نیکسۆن بە پرەنسیپی جەنگ بە نوێنەرایەتی دەناسرێت.[١٧]

هەرچەندە ئەم پرەنسیپە ئەنجامی شکستی سیاسەتی ئەمریکا بوو لە باشوری ڕۆژهەڵاتی ئاسیا، بەڵام جێبەجێکردنی بە پلەی یەکەم ئاراستەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست کرا.[١٨] ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە ناوچەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا، بۆ ڕوبەڕو بونەوەی مەترسیەکانی دەسەڵاتی سۆڤێت لە ناوچەکەدا، بێجگە لە تورکیاو ئیسرائیل، پشتی بە ئێرانو سعودییە دەبەست، بەم سیاسەتەش دەوترا (سیاسەتی دوو پایەکە).[١٩]

بە تایبەتیش پاش ئەوەی بەریتانیا لە ساڵی ١٩٦٨دا ڕایگەیاند: بەنیازە لە زۆربەی وڵاتانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست پاشەکشە بکات، ئەمریکا نەیدەویست لە ناوچەیەکی وا گرنگو ستراتیژیدا هیچ هێزێکی تر جێگەی بەریتانیا بگرێتەوە، هەروەك چۆن نەیدەویست ئەزموونی جەنگی ڤێتنام لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست

دووبارە بێتەوە، بۆیە ئەمریکا بڕیاریدا بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ دەستنەخاتە ناو کاروباری وڵاتانی ناوچەکەوە، بەڵکو زیاتر پشتی بە دەوڵەتە هاوپەیمانەکانی دەبەست بە تایبەتیش دوو پایەکە ( ئێران‌و سعودیە).[20] لەبەر ئەوە لە ساڵی ١٩٧٣دا ئێران بە شێوەیەکی بەرچاو بەشداری جەنگی دژی بزوتنەوەی ڕزگاریخوازی لە ڤفار کرد.[21]

باسی دووەم/ ئەمریکاو جەنگی سارد لە پەیوەندییەکانی نیکسۆندا:

دەیەی حەفتاکان بە سەرەتای قۆناغی سێیەمی جەنگی سارد دادەنرێت، توندی هێرشەکانی سۆڤێت‌و ماندوبونی لە ڕادەبەری ئەمریکا لە جەنگی ڤێتنام‌و کەمبونەوەی گرژی‌و ئاڵۆزییەکانی نێوان ئەمریکاو چین لە تایبەتمەندییە گرنگەکانی ئەم قۆناغە بوون.[22]

ریچارد نیکسۆن بە چوونی بۆ ناو کۆشکی سپی لە کانونی دووەمی ١٩٦٩دا دەستی لە هەڵوێستی سەرسەختانەی دژە کۆمۆنیستیەکەی پێشووی هەڵگرت،[23] لەم سۆنگەیەشەوە هەوڵیدا لەڕێگەی باشکردنی پەیوەندییەکانی لەگەڵ هەندێ وڵاتی سەر بە بلۆکی ڕۆژهەڵات‌و بە تایبەتی یەکێتی سۆڤێتی جەمسەری ڕۆژهەڵات جەنگی سارد بباتە قۆناغێکی نوێوە.

پەیوەندییەکانی ئەمریکاو چین:

نیکسۆن‌و کیسنجەر لە هەوڵی چارەسەرکردنی پەیوەندیەکەیاندا بوون لەگەڵ رکابەرێکی تری کۆمۆنیستیدا، کە کۆماری گەلی چینی بوو، هەرچەندە ئەمریکا بە فەرمی دانی بە کۆماری گەلی چیندا نە نابوو کە لە ساڵی ١٩٤٩ دا دامەزرابوو، هەروەها لە جەنگی کۆریاشدا جەنگی لە گەڵدا کردبوو، بەڵام ئیتر نیکسۆن بە ئاراستەی بەدیهێنانی پەیوەندییەکی دۆستانەتر هەنگاوی دەنا.[24]

لـە نیـسانی ١٩٧١دا چـینیەکان هەسـتان بـە دەستپێـشخەریەك، ئـەویش بانگهێـشت کردنـی تیپێکـی پیـنگ-پـونگی ئـەمریکی بـوو بـۆ پێـشبڕکێیەکی وەرزشـی، و لـە ١٥ تـەموز نیکسۆن ڕایگەیانـد چـین بانگهێـشتی کـردووە و بـە خۆشحاڵیەوە بانگهێشتەکەی بۆ سەردانی ئەو وڵاتە قبوڵ کردووە.[٢٥]

هینـری کیـسنجەر ڕاوێـژکاری سـەرۆکی ئـەمریکا بـە نهێنـی لـە پاکستانەوە سەردانی چـینی کـرد، و پـاش وەڵامدانـەوەی خواسـتکانی چـین بـەدانپیانان بـە حکومەتەکەیدا (حکومـەتی چـینی میللـی) و پـاش ئـەوەی چـینی میللـی لەسـەر داوای ئەمریکا شوێنی چینی نیشتمانی گرتەوە لە نەتەوە یەکگرتووەکانو بوو بە ئەندامی هەمیـشەییو خـاوەنی مـافی ڤیتـۆ لـە ئەنجومـەنی ئاسـایش، کیـسنجەر هەستا بە گەشتی دووەمی بۆ چین بۆ ئامادەکاری هاتنی سەرۆك نیکسۆن.[٢٦]

نیکسۆنو کیـسنجەر لـە شـوباتی ١٩٧٢دا سـەردانی چـینیان کـرد، ئەمـەش سەردانێکی مێژوویی بوو لەبەر ئەوەی یەکەم سەرۆکی ویلایەتـە یـەکگرتووەکانی ئەمریکا بوو کە سەردانی چینی کرد.[٢٧] لە میانەیدا دانـی بـەوەدا نـا کـە فورمـوزا (تایوان) بە شێکە لە چـینو ڕایگەیانـد: دەیـەوێت چـینیەکان خۆیـان ئـەو پرسـە چارەسەر بکەن.[٢٨]

وێـڕای ئـەوەی ویلایەتـە یـەکگرتووەکان یـەپێی پەیماننامـەی سـاڵی ١٩٥٤ پەیوەست بوو بـە بـەرگریکردن لـە تـایوان، هـەروەك کۆمپانیـا ئەمریکیـەکان بـە بەهای چـەندین بلیـون دۆلار بەرژەوەنـدیان لـە تـایوان هـەبوو، بـەڵام حکومـەتی ئەمریکا ئامادە بوو بۆ هەڵوەشاندنەوەی پەیماننامە بەرگریەکەی لەگەڵ تایواندا، بەو پێیەی گەلی دورگەی تایوان لە ماوەیەکی کورتدا دەتوانن بەرگری لـە خۆیـان بکـەنو دەتـوانن لـە ماوەیـەکی دوردا بگەنـە چارەسـەرێکی ئاشـتیانە. هـەروەها

نیکسون بەڵێنیدا بە کێشانەوەی وردە وردەی هێزەکانی ئەمریکا لەگەڵ کەمبونەوەی بارگرژیەکان لە ڤێتنام.[29]

بەم شێوەیە هەردوو سەرۆك نیکسۆنو ماوتسی تونگ پەیوەندییە دبلۆماسیەکانیان دەستپیکردەوە، ئەمەش نەك لەبەر نزیکبونەوەی ئایدۆلۆژیای هەردوو وڵات لە یەکتر، بەڵکو بەهۆی پێویستیە جیۆپۆڵەتیەکان.[30] چونکە نیکۆسۆن پێی وابوو پێویستە لە ڕێگەی چینەوە گەمارۆی یەکێتی سۆڤێت بدرێت، هەروەها پێی وابوو ئەگەر بێتو یابان بکەوێتە دەست کۆمۆنیستەکان، ڕێگەیان بۆ دەستگرتن بەسەر سەرجەم ئاسیادا بۆ تەخت دەبێت.[31]

چینو ویلایەتە یەکگرتووەکان لە ساڵی ١٩٧٢ دا نوسینگەی پەیوەندییەکانیان لە پایتەختی هەردوو وڵاتدا کردەوە، بەڵام ئاسایی کردنەوەی پەیوەندییەکان دواکەوت لەبەر ئەوەی بەهۆی ریسوایی (واتەرگێت) ەوە نیکسون ناچار بوو دەست لە کار بکێشێتەوە، تا لەساڵی ١٩٧٩ پەیوەندییەکان ئاسایی بۆوە.[32]

پەیوەندییەکانی ئەمریکاو یەکێتی سۆڤێت:

نیکسون خواستی لە باشکردنی پەیوەندییەکانی لەنێوان ویلایەتە یەکگرتووەکانو یەکێتی سۆڤێت ڕاگەیاند، و خواستی دەستپێکردنی سەردەمێکی نوێی لە دانوستانی گشتگیر لەنێوان ڕۆژهەڵاتو ڕۆژئاوادا ئاشکرا کرد، ئەم ڕاگەیاندنەو ئەو هەنگاوە کردەییانەی بەدوایدا هاتن بە کردەیی کۆتایی بە قۆناغێکی مێژوویی تەواو لە قۆناغەکانی ململانێکە هێنا کە ساتە قورسو بارگرژییە توندەکانی بەخۆوە بینی،[33]

بەرنامـەی سیاسـەتی دەرەوەی نیکسۆن بـە شـێوەیەکی سـەرەکی لەسـەر بنـەمای تیۆرییـەکانی هینـری کیـسنجەر دامـەزرابوو، پێـداگری لەسـەر هاوکـاری نێوان زلهێزەکانی جیهان دەکرد،[٣٤]

قۆناغی ڕێکەوتن کە مۆرکی دەیەی حـەفتاکان بـوو لـە سـەدەی بیـستەم لـە سیماو ئەنجامەکانیدا لە قۆناغی جەنگی سارد جیاواز بـوو، قۆنـاغی ڕێکـەوتن بـە واقیعیو باڵا دەستی هاوکاریو تێگەیشتن بەسەر ڕوبـەڕوو بونـەوەدا دەناسـرا، و بـە دەرچـون لـە بـار گـرژی. لەبـەر ئـەوە قۆنـاغی ڕێکـەوتن وەسـتانی جەنگـە ڕاگەیاندنو پڕوپاگەندەکانی لەنێوان ڕۆژهەڵاتو ڕۆژئاواداو کشانەوە لـە تـاودانی جەنگە هەرێمیەکانی بەخۆوە بینی، و ڕوانین بۆ کێشەکانی جیهـان بـە تێڕوانینـی ناوخۆیی نەوەك به تێڕوانینی ململانێ گەورە نێو دەوڵەتیەکە. ئەم سیمایانە کـە لەسـەرەتادا بـووە مـۆرکی پەیوەندییـەکانی ئـەورووپا–سـۆڤێتو پاشـان پەیوەندییەکانی ئەمریکا–سۆڤێتو ڕۆچـووە نـاو سـەرجەم بوارەکـانی ئـابوریو سیاسیو ڕۆشنبیریو هونەریو وەرزشیو بوارەکانی مافەکانی مرۆڤەوە.[٣٥]

بێگومان ساڵی ١٩٧٢ لە گرنگترین ساڵەکانی ڕێکەوتن بوو کـە چـاوپێکەوتنی لوتکـەی مۆسـکۆی نێـوان بریجنیـفو نیکـسۆنی بـەخۆوە بینـی،[٣٦] کـەمێك دوای گەڕانەوەی نیکسۆن لە چینەوە بۆ ئەمریکا، مۆسکۆ ئامادەیی خـۆی بـۆ گفتوگـۆ کردن لەسەر کەمکردنەوەی دروسـتکردنی چـەکی ئـەتۆمی ڕایگەیانـد، لـە مـانگی مایسدا نیکسۆن بەرەو مۆسکۆ ڕۆیشتو لەگەڵ بریجنیف ڕێکەوتنێکی ئیمزا کرد، ناوی پەیماننامەی کەمکردنەوەی چەکە ستراتیژیەکان یان (سـالت ١) ی لێنـرا،[٣٧] بە پێی ئەم ڕێکەوتنـە چـەکە سـتراتیژیەکانی ئـەم دوو زلهێـزە سـنوردار کـران.[٣٨] ئەمەش گرنگی خۆی هەبوو چونکە یەکەم ڕێکەوتن بوو لە نێوان ئەو دوو وڵاتـەدا لە سەر کەمکردنـەوەی پێشبڕکێی چەکسازی ئـەتۆمی.[٣٩] کە پێشتر لـە دەیـەی

شەستەکاندا هەر یەك لەو دوو زلهێزە لە هەوڵی پەرەپێدانو دروستکردنی موشەکە دژە موشەکەکانو پێشبڕکێی موشەکە ئەتۆمیەکاندا بوون.[40]

پەیوەندییەکانی ئەمریکاو کورد:

پاش ئەوەی حومەتی عێراقی نەك هەر نەیتوانی لە هەوڵە سەربازیەکانی بۆ دامرکاندنەوەی شۆڕشی کورد سەرکەوتن بە دەستبهێنێت، بەڵکو لە بەرەکانی جەنگدا زیانی مادیو مرۆیی زۆریشی بەرکەوت، ئەمەش وای لە حکومەتی عێراقی کرد بۆ چارەسەرکردنی پرسی کورد بەدوای ڕێگە چارەی تردا بگەڕێت، بۆ ئەم مەبەستەش گفتوگۆ دەستی پێکردو لە ئەنجامدا ڕاگەیاندنی بەیاننامەی ١١/ئازاری ١٩٧٠ی لێکەوتەوە.[41]

لە سەرەتاکانی ساڵی ١٩٧٠ دا بەهۆی ئەوڕۆڵە نوێیەی ئێران کە وەك دەوڵەتێکی هەرێمی دەیبینی هاوکاری سەربازی ئەمریکا بۆ ئەم وڵاتە لە زیاد بوندا بوو، ئەمەش لە چوارچێوەی تێڕوانینی نیکسۆنو کیسنجەرەوە تایبەت بە پەرەپێدانی هێزە هەرێمیەکان بۆ چاودێری کردنی ئامانجەکانی ئەمریکاو دژایەتیکردنی شیوعیەتو قەڵەمڕەوی سۆڤێتی لە ناوچەکەدا سەرچاوەی گرتبوو.[42]

لەلایەکی ترەوە لێك نزیکبونەوەی عێراقو سۆڤێت بە خێرایی لە بەهێز بوندا بوو، وەفدێکی سۆڤێت لە ٧ نیسانی ١٩٧٢دا بە سەرۆکایەتی "الیکسی کۆسگین" ی سەرۆك وەزیرانی سۆڤێت گەیشتە بەغدادو لە ٩ی نیساندا پەیمانی دۆستایەتیو هاوکارییان بۆ ماوەی ١٥ ساڵ واژۆ کرد، وێڕای ئەوەی دەستی لەپەترۆڵی عێراق گیر کرد، هەروەها نزیکەی هەموو چەكو تفاقی جەنگی عێراق لە سۆڤێت دەکڕدرا.[43]

تـــاران‌و واشـــنتۆن لـــەلای خۆیانـــەوە بـــە گومـــان‌و دوو دڵیـــەوە لـــەو پەرەسەندنەیان دەڕوانی، و لـەم کاتەشدا دەرکـەوت کـە گـەڕانی کـورد بـەدوای هاوپەیمانـدا لەگـەڵ بەرژەوەنـدی ئێرانـی– ئەمریکیـدا کـە بریتـی بـوو لـە کەمکردنەوەی دەسەڵاتی سۆڤێت لە ناوچەکەدا یەکیدەگرتەوە.[٤٤]

ریـچارد نیکـسۆن سـەرۆك کۆمـاری ئـەمریکا، مانگێـك دوای واژۆ کردنـی ڕێکەوتننامەی دۆستایەتی‌و هاوکاری سۆڤێت‌و عێراق، سـەردانی مۆسـکۆی کـردو لەوێشەوە لەسەر بانگهێشتی شا تەنیا بـۆ مـاوەی ٢٤ کاتـژمێر سـەردانی تـارانی کرد بـۆ دارشـتنی پلانێـك بـۆ ڕوبەڕوبونـەوەی ئـەو ڕێکەوتننامەیـە، یارمەتیـدانی کوردیش یەکێك لە پلانە سەرەکیەکان بوو لە سەر پێشنیارو داخوازی شا.[٤٥]

ئیدارەی ریچارد نیکسۆن وەڵامی پێشنیاری شای ئێرانی لە ١٩٧٢ دا دایـەوە بە یارمەتیدانی بزوتنەوەی کوردی بە پارەو چەك.[٤٦] وەزیـری دەرەوەی ئـەمریکا هنری کیسنجەر لە یاداشتەکانیدا بەناوی "سـاڵانی کۆشـکی سپی" نوسـیویەتی: "کۆمـەکیکردنی بـارزانی سیاسـەت یـاخود دەستپێـشخەریەکی ئـەمریکی نـەبوو، بەڵکو ئامانج لێی ڕازیکردنی هاوپەیمانی هەرێمی بوو، کـە هەسـتی بـە مەترسـی دەکرد لە لایەن ڕژێمی عێراقی شوێنکەوتووی سۆڤێتەوە".[٤٧]

لـە ٢٢ حـوزەیرانی ١٩٧٢دا جەنـەراڵ مەنـسور پـوور نامەیـەکی لـە شـاوە بـۆ بارزانی هێنا، ئاماژەی بـەوە دەکـرد کـەوا سـەرۆکی ئـەمریکا ڕەزامەنـدی لەسـەر یارمەتیـدانی شـۆڕش پیـشانداوە، هـەروەها ئـەمریکا داوا لـە بـارزانی دەکـات شـاندێکی بـالا بنێـرێ بـۆ دەستنیـسانکردنی ئاسـۆی پەیوەنـدی‌و چـۆنیەتی یارمەتیەکان، لـە ٢٦ حوزەیرانـدا "د. مـەحمود عوسمـان"و "ئیـدریس بـارزانی" چوون بۆ تاران‌و پاش پێشوازی کردنی شا لێیان چوون بۆ واشنتۆن.[٤٨]

شاندی باڵای شۆڕشی کورد لە (٣٠ حوزەیرانی ١٩٧٢) دا چاویان بە هەریەك لە (ریچارد هێلمز)ی بەڕێوەبەری (C.IA)و (ریچارد کەنەدی) یاریدەدەری (هنری کیسنجەر) لە ئەنجومەنی ئاسایشی ئەمریکی کەوت، لە ئەنجامی گفتوگۆکانی نێوان هەردوو لاشدا، واشنتۆن بڕیاریدا کە یارمەتیو کۆمەکی کورد بکاتو پەیوەندی لە گەڵیان هەبێت، بەڵام دەبێت پەیوەندییەکە تەواو نهێنی بێت.[٤٩] ئەم پشتگیرییە دارایە کاتیەش لەلایەن ئاژانسی هەواڵگری ئیسرائیل (مۆساد) و ئاژانسی هەواڵگری ئێران (ساواك) ەوە پێشکەش بە کورد کرا .[٥٠]

بە پێی ئەو بڕیارە ١٦ملیۆن دۆلار بە شێوەیەکی سەرەتایی بۆ یارمەتی کورد تەرخان کرابوو، لە کۆتاییەکانی ١٩٧٢دا ئەو بڕیارە جێبەجێکرا، ٦ملیۆن دۆلاری بە شێوەی نەختینە وەرگیراو ئەوی تریشی تەرخان کرا بۆ نرخی ئەو چەکانەی دەکڕدرێ.[٥١] یارمەتیەکانی کورد سنوردار بوو مەبەستی نیکسۆنو شا سەرکەوتنی کورد نەبوو، بەڵکو بەردەوام بوونی شۆڕشی کورد بوو بۆ لاواز کردنی حکومەتی عێراق.[٥٢]

ئەم پرۆسە نهێنییە لە ئازاری ساڵی ١٩٧٥ کۆتایی پێهات کاتێك شای ئێران لە گەڵ سەدام حسێندا ڕێکەوتنی جەزائیریان واژۆ کرد، بە ئامانجی چارەسەر کردنی کێشە سنورییە هەڵپەسێردراوەکانی نێوانیانو، بەمەش کۆتایی بە شۆڕشی ئەیلول هات .[٥٣]

بەگوێرەی ئەم توێژینەوەیە دەتوانین بڵێین سیاسەتی ئەمریکا بەرامبەر بەکورد سیاسەتێکی تاکتیکی بوو نەك ستراتیژیو لەپێناو بەرژەوەندی ئێرانی هاوپەیمانی( کە سەر ئەنجام بە زیانو شکستی کورد تەواو بوو) بە پێی ڕێکەوتننامەی جەزائیر کە بە هاوکاری وڵاتانی هەرێمیو ناوچەکەو بە چاودێری ئیسرائیلو ئەمریکا بەسترا کۆتایی بە شۆڕشی کورد هات، ئەمەش لەسەردەمی

سەرۆکایەتی (جیرالد فورد) کە دوای دەست لەکارکێشانەوەی نیکسۆنی سەرۆکی ئـەمریکا بـەهۆی ڕیـسوایی (واتـەرگێت) ەوە چـووە شـوێنیو بـووە سـەرۆکی ئەمریکا.

باسی سێیەم/ ڕیسوایی واتەرگێتو دەست لەکار کێشانەوەی نیکسۆن:

واترگیـت نـاوی گـەورەترین ڕیـسوایی سیاسـیە لـە مێـژووی ویلایەتـە یەکگرتووەکانی ئەمریکادا، لە هەڵبژاردنـەکانی ساڵی ١٩٦٨ دا ریچارد نیکسۆن زۆر بە سەختی توانی بەسەر ڕکابەرە دیموکراتیەکەی (همفری) دا سەرکەوێت بەرێژەی ٤٣,٥٪ بەرامبەر ٤٢٪، ئەمەش وایکرد سەرۆك ریچارد نیکسۆن لە کاتی هەڵمەتی نوێی سەرۆکایەتیدا بڕیار بدات سیخوڕی بکات بەسەر بارەگای پارتی دیموکراتی ڕکابەریدا لە بینای واترگیت.[٥٤] بەمەبەستی ئاشکرا کردنی بەرنامەکانی داهـاتووی ڕکابەرەکـەی.[٥٥] دواتـر دوای ئاشـکرا بـوونی بـەناوی ئـەو بینایـەوە بـە ڕیسوایی واتەگێت ناسرا.[٥٦]

یەکێك لە پاسەوانەکانی بینای واتەرگیت هەست بە بوونی چەند شریتێکی داپۆشراو کرد بە قفڵی چەند دەرگایەکەوە، پاش لێکردنەوەیان پۆلیسی لێ ئاگادار کرد ، پۆلیس چوونە شوێنەکەو پێنج کەسیان دەستگیر کرد کە خەریکی دانانی ئامێری گوێگرتن بوون لە پەیوەندییە تەلەفۆنیەکانی لیژنەی نەتەوەیی پارتی دیموکرات.[٥٧]

ڕۆژنامەی واشنتۆن پۆست پرسەکەی بڵاو کردەوە، ئەو دوو ڕۆژنامە نوسەی پرسەکەیان بڵاوکردەوە و کاریان لەسەر کرد (بوب وود ورد) و هاوڕێکەی (کارل برنستین) بوون، کە بەمەش (بوب وود ورد) ناوبانگی پەیدا کردو بەرزبۆوەو دواتر بووە سەرنوسەری ڕۆژنامەی واشنتۆن پۆست.[٥٨]

**بۆ ئەم توێژینەوەیە سوود لەم سەرچاوانە وەرگیراوە:**

د.أحمد محمود صبحي:

١- فلسفة التاريخ، مؤسسة الثقافة الجامعية، (الاسكندرية: ١٩٧٥).

آرنولد توينبي:

٢- مختصر دراسة التاريخ، ترجمة: فؤاد محمد شبل، لجنة التأليف والترجمة، (القاهرة: ١٩٦٠).

٣- الحضارة في الميزان، ترجمة: أمين محمود الشريف، (دمشق: ٢٠٠٦).

ألبان.ج.ويدجري:

٤- التاريخ وكيف يفسرونه من كونفوشيوس إلى توينبي، ترجمة: عبدالعزيز توفيق، الهيئة المصرية العامة للكتاب، (القاهرة: ١٩٧٢).

د.جميل موسى التجار:

٥- فلسفة التاريخ مباحث نظرية، المكتبة العصرية، (بغداد: ٢٠٠٧).

د.رأفت الشيخ:

٦- تفسير مسار التاريخ، عين للدراسات والبحوث الانسانية والاجتماعية، (القاهرة: ٢٠٠٠).

عبدالحميد صديقي:

٧- تفسير التاريخ، ترجمة: د.كاظم الجوادي، دار القلم، (الكويت: ١٩٨٠).

عبدالفتاح الديدي:

٨- هيجل، درا المعارف، (القاهرة: ٢٠٠١).

د.مصطفى النشار:

٩- فلسفة التاريخ، شركة الأمل للطباعة والنشر، (القاهرة: ٢٠٠٤).

د.مفيد كاصد الزيدي:

١٠- المدخل إلى فلسفة التاريخ، دار المناهج للنشر والتوزيع، (عمان: ٢٠٠٦).

مكتبة النهضة:

١١- الموسوعة الفلسفية المختصرة، نقلها عن الانجليزية: فؤاد كامل وآخرون، (بغداد: ١٩٨٣).

د.هاشم يحيى الملاح:

١٢- المفصل في فلسفة التاريخ، دار الكتب العلمية، (بيروت: ٢٠٠٧).

د.هاشم يحيى الملاح وآخرون:

١٣- دراسات في فلسفة التاريخ، مديرية دار الكتب للطباعة والنشر، (الموصل: ١٩٨٨).

هيجل:

١٤- محاضرات في فلسفة التاريخ، ترجمة: د.إمام عبدالفتاح إمام، دار الثقافة للطباعة والنشر، (القاهرة: ١٩٧٤).

# چاوپێکەوتن لەگەڵ مێژوونووس د.ئازاد عوبێد

ئەنجامدانی: د. محمد

پ١/ ناونیشانی نامەی ماستەرو دکتۆراکەت چین؟

و/ ناوونیشانی نامەی ماستەرەکەم(کاریگەری شۆڕشی ئەیلوول لەسەر پێشخستنی ڕۆژنامەوانیی کوردی لە باشووری کوردستاندا(١٩٦١-١٩٧٥)بووە، کارنامەی دکتۆراکەشم بە ناوی(ڕۆڵی سیاسی و کارگێڕی و ڕووناکبیریی مەعروف جیاووك(١٨٨٥-١٩٨٥)ە.

پ٢/ چەند کتێبت چاپکردووە ناونیشانەکانیان چین؟

و/ ئەم کتێبانەم چاپ کردووە:

١- کورد لە سەرچاوە عەرەبییەکاندا، ئارشاك پولادیان، وەرگێڕان: چاپخانەی زانکۆی سەلاحەددین، هەولێر، ٢٠٠٠.

٢- خەباتی ڕزگاریخوازی کورد و ئازەر لە ئێران، د.کەمال مەزهەر ئەحمەد، وەرگێڕان: دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس، چاپخانەی پەروەردە، هەولێر، ٢٠٠٤.

٣- کوردو کوردستان لە کۆمەڵە وتارێکی مێژوویدا، د.ئەحمەد عوسمان ئەبوبەکر، وەرگێڕان: دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی موکریان، هەولێر، ٢٠٠٥.

٤- کاریگەری شۆڕشی ئەیلول لەسەر پێشخستنی ڕۆژنامەوانی کوردی لە باشووری کوردستاندا(١٩٦١-١٩٧٥)، وەزارەتی ڕۆشنبیری، چاپخانەی ڕۆشنبیری، هەولێر، ٢٠٠٧.

٥- خەباتی سیاسی و پێشمەرگایەتی شەهید مەئمون دەباغ، چاپخانەی حاجی هاشم، هەولێر، ٢٠٠٧.

٦- ف.مینورسکی ڕۆژهەڵاتناس نووسینەکانی لە بارەی کورد لە سەردەمی ئیسلامدا تا سەرهەڵدانی خەلافەتی عوسمانی، تاریق محەمەد عەبدولرەحیم، وەرگێڕان، وەزارەتی ڕۆشنبیری، چاپخانەی ڕۆشنبیری هەولێر، ۲۰۰۸.

٧- الاعمال الكاملة للدكتور احمد عثمان ابوبكر، جزئين، مركز ژين لاحياء التراث الثقافي والصحفي، السليمانية، ۲۰۱۰، (اعداد).

٨- سەرجەم بەرهەمەکانی مەعروف جیاووك، بنکەی ژین، سلێمانی، ۲۰۱۱، (ئامادەکردن).

پ٣/ چەند وڵاتت بینیوە؟

و/ ئێران و تورکیا.

پ٤/ بوونی ئەو هەموو بەشی مێژووە لە کوردستان وا بە پێویست دەزانی؟

و/ هەرچەندە زۆری و بۆری باش نییە، بەڵام لەبەر ئەوەی ئێمەی کورد مێژوومان وەك پێویست نەنووسراوەتەوە خەڵکی بیانی بە زۆری نووسیویانەتەوە، بۆیە ئەگەر نەختێ بایەخیان پێ بدرێت و دڵسۆزی بۆ کارکردن و بەرنامەی زانستی هەبێت، بێگومان کەڵکی باش دەبێت.

پ٥/ بۆچی ئەگەر ئافرەت مافی خوێندنی هەیە لە کوردستان دا بەشداری ئافرەت لە نووسینی مێژووی کورددا لاوازە؟

و/ پێم وابێت لەم ساڵانەی دوایی ئافرەتیش کەم کەمە هاتوونەتە پێش بۆ بواری مێژوو، بەگشتیش هەر پیاو تا ئێستا سواری مەیدانە تا ئافرەت، لە تەواوی بوارەکاندا.

پ٦/ بۆچی مێژوونووسی ئەکادیمی لە نێوان مەسیحییەکانی کوردستان هەڵنەکەوتوون؟

و/ ڕەنگە هۆکارەکە بۆ ئەوە بگەڕێتەوە، ڕێژەیان کەمە زۆر کەمیان دەکەونە بەشی مێژوو، پتر بۆ بوارەکانی زمان و پزیشکی...تد دەچن.

پ۷/ بازاڕی کتێبی مێژوویی لە کوردستان دا چۆن دەبینی؟

و/ وابزانم بازاڕی کتێبی مێژوویی لە کوردستان زۆر باشە.

پ۸/ ئایا سەردانی مۆزەخانەکانی کوردستانت کردووە؟

پ۹/ لە کاتی خوێندنەوەی مێژووی کورد هەست بە چی دەکەیت؟ شانازی کردن یان غەمباربوون یان هەست دەکەی کاری خۆت دەکەی؟

و/ بەداخەوە پتر هەست بە غەمباری دەکەم، لەبەر ئەوەی پتر نوشستی و نسکۆیە و تا ئێستا، ئەوەی بەتەماین نەهاتۆتەدی، بەڵام لەگەڵ ئەوەش دەبێ کاری خۆمان هەر بکەین.

پ۱۰/ ئایا ڕۆژنامەگەری ئەمڕۆ بە سەرچاوەیەکی باوەڕپێکراو بۆ مێژووی کورد دادەندرێ؟

و/ بەڵێ، ڕۆژنامەنووسی بە گشتی سەرچاوەیەکی گرنگە، بەڵام دەبێ بە پارێزەوەو بە ئاگاوە بەکاربێت، چونکە بەهۆی باروددۆخی سیاسی کوردستان، ڕەنگە زۆر ڕووداو بە پێی پێویست زانیاریەکان تەواو نەبن، یان بە جۆرێکی دی باس کرابن.

پ۱۱/ ژمارەی کتێبەکانی کتێبخانەی ماڵەوەت چەندە؟

و/ بە ڕاستی بە ژمارە نازانم، بەڵام پێم وایە ڕێژەیەکی زۆر باشی سەرچاوەکان مێژووی کورد و ئەدەبی کلاسیکی کوردیم هەن.

پ۱۲/ ڕات بەرامبەر مێژووی زارەکی چییە؟ ئایا لەم بوارەدا کارت کردووە؟

و/ تاکو ئێستا بەشداریم نەکردووە.

پ۱۳/ ئایا چۆن کارەکانی ئەکادیمی کوردی لە بواری مێژوودا هەڵدەستەنگێنی؟

و/ بە ڕاستی ئەکادیمیا چالاکییەکانی زۆر باشن بە گشتی، لە لایەنی مێژووش شتی زۆر باشی کردووە، چ بە چاپدانی نامەی ماستەرو دکتۆرا و چ بە ئامادەکردنی فەرهەنگی مێژوو و بە نیازیشن ئینسکلۆپیدیای کوردستان ئامادە

بکەن، کە دڵنیام ئەگەر بەو ڕەوتەی ئێستا بەردەوام بێت، کارێکی یەکجار گەورە دەکەن، کە خزمەتێکی یەکجار گەورەیە بە مێژووی کورد و کوردستان.

پ١٤/ ئایا شتێك هەیە بە ناوی قوتابخانەی کوردی لە نووسینی مێژوودا؟

و/ نەخێر، ئەوەی هەیە، تەنیا تەواوکەری ئەو ڕێبازانەیە، کە خەڵکانی دی تا ئێستا کردوویانە و ئێمەش لە شوێن پێی ئەوان هەنگاو هەڵدێنین.

پ١٥/ ئایا مێژوونووسانی کورد لەبەر پوخت نووسی یان کەم کاتی کەم دەنووسن؟

و/ ڕەنگە پتر لەبەر پوخت نووسی بێت، هەرچەند کەم کاتیش ڕۆڵی خۆی هەیە، ئەویش بە هۆی سەرقاڵیان بە وانەبێژی و ژیانی تایبەتی خۆیان.

پ١٦/ ڕات بەرامبەر کۆمەڵەی ڕۆشنبیریی مێژووی کوردستان چییە؟

و/ بوونی کۆمەڵە و ڕێکخراو زیاتر بۆ پتر ڕێکخستن و ڕێك و پێك کردنی کارەکانە بەتایبەتی بۆ کۆکردنەوەی خەڵکی لێهاتوو و شارەزا و کارکردنی بە کۆمەڵ، دیارە کەم و کورتی زۆرە، بەڵام لەگەڵ ئەوەش کۆمەڵەی ڕۆشنبیریی مێژوویی کوردستان، وێڕای تەمەنی کورتی ژمارەیەکی باش چالاکی بەڕێوەبردووە، چ بە سازدانی کۆڕ و چ بە دەرکردنی و چاپکردنی گۆڤار و کتێبی مێژوویی، هەرچەندە زۆربەی کتێبە چاپکراوەکان بە زمانی عارەبین، سەبارەت بە گۆڤارەکەش بێگومان شوێنی خۆی لە بواری ڕۆژنامەنووسی و لە بواری نووسینەوەو بڵاوکردنەوەی مێژوودا کردووەتەوە.

پ١٧/ بایەخی وەرگێڕان لە بواری مێژوودا چییە؟

و/ وەرگێڕان لە هەموو بوارەکاندا زۆر پێویستە بەتایبەتیش بۆ ئێمەی کورد، کە ڕۆشنبیری ئێمە ئەوەندە کەم و کورتی و کەلێنی زۆرە ئەگەر بایەخ بە وەرگێڕانی نەدەین، ناتوانین کەڵك لە ڕۆشنبیری جیهانی وەربگرین، هەرچەندە زمانەکەشمان، وەك پێویست لە ڕووی زاراوەی پێویست تا ئێستا کەم و کورتی

زۆرە. هەروەها وەك سەرچاوەش، لەبەر ئەوەی تووشی زۆر گرفت دەبن. دەبێ ئەوەشمان لە بیر نەچێ هەرچەندە لەم ساڵانەی دوایی بایەخ بە وەرگێڕان دراوە، بەڵام هێشتا زۆری ماوە با ئەمەش لەبیر نەکەین بە داخەوە وەرگێڕانەکان لە زمانی یەکەم نین، بۆیە زۆرجار وەك پێویست هەقی وەرگێڕانەکە نادرێت، ئەمە سەرەڕای شارەزایی وەرگێڕ چ لەو زانستەی وەری دەگێڕێ و چ لە هەردوو زمان. هەر بۆ نموونە لە یەکێك لە ژمارەکانی گۆڤاری(خاك) کە لە سلێمانی دەردەچوو، بەڵگەنامەیەك لە زمانی ئینگلیزی وەرگێڕدرابوو، لەبەر ئەوەی نووسەرەکەی شارەزای مێژوو و جوگرافیا نەبوو، کەوتبووە هەڵەیەکی زەقەوە. ئەویش ئەوەبوو کە بەڵگە نامەکە تایبەت بوو بە ناوچەی ئاکرێ لە دەڤەری بادینان، برای وەرگێڕ دەڵێ(هەکاری)، دیارە هەکاری لە ئاکرێ زۆر دوورە، تومەز مەبەستی بەڵگەنامەکە خێڵی(هەرکی)ی ناودارە کە لەو ناوچەیە هەن! بۆیە دەبێ وەرگێڕ وردو شارەزاییەکی باشی هونەری وەرگێڕانیش بێت.

پ١٨/ ئایا ڕادیۆو تەلەفزیۆنەکانی کوردستان وەکو پێویست گرنگیان بە مێژووی کورد داوە؟

و/ نەخێر ڕادیۆو تەلەفزیۆنەکانی کوردستان وەك پێویست بایەخیان بە مێژوو نەداوە، ئەوەندە بایەخیان بە هونەر بەتایبەتی گۆرانی(ناکوردی) داوە ئەوەندە بایەخیان بە مێژوو نەداوە، ڕەنگە گلەیەکەش هەر ڕادیۆو تەلەفزیۆنەکان نەگرێتەوە و نووسەران و مێژوونووسان و ئەوانەی خەریکی مێژووش بگرێتەوە، ئەو جۆرە مێژوونووسە ڕۆژنامەنووسانەمان نەبێت، واتە ئەو مێژوونووسەی هەستی ڕۆژنامەوانی و ڕاگەیاندنی هەبێت.

پ١٩/ پێت وایە ئەوەندەی مێژووی نوێی کورد ڕوونە ئەوەندە مێژووە کۆنەکەی ڕوون نییە؟

و/ پێم وایە، ئەو قسەیە هەندێك ڕاستی تێدایە...بەڵام بەڕاستیش تا ئێستا بە تەواوی لە مێژووی کۆنی کوردستان و شوێنەوارە کۆنەکان نەکۆڵدراوەتەوە بە شێوەیەك کە دووربێت لە هەر چەشنە دەمارگیرییەکی نەتەوەیی و ناوچەیی بەڕاستی و دروستی مێژووی کورد و کوردستان لە سەردەمی زوو نەنووسراوەتەوە و نەپشکێندراوە...! ئەمە جگە لەوەی کە کورد هەمیشە ڕاونراوە و ئەویش ناچاربووە بۆ مانەوەی خۆی، خۆ بخزێنێتە ناو چیاو دۆڵ و شوێنە دوورە دەستەکان، کە نەتوانێت تەنانەت بچێتە گوندەکەی تەنشتیەوە، بەهۆی دژواری هاتووچۆ و سەختی ڕێگاوبان و دژواری کەش و هەوای، کە ئەمە زۆر بە زەقی لە زمان و ئاخاوتن و ئاکار و جلوبەرگ و خوو و هەموو لایەنەکان ڕەنگی داوەتەوە بە دەیان زاراوە بن زاراوە دروست بوونە.

پ٢٠/ ئایا مێژوو کە سوودی هەیە زیانیشی هەیە؟

و/ ئەگەر زیانەکانی دەرخستنی نسکۆ و نووچدانەکان بێت، کەوره و گیانی بەرەنگاربوونەوە لای هەندێ توێژ لاواز بکات، پێم وانییە بەو جۆرە بێت، ئەوەندە کاریگەر بێت، ئەگینا پەندو وانەکانی مێژوو زۆر گرنگ و پێویستن.

پ٢١/ فیلمە دەکیۆمێنتارییەکانی مێژووی کوردت بینیوە؟

و/ هەموویم نەبینیووە، بەڵام چەندساڵێك پێشتر بابەتێکم بینی باسی کۆماری کوردستان بوو، هەڵەی زەقی لە مێژووەکە کردبوو، ئەوەی گوێبیستی بوومە، وەك پێویست نییە، نەك هەر مێژوو، بابەتەکانی دیکەش.

پ٢٢/ کاتی خۆی بە ئارەزووی خۆت چووبوویتە بەشی مێژوو؟

و/ لەبەر ئەوەی(من بە پیری هاتمەوە بەر هەویری)، بۆیە تا ڕادەیەك بە ئارەزووی خۆم بوو.

# دەرئە نجامەکانی جەنگی ناوخۆی ئەمریکا ( ١٨٦١ – ١٨٦٥ )

حوسێن ئیسماعیل خان دەلۆ

## پێشەکی

جەنگ یەکێك لەو دیاردە نەخواستراو و قێزەوننانەیە کە کاریگەری و کاردانەوەی لەسەر سەرخان و ژێرخانی کۆمەڵگا دروست دەکات، مرۆڤەکان دەهارێ و ئابووری ئیفلیج دەکات و خاپوور و کاولکاری و وێران و هەتیووباری و بێوەژنکۆشی و کەمئەندام بوونی مرۆڤەکان لە دوای خۆی بەجێدەهێڵێ و قوتابخانە و فابریقە و کارگەکان دەداخات، کێڵگەکان لەبەرهەمهێنان پەکیان دەخات و ژیان بەرەو تاریکی راپێچ دەکات و... هتد.

جەنگی ناوخۆی ئەمریکا بۆمبێکی تۆقیتکراو بوو هەر لەسەرەتای نووسینەوەی دەستوور و دامەزراندنی یەکەمین حکومەتی یەکگرتووی ویلایەتەکانی ئەمریکا خۆی بۆ تەقینەوە ئامادە کردبوو، خۆ مەڵاسدانی ویلاتەکانی باشوور بەمەرامی بەرژەوەندیخوازی خۆیان ئاگرێکی بن کا بوو بۆ دزە کردنی پریشی ئاگر و هەڵایسانی جەنگی ناوخۆ بوون، لە ئاکامیشدا فتیلەی جەنگ گڕی گرت و شەڕەکە قەوما.

بۆ ئایندەی ئەمریکا ئەو جەنگە هەرچەند لایەنە نێگەتیڤەکانی زۆر و زەوەند بوون بەڵام هەندێك دیاردەی پۆزەتیڤی لەگەڵ خۆیدا هێنا و بووە بنەمایەك بۆ تۆکمە وسفت کردنی ریزەکانی ویلایەتەکانی باکوور و باشووری ئەمریکا، خەڵکی ئەمریکا پەند و ئەزموونێکی گرنگیان لێوەرگرت تاکو چیتر بیرۆکەی جوداخوازی

لە زەین و هزری باشوورییەکان سەرهەڵئەداتەوە کە ئەو بیرۆکەیە لەسەردەمی ئەندرۆجاکسۆن کە حەوتەم سەرۆکی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بەزەقی لەخواستەکانی ویلایەتی کارۆلینیای باشوور دەرکەوت بەڵام دوای جەنگی ناوخۆ بڕای بڕ بڕیان بۆ لای بابەتگەلێکی وا نەدەچوون.

لەم لێکۆڵینەوەدا دەمەوێت تیشك بخەمە سەر هەندیك لە لایەنی دەرئەنجامە باش و خراپەکانی جەنگی ناوخۆی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە نێوان ساڵانی (١٨٦١ – ١٨٦٥)،کە تاکو رادەیەك بە هەردوو لادا کاریگەری خۆی بەرجەستە کردبوو،کە لەپاش جەنگ گیانێکی نوێ کرایە جستەی جیهانی نوێەوە و کاردانەوەیەکی وای لێکەوتەوە هەموو ئەمریکایەك تەواوی وزە و تواناکانی بەگڕ بخات بۆ ئەمریکایەکی بەهێز و یەکگرتوو.

ئەم توێژینەوەیە شەن و کەوی بابەتگەلێکی دەرئەنجامەکانی جەنگی ناوخۆی ئەمریکا دەکات کە لە دوو بەش و چەند باسێك پێکهاتووە بەم شێوەیە : (بەشی یەکەم : کاریگەری سیاسی و ئابوورییەکانی جەنگ : ا– بەرپا بوونی جەنگ، ب – کاریگەرییە سیاسیەکان، ج – رەنگدانەوەی جەنگ لەسەر بارودۆخی ئابووری، د – ویرانکاریەکانی جەنگ ) (بەشی دووەم : کاریگەرییە مرۆییەکانی جەنگ ا – زیانە مرۆییەکان، ب – بارودۆخی گوزەرانی کۆیلە پاش جەنگ، ج – بنیاتنانەوەی پاش جەنگ، د –پێشکەوتن لەرووی کۆمەڵایەتیەوە ) هەروەها دەرئەنجام و لیستی سەرچاوەکان لەخۆ دەگرێت.

بێگومان ئەم لیکۆلینەوەیە لەهەڵە وپەڵە بەدەر نییە بەڵام هیوادارم هەندێك راستی مێژوویم خستبێتە بەر چاوی خوێنەرانی ئەم بابەتە.

## بەشی یەکەم : کاریگەر سیاسی و ئابوورییەکانی جەنگ

### ا- بەرپا بوونی جەنگ :

لە١٨٦١/٤/١٢ یەکەمین چەخماخەی شەڕی ناوخۆ لە ویلایەتی کارۆلینیای باشوور روویدا سەبارەت بە وەی هەندێك ویلایەتاکانی باشوور جیابوونەوەی خۆیان لە یەکێتیەکەی ویلایەتە یەکگرتووەکان راگەیاند بوو، ئەو جەنگە تاکو ١٨٦٥/٤/٩ خایاند کە بە خۆ بەدەستەوە دانی (رۆبرت ئی لی ) لە ڤێرجینیا کۆتای بە جەنگی ناوخۆی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا هات[1]، بەکۆتای جەنگ قۆناغێکی نوێ و وەرچەرخانێك لە تەواوی بوارەکانی ژیانی ئەمریکایەکان هاتە ئاراوە.

شەڕی ناوخۆی ئەمریکا (١٨٦١-١٨٦٥)کە بەهۆی چەند هۆکارێکی ئابووری و کۆمەڵایەتی و کارگێرییەوە ڕوویدا، لەم جەنگەدا زیاتر لە شەش سەد هەزار کەسی ئەمریکی بوونە قوربانی و خوێنێکی زۆری تێیدا رژا، هەروەها زیانێکی گەورە لەلایەنی بەشەری و ئابووری و دۆخی ژیان و گوزەرانی ئەمریکییەکان کەوت وایکرد ئەمریکییەکان پەند و عیبرەتی مەزنی لێ وەربگرن و ببێتە وانەیەکی گرنگ وپڕ ئەزموون بۆ وەچە و نەوەی داهاتووی دوای جەنگ[2]، بەهۆی تێکشکانی هێزەکانی باشور لەبەردەم هێزەکانی باکور بووە هۆی خاپوور و لەناوچوونی خاوەن کێڵگەکان و ئازاد بوونی کۆیلەکان[3]، کە لەدوای ئەو مێژووە بەکردەنی نەخشی باش و ئەرێنی لە رێڕەوی سیاسەتی ناوخۆ و دەرەوەی ئەمریکادا رەنگ رێژ بوو.

لەم جەنگەدا ویلایەتەکانی باکور لەرێگای هێزی سەربازییەوە توانیان گرەوی شەڕ و سەرکەوتن ببەنەوە و دەست بەسەر ویلایەتەکانی باشووردا بگرن و بەزەبری چەك و سوپا و هێز و لولەی تفەنگ ملکەچیان بکەن، جۆرە

دیکتاتوریەتێکیان بەسەر ویلایەتەکانی باشووردا سەپاند و هەروەها بێبەشکردنی شۆڕشگێڕانی ئەو ویلایەتانەی باشور بەوەی کە مافی دەنگدانیان نەبێت و لەبەرامبەردا مافی دەنگدانیان بە کۆیلەکاندا ئەمەش پتەو کردنی دەسەلاتی تەواوی ویلایەتەکانی باکور بوو بەسەر باشووردا [٤] سەپاندنی ئیرادەی خۆیان بەسەر تێکشکاوەکانی جەنگدا، تەواوی هاوکێشە سیاسییەکان لە بەرژەوەندی ویلایەتەکانی باکووردا بوو.

شەڕی ناوخۆی ئەمریکا چەند ئەنجامێکی لێکەوتەوە کە هەندێکیان بەسوود و بایەخدار و هەندێکی دیکەشیان زیانبەخش و نێگەتیڤ بوون، لەلایەکەوە شەڕ کۆڵەگەکانی یەکیەتی قایم و ڕێکەوتنێکی پتەوی دروست کرد، لەولاشەوە کۆمەڵێك گیروگرفتی کۆمەلایەتی و ئابووری و دەروونی زۆری بەدوای خۆیدا هێنا، کە پێویستی بە گیانی لێبوردەی و سەرکردایەتیەکی لێهاتوو کارامە هەبوو بۆ ئەوەی ئەم برینانە سارێژ بکات و شێوەیەکی واقعی و نۆرماڵ بەراگەیاندنی ئازادی کۆیلەکان بدات [٥]، گەڕانەوە بۆ ڕەووشی ئاسایی و نورماڵ لە پێکەوە ژیان و پێکەوە هەڵکردنی سیاسیانەدا مەحاڵێکی گەورەبوو کە بە هەوڵ و هیمەتی سەرۆك و سیاسەتمدارانی ئەو وڵاتە بە ماوەیەکی زەمەنی کورت خایەن توانیان دۆخەکە بخەنە سەر سکەی بەرەو پێشچوونی خۆی و بەخێرای ڕەورەوەی پێشکەوتن بەرەو پێش بجوڵێنن و هەتوانی بیرنەکانی شەڕی ناوخۆ بکەن.

### ب – کاریگەرییە سیاسییەکان :

کاریگەری جەنگی ناوخۆی ئەمریکا لە لایەنی سیاسیەوە، دیارترین شت لە سیاسەتی سالآنی پاش جەنگ ئەوە بوو کە سیاسەتێکی بێ کەڵك بوو واتا کاریگەری نەبوو، دەسەلاتی (گرانت ) تووشی کەم و کورتی و گەندەڵی بوو،

لاوازی حیزبایەتی دەرکەوت، هەروەها بۆ ماوەی پەنجا ساڵ هیچ کەس لە ویلایەتەکانی باشوور نەبوونە سەرۆك كۆمار، ئەو ئاوەدانكردنەوەیەی کە ئەنجامدرا بووە هۆی ئەوە پێگەی كۆمارییەکان لە دەسەڵاتدا بەهێز بکات [٦]، کاریگەرییەکانی دوای جەنگ بەزەقی دەرکەوت و جیاوازییەکان لەنێوان باکوور و باشوور پەیڕەوی لێدەکرا، هەرچەند پێشتر بەشێوەی ململانێ و کێشمەکێشمی دەستوورییەوە بوو بەڵام جەنگ کردیە دیفاکتۆیەك و پێویستی گوێ ڕیاڵ و مەلکەچ بوونی باشورییەکان بۆ باکورییەکان بوو.

گەلێك لەو خەڵکانە تووشی دەمارگیری بوون، بە تایبەت لە مەسەلە سیاسییەکاندا، بە جۆرێك تادوای تێپەڕبوونی بیست ساڵ بەسەر جەنگدا هیچ یەکێك لە دیموکراتەکان نەیانتوانی بچنە (کۆشکی سپی)ەوە [٧]، کە لە خۆیدا ڕەنگدانەوەی ناوچەگەریەتی و هەڵگری مۆرکی باکور و باشوری بوو.

ئەو سیاسەتەی پارتی كۆماری لەباکورییەکان ئاماژەیان پێدەکرد بەدیهات و بەرژەوەندیکانیان زامن و مسۆگەر بوو، لەماوەی ئەو چوار ساڵەی جەنگدا، باجە گومرگیەکان سەر لەنوێ دانرانەوە بە برِ و ڕێژەیەکی زۆر بەرز، بە جۆرێك لە پێشتردا نەگەیشتبووە ئەو ڕێژەیە، بەمە بازرگانی ئازاد کە دیموکراتەکانی باشوور داوایان دەکرد، بووە مەسەلەیەکی مردوو، مەسەلەیەکی تر هەر لە ڕۆژانی (هاملتون و جیفر سۆن)ەوە قسەی لەسەر دەکرا لەلایەن پیاوانی سیاسیەوە، مەسەلەی دانانی سیستمی بانکی نیشتیمانی بوو [٨] ئەویش بەکامی دڵی باکوورییەکان جێبەجێ کراو ڕێگا و ئاستەنگەکانیان لەبەردەمدا تەخت بوو.

دروست بوونی هەندێك جیاڤات و ڕێکخراوی پیشەی کاریگەری لەسەر ڕەوشی سیاسی و گوزەران و باری كۆمەڵگا هەبوو لەسەروەختی جەنگدا سێ ڕیکخراوی کرێکاری دامەزران کە یەکەمیان سەندیکای پیشەوەران بوو کە نوێنەرایەتی

دەرفـەتی کاریـان دەکـرد ( Kinghits of Labor) وە دووەم سـەندیکای خـاوەن پییـشە و یـەکێتی سـەندیکا پیـشەوەرەکان کـە نوێنەرایـەتی کرێکـارانی ئـەمریکای فیـدراڵی دەکـرد( American Federation of Labor) سێیەمیان کۆمەڵەی کرێکارە سۆسیالیستیی رادیکاڵی و شۆرشگێرپیەکان بـوو کـە زۆر بەبایەخ نەبوو هەرچەند رژد بوون لەسەر مانەوەیان[9]، پەکخستنی سیاسەتی دیموکراتـەکان وای کـرد زاڵ بـوونی بـیر و ئـاوەزی کۆمارییـەکان بـە پراکتیکـی و کردەنیی خۆی نمایش بکات و لە تەواوی کایـەکانی دەسـەڵاتدا بەرجەسـتە ببێـت بەرژەوەندییەکانی خۆیان فەراهەم و بەرکەماڵ بکەن.

### ج – رەنگدانەوەی جەنگ لەسەر بارودۆخی ئابووری:

گرفتی دارایی سەرەکی ترین ئاستەنگ و گرفت بوو، خەرجیە حکومیەکان ئەو جەنگە سنووری ئەو خەرجیەی بەزاند کە ئەمریکا لە سـەربەخۆبوونیەوە تـا ئـەم مێژووە بەخشیبووی، کارێکی ئاسایی و راستەقینەیە کە باری قورس بەسەرگەلدا بهێنێت گەر سەردەمێکی نموونەی ئەو حاڵەتە رووی نەدابێت لە پێشتردا، کاتێـك (لەنکۆڵن)سەرۆکایەتی بەجێهێشت خەزێنەی ولآت چۆڵ چۆڵ ببوو، حکومەت بـۆ ئەوەی سەرمایەی دەست بکەوێت پێویستیەکانی دابـین و جێبـەجێ بکـات رووی کـردە سـێ سەرچـاوە(دانـانی بـاج و دەرکردنـی دراو و هانـدانی قـەرز) بـاج بەشێوەیەکی گـشتی یاسـا گومرگییـەکان بـوو، رێـژەی گەیـشتە چـل و حـەوت لەسەدی نرخی پێویستیەکان، ئەم رێژە زۆرە لەرابردوودا سەرشانی گـەلی قـورس نـەکردبوو، لـەدوای ئـەم باجـە بـاجێکی دیکـەی بەشـوێندا هـات ئـەویش لەساڵی(١٨٦١) باجی دەسکەوت و بەروبووم بوو، سەرچـاوەی دووەم دەرکردنـی دراو سـوودێکی زۆری نـەبوو بـەراورد بـەوەی حکومـەت دەیویـست و خواسـتی

بوو،چونکە لەسەر بنەمای بەهاداری تایبەتمەند نەبوو، بۆیە بەهاکەی سووك و کەم بایەخ و نرخەکان بەرز بوونەوە لە ئەنجامدا تێکچوون کێشە کەوتە سیستەمی دارای، بەڵام قەرزەکان سەرچاوەیەکی گرنگ بوون لە بەدیهاتن و چارەسەری سامان و سەروەتی حکومەتدا، بۆ برەودان و هاندانی ئەم قەرزانە و نەهێشتنی پشێوی دارایی لە وڵاتدا حکومەت پەنای بردە بەر ڕێکخستنی بانك و سەرپەرشتی کردنی ڕاستەوخۆی و یاسایەکی لەو بوارەدا داڕشت لە ساڵی (١٨٦٣)ز بەردەوامی وەرگرت و بنچینەی سیستەمە بانکەکانی ئەمریکایە [١٠]، خەرجەکانی جەنگ زۆروزەوەند بوون و کێڵگە و مەزراکان لەکار کەوتن بازرگانی راوەستاو فابریقە و کارگەکان پەکیان کەوت.

سەرباری ئەوەش باروذۆخی ویلایەتەکانی باشوور زۆر خراپ بوو، سەرچاوەیەکی گرنگی سەروەتەکانی لەدەست چوو ئەویش ڕەش پێستەکان بوون ژمارەیان دەگەیشتە چوار ملیۆن و ونرخەکانیان دوو ملیۆن دۆلار مەزەندە دەکرا، ئەم ڕەش پێستانە هۆکاری سەرەکی بەرهەمهێنانی کشتوکاڵی بوون لە کێڵگەکاندا، جگە لەوەش بەهۆی ئەو گەمارۆ دەریاییەی خرابووە سەر کەنارەکانی باشوری ئەمریکا لەلایەن هێزە دەریاییەکانی باکورەوە وە ناردنی بەرهەمی لۆکە بۆ دەرەوە وەستێنرابوو، ئەمەش وایکرد نرخی ئەو بەرهەمە دابەزێت [١١].

ولایەتەکانی باشور زیانێکی ماڵی زۆریان لێکەوت ، چونکە ئەو سەر زەوی و خاکانە بوونە مەیدانی شەڕ و شۆڕەکان لەڕووی ئابووریەوە زیانێکی بێ سنوور بوو، کارۆلینای باکور و باشور مەزرای کێڵگەکانیان لەدەست چوو، چونکە ئاوی شۆر کێڵگە و مەزراکانی گرتبۆوە لەکاتی شەڕدا ویلایەتی لویزیانا پیشەسازی شەکری تێدا نەما، پەموو کە جاران پێی دەوترا زێڕی سپی نرخەکانی دابەزی

چونکە بۆ دەرەوە نەدەنێردرا، دوای شەڕیش بازاری بۆ پەیدا نەدەکرا، دوای ئەوەی بەریتانیا جێگای دیکەی دۆزیەوە پەمووی لێی هاوردە دەکرد، وەکو (هیند و میسر) [١٢]، ئەمەش قەیرانیکی بازرگانی و ئابووری بەدوای خۆیدا پەلکێش کرد و ئەوەندەی تر گۆمەکەی قوڵ تر کردەوە.

سەرباری ئەوەش بارودۆخی ویلایەتەکانی باشوور زۆر خراپ بوو، سەرچاوەیەکی گرنگی سەروەتەکانی لەدەست چوو ئەویش ڕەش پێستەکان بوون ژمارەیان دەگەیشتە چوار ملیۆن و ونرخەکانیان دوو ملیۆن دۆلار مەزەندە دەکرا، ئەم ڕەش پێستانە هۆکاری سەرەکی بەرهەمهێنانی کشتوکاڵی بوون لە کێڵگەکاندا، جگە لەوەش بەهۆی ئەو گەمارۆ دەریاییەی خرابووە سەر کەنارەکانی باشوری ئەمریکا لەلایەن هێزە دەریاییەکانی باکورەوە وە ناردنی بەرهەمی لۆکە بۆ دەرەوە وەستێنرابوو، ئەمەش وایکرد نرخی ئەو بەرهەمە دابەزێت، ئەو گەمارۆ دەریاییەی خرابونە سەر کەنارەکانی باشوری ئەمریکا لەلایەن هێزە دەریاییەکانی باکورەوە ناردنی بەرهەمی لۆکە بۆ دەرەوە وەستێنرا بوو، چەند گیروگرفتێکیان هاتە پێش ئەویش بریتی بوو لەوەی کە پارەیان نەبوو بۆ چاندنی کێڵگەکان و کڕینی ئامێرە کشتوکاڵیەکان بۆیە بڕێك پارەیان بەقەرز لە لەبازرگانەکان وەردەگرت و دواتریش ناچار دەبوون بە بەنرخێکی کەم بەرهەمەکانیان بەوان بفرۆشنەوە بەمەش زیاتر کاریگەری ئابووری لەسەر ئەوان ڕەنگدانەوەی هەبوو [١٣]، هەرچەندە جەنگ ژێرخانی ئابووری ئەو وڵاتەی داروخاند، بەڵام پاش جەنگ بەگۆڕوتینێکی زۆرەوە کار بۆ بنیاتنانەوەی ژێرخانی ئابووری ئەو وڵاتە کرا کە بەشێوەیەك پەرەسەندنی ئابووری بەرچاو هاتە ئاراوە.

کاریگەرییەکی تری جەنگ لەسەر لاوازی و داڕووخانی ئابووری ویلایەتەکانی باشور، کەم بوونەوەی دەستی کاری پێویست بوو لە کێڵگەکانی قامیشی شەکر و توتن و لۆکە[١٤]، لەڕاستیدا تێوەگلانی خەڵکی ئەمریکا بەم جەنگە وێرانەوە کە ئابووری وڵاتی شڕ و وڕ کرد و کوشتارێکی زۆری خستە نێوانیانەوە تا چەند نەوەیەك و زیانێکی گەورە و تاقیکردنەوەیەکی ترسناکیش بوو بۆ ئەمریکا[١٥] هەرچەندە بووە خاڵی وەرچەرخان و قەڵەمبازێکی گەورە بۆ داهاتوو و ئایندیەکی ڕۆشنتر.

هەر لەدوای جەنگی سەربەخۆیەوە پرسی پاراستن خرایە روو کە ئامانج لەوەش بەهێز کردنی سەربەخۆی سیاسی بوو کە وڵات لەو رێگەیەوە بتوانی پێداویستیەکانی خۆی فەراهەم بکات، کە کاری پاراستنی گومرك و پاراستنی کارگەکانی ئەمریکا بوو لەو باجە بەرزانەی دەخرایە سەر کاڵا هاوردەکانی ئەورووپا، دانیشتوانی باشور کاری کشتوکاڵیان دەکرد بەرهەمەکانیان رەوانەی دەرەوە دەکرد و لەبەرامبەردا کەلوپەلی دروستکراوی ئەورووپایان دەکڕی، ئەمەش بەهۆی بەرزی تعریفە گومرکییەکانەوە نرخەکانیان بەرز بووەوە [١٦] کە لەنگییەکی زۆری لە بابەت و مەسەلە بازرگانیەکاندا دروست کرد بوو.

بەمەش ئابووری ویلایەتەکانی باشور بەرەو لاوازی دەڕۆیشت بەهۆی ئەوەی بەرهەمی لۆکە سەرچاوەیەکی سەرەکی ئەو ئابوورییە بوو، کێڵگە بچووکەکانی کشتوکاڵ تارادەیەك لەچاو کێڵگە گەورەکاندا زیانیان بەرنەکەوتبوو بەڵام چەند گرفتێکیان هاتە بەردەم ، ئەویش ئەوەبوو جوتیارە بچووکەکان پێویستیان بە پارە هەبوو بۆ چاندنی زەوییەکانیان و کڕینی ئامێرە کشتوکاڵیەکان، بۆیە بڕێك پارەیان بەقەرز وەرگرت لە بازرگانەکان دواتریش ناچاربوون بەنرخێکی کەم بەرهەمەکانیان هەر بەو بازرگانە بفرۆشنەوە، بەمەش کشتیارەکان هیچ

سەرچاوەیەکی بە نرخیان نەما لەئابووریدا پشتی پێ ببەستن[١٧] داتەپینی ژێرخانی ئابوری ویلاتەکانی باشوری لێکەوتەوە، لەهەمان کاتدا کاریگەری جەنگ لەسەر تەواوی کایەکانی ژیان و گوزەرانی خەڵکی ئەمریکا هەبوو.

د – وێرانکارییەکانی جەنگ :

بێگومان جەنگی ناوخۆی ئەمریکا لایەنی پۆزەتیف و نێگەتیفی هەبوو، ئەمەش بۆخۆی سروشتی جەنگەکەیە، لایەنە نێگەتیفەکان ژمارەیەکی زۆری خەڵك لە ناوچوون و ئەرکێکی گران و قەرزێکی زۆری لەدوای خۆی بەجێهێشت، ئەمە جگە لە نەهامەتی و ماڵ وێرانی و ئاوارە بوون و ڕووخانی ئابووری وڵات. هەروەك وێرانکاری یەکی گەورەی لە ویلایەتەکانی باشوری ئەمریکادا بەجێهێشت، چونکە ببوونە گۆڕەپانی جەنگ و کرداره سەربازییەکان، ئەو کاولکارییەی لە ئاکامی جەنگ کەوتبووە و بەجۆرێك لە مێژووی ئەمریکادا وێنەی نەبوو، ڕێگاکانی گواستنەوە و پردەکان وێران کرابوون هێڵەکانی ئاسنین لە ناوبرابوون، بۆ نمونە لە ساڵی ١٨٦٥ پاش ئەوەی شاری (کۆلۆمبیا)ی پایتەختی(کارۆلینای باشوور)، لەسەردەستی سەربازانی سوپای فیدراڵی بەسەرکردایەتی (جنراڵ شێریان)دەستی بەسەرداگیرابوو شارەکە وێران کرابوو بەشێکی زۆری سوتێنرا[١٨]، وێرانکارییەکان تاکو چەند دەیەیەك شوێنەوار و ئاسەواری مابووەوە.

بەشی دووەم : کاریگەریە مرۆیەکانی جەنگ

**ا – زیانە مرۆییەکان :**

شەڕە ناوخۆیەکانی ئەمریکا زیاتر لە چوار ساڵی خایاند جگە لەو کوژراوە زۆروزەبەندانە بەسەدان هەزار بریندرا و وون بووی لێکەوتەوە و گورزێکی گیانی و مرۆی سواندە دانیشتوانی ئەمریکا، زیانێکی زۆری گەیاندە گەلی ئەمریکی سەرەڕای بەهەدەر چوونی سامانێکی زۆر[٣]،کە پاشەوپاش ئەمریکا گەڕاندەوە بۆ کاتی سەرلەونوێ دامەزراندنەوەی حکومەت، ژمارەی کوژراوانی باکور گەیشتە(٣٦٠٠٠٠)کەس لەو ملیۆن سەربازی بەشدارییان لەشەڕەکاندا کرد،باشورییەکان زیانیان نزیکەی (٢٥٠٠٠٠)کوژراو بوو، بەواتای سێ یەکی سەربازەکانی ئەو سەردەمە بوونە قوربانی و زیانی گیانی بەر ئەمریکا لە شەڕی ناوخۆدا کەوت، بەقەد زیانەکانی بوو لەشەڕی یەکەمی جیهاندا[١٩]ئەم ژمارە زۆرە و زیانە بەرچاوە زۆر لە سەردەمی جەنگی سەربەخۆی ئەمریکا زیاتر بوو، برینەکان قوڵتر و ئازارەکان بەسوێتر بوون و تەنگوچەڵەمەکەکان زۆرتر و پڕگێرمە و کێشە بوون.

هەروەها سەبارەت بە دەرئەنجامی جەنگی ناوخۆی ئەمریکا لە سەرچاوەیەکی دیکەدا بەم شێوەیە ئاماژەی پێ دەکات، سەبارەت بە ژمارەی کوژراو و بریندارو تێچووەکانی جەنگی نەهێشتنی کۆیلایەتی لە ئەمریکا : مێژوونوسانی سیاسی، وای هەژمار دەکەن کە زیاد لە (١٢٠) هەزار کەس لە جەنگدا کوژراون (٦٤) هەزاری دیکە بە برینداری مردوون و زیاد لەمانەش ژمارەی ئەو کەسانەی لەکاتی جەنگ و ڕوو بەڕوو بوونەوەدا لە سوپای هەردوولا و خاکی هەردوولا بە نەخۆشی نیکاف ئاوڵە گیانیان لەدەستدا زیاتر لە

(١٨٧) هــەزار کــەس مەزەنــدە دەکرێــت ئەمــە کوشــتنی کۆیلــەکان بــوو[٢٠] کویلاکانیش بەناچاریەوە گلابوونە جەنگەکەوە کە زیانی زۆریان بەرکەوتبوو.

سـەبارەت بەدەسـتی کـار کـە یـەکێك بـوو لـە پێداویـستیەکانی وەبـەرهێنانی زەوی و گــەڕان بــەدوای سەرچــاوە سروشــتیەکاندا بــەهۆی کۆچــکردنەوە لــە ئــەوروپاوە بـۆ ئـەمریکا فەراهــەم و زۆر بـوو کـە لـە ڕێگـای شـارەزایانی بـواری پیشەسازیەوە کە پیویست بوو وڵات پێشکەوت ئەوانـەی کـە هـاتبوون لـە نێـوان ساڵانی ١٨٧١ تاکو ١٨٨٠ ژمارەیـان دەگەیـشتە ملیۆنێـك و هەشـت سـەد هـەزار کەس کە سەرەتا لە ویلایەتەکانی ڕۆژهـەڵات دادەبـەزیت دواتـر بـە ویلایەتەکانـدا پەرش و بڵاو دەبوونەوە[٢١].

**ب – بارودۆخی گوزەرانی کۆیلە پاش جەنگ :**

لـەنکۆڵن سـەرۆکی ئـەو کاتـەی ویلایەتـە یـەکگرتوەکانی ئـەمریکا لـە ٢٢ دیسمبەری ١٨٦٢ رایگەیاند هەموو کۆیلەکان لە تەواوی ویلایەتـە رزگارکراوەکـان ئەو ناوچـانەی کـە دەکەونـە بـن دەسـتی ئـازاد دەکـرێن کـە لەسـەرەتای مـانگی ینایری ١٨٦٣ هەندێك لە ویلایەتـەکان لـە ڕێگـای ئەنجومـەنی نوێنەرەکانیانـەوە یاساکانی ئازاد کردنی کۆیلە کاری پێکرا[٢٢].

جەنگی ناوخۆی ئەمریکا سەبارەت بە ژیانی ئـابووری و کۆمەڵایـەتی زیـانێکی گـەورەی لـە ئـابووری ئـەمریکا دا، چـونکە بـووە هـۆی ئـەوەی کـە بـەریتانیا و فەرەنسا کە پێشتر لە ئەمریکا شتومەکیان هاوردە دەکرد ، بەڵام بەهۆی شـەڕی ناوخۆی ئەمریکا ناچاربوون ڕێگایەکی دیکە بدۆزنەوە کە شتومەکی لـێ هـاوردە بکـەن[٢٣] ئەمــەش بـووە هـۆی کەڵکـە بـوونی بەرهــەمی نـاوخۆوە بـەهۆی کـەم ڕەواجیەوە و کێرڤی ئابووری وڵات بەرەو نزمی دەکشا.

یەکێك لە دەرئەنجامەکانی تری ئەم جەنگە، ئازاد کردنی زیاتر لە (٣)ملیۆن ڕەش پێست بوو لە کۆیلایەتی،بەلاَم بارودۆخی ئابووری و کۆمەلاَیەتی و سیاسیان بڕیاری لەسەر نەدرابوو بێ بەش بوون لە چێژ وەرگرتن لە یەکسانی کۆمەلاَیەتی لەگەڵ سپی پێستەکانی ویلایەتەکانی باشوردا، لەڕووی ئابوورییەوە بارودۆخیان زۆر خراپ بوو بۆیە بەناچاری چوونەوە ژێر دەستی خاوەنەکانیان و پارچەیەك زەویان وەرگرت لەخاوەن زەویەکان، بەرامبەر بە بڕێك پارە ، ئەمەش جۆرێکی تر بوو لە چەوساندنەوەی مرۆڤایەتی، لەم بارودۆخەدا رەش پێستەکان لەبری ناوی (کۆیلە) ناوی (خزمەتکار)یان لێ نراو هەروەك لە پێشتر لەبەرە بەیانەوە تا خۆرئاوا کاریان دەکرد و تەنانەت ڕوو بەڕووی سزادانی توندیش دەبوونەوە[٢٤]، هەرچۆنێك بێت هەنگاوێکی دەستپێك بوو بۆ دەستەبەر و فەراهەمکردنی مافە سەرەتاییەکانی رەش پێست و کویلەکان.

ئەمە جگە لەوەی چەندین ڕێکخراوی نهێنی لە باشوردا دامەزرا بوون، وەك ڕێکخراوی (کوکلوکس کلان)، کە بەشێکی زۆر لە سەربازو ئەفسەرەکانی سوپای پێشووی باشوری لە خۆگرتبوو، چەندین کاری توندو تیژی و کاری تیرۆریان دەکرد لە دژی ڕەش پێستە ئازادبووەکان[٢٥]، تاکو بەمافەکانیان نەگەن بە کۆیلەی بمێننەوە.

باشورییەکان بارودۆخی ئابووریان زۆر خراپ بوو سەرچاوەیەکی گرنگی سەروەتە و سامانەکانیان لە کیس چوو ئەویش کۆیلە رەش پێستەکان بوو کەژمارەیان دەگەیشتە چوار ملیۆن و نرخەکانیان بە دوو ملیار دۆلار مەزندە دەکرا، ئەم رەشپێستانە هۆکاری سەرەکی بەرهەمهێنانی کشتوکاڵ بوون لە کێڵگەکاندا[٢٦] تاکو رادەیەك بەرهەمی کشتوکاڵی لەو ئان و ساتەدا لە پاشەکشە کردندا بوو.

سەرەڕای ئەوەی ساڵی ١٨٦٥ سەرۆك لەنکۆڵن کۆتایی بە کۆیلایەتی هێنا لە ئەمریکا دا، بەلاَم جیاکاری نەژادی بەرامبەر بە رەش پێستەکان سەدەیەکی تریشی خایاند لە چوارچێوەی ئەم جیاکارییەدا، رەش پێستەکان لە بێکاری و ئەو پەڕی هەژاری دەژیان ،لە زۆربەی ویلایەتەکانی ئەمریکادا دەرگای شوێنە گشتییەکان بە ڕوویان داخرابوو، لەو شوێنانەدا سپی پێستەکان خۆیان لە رەش پێستەکان جیا دەکردەوە[(٢٧)].

لە چواری نیسانی ساڵی (١٨٦٥) ئەبراهام لەنکۆلن وەك پەیامی ئازادی بۆ کۆیلەکان چووە ڕشت مۆندەوە و لەگەڵ بەخێر هێنانی و پێشوازی کردنێکی بێ وێنە لە ئەزموونی ئەمریکادا، پیاوێکی کۆیلەی ڕەش پێست وەك هەڵوێستێك بۆ دەربڕینی شادی ستایشی لنکۆڵن کڕنۆشی بۆ سەرۆك کۆماری ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا برد، بەلاَم نەك لەنکۆڵن ئەم کاردانەوەی بەشیاو نەزانی بەڵکو گوتی : ( کرنۆش بۆ من مەبە، پێویستە تۆ تەنها بۆ خودا کرنۆش بەریت سوپاسی ئەو بکەیت بۆ ئازادی بوونت )[(٢٨)]ئەمەش کویلەکان سەرەتای هەستکردن بە مرۆڤ بوونی خۆیان بوو.

ئەمریکییەکان کۆیلەکانیان لەدەستدا نرخیان بە دوو ملیار مەزەندە دەکرێ،ئەو کۆیلانە ئازادییان بۆ خۆیان گەڕاندەوە بێ بەرامبەر، کە دەیان ساڵ بە کۆیلەی مابوونەوە، سامان وپارە و سەنەدەکانی هاوپەیمانی ویلایەتەکانی باشور نرخیان نەما [(٢٩)] ئیتر بەشێك لە کویلەکان بۆ خۆیان کاریان دەکرد و لەژێر رکێفی خاوەنەکانیان دەرچوون.

### ج – بنیاتنانەوەی پاش جەنگ :

جەنگی ئەهلی لە نێوان ویلایەتەکانی باکوور و باشووری ئەمریکا بووە هۆی ئەوەی رەورەوەی پێشکەوتنی ئەو وڵاتە بباتە پێش و بەخێرای سوودیان لە

سەرچاوە و کەرەستە سروشتییەکان وەرگرت و سیستەمی بانکی وەبەرهێنانیان پیادەکرد و بازرگانی دەرەکییان فراوانتر کردەوە و بەخێرای بنیاتی هێڵی ئاسنینیان نایەوە و پیشتگیری داهێنانەکانیان کرد و رووبەرێکی فراوانتریان بۆ کشتوکاڵ و بەروبوومە جووتیاری و کشاوەرزییەکان تەرخان کرد و کە بەشێوەی شۆرشێکی کشتوکاڵی کاریگەری لەسەر بوژاندنەوەی شارەکان هەبوو کە بەهەزاران دەستی کاری خستە ئیش و هەزاران کۆچبەر بۆ کارکردن روویان لەویلایەتە یەکگرتووەکان کرد کە بووە هۆی قەرەبالغ بوونی دانیشتوانەکەی[٣٠] جوڵەی کار و بووژاندنەوەی ئابوری لەدوای جەنگ وای کردبوو هەمیشە خەڵکی لە وڵاتانی دیکەوە روو لەو ناوچەیە بکەن.

بنیاتنانەوەی ویلایەتکانی باشوری ئەمریکا ماوەی دوازدە ساڵی خایاند (١٨٦٥ – ١٨٧٧) کە سێ رێگای لە خۆ گرتبوو : یەکەم : ئەو ناوچەیە دابەشی پێنج ناوەندنی سەربازی کرابوو کە راستەوخۆ دەکەوتنە ژێر چاودێری سەربازی ویلایەتەکانی باکورەوە کە هەر ناوەندێك بەرپرس و تیپێکی سەربازی بۆ تەرخان کرا بوو،دووەم: ئەو سپی پێستانەی کە خەڵکی باشوور بوون و کە لەگەڵ پەسەند کردنی هەمواری چواردەی دەستوردا نەبوون ئەو هەموارە تایبەتە بە یەکسانی کۆیلەکان و گەیشتنە بە مافی رۆژانەی ژیانیان، هەروەها رازی نەبوون لەسەر هەمواری پازدەیەمی دەستور کە مافی هەڵبژاردنی بۆ کۆیلەکان دەستەبەر دەکرد، سێیەم : رێکخستەوەی ئەو کەسانی کە رەنگی جۆراوجور و سپی پیستە هەژارەکان و ئەوانەی بەدوای ساماندا دەگەڕان بۆ ئەوەی کە لە باکور هاتبوون مافی دامەزراندنی حکومەتی نوێیان لە ویلایەتەکانی باشوور پێبدرێت، کاردانەوەی سپی پێستەکانی ویلایەتەکانی باشوور لەبەرامبەر ئەم پرنسیپیانە هەڵسان بە دامەزراندنی کۆمەڵەیەی ( کوکلوکس کلان ) ئەوانەی کە لە

باکورەوە هاتبوون ناچاری گەڕانەوەی دەکردن و نەیان دەهێشت زنجەکان لەبنەکەکانی دەنگداندا بڵاو ببنەوە[٣١] کە ئەوەش پەرچە کردار بوو بۆ بەرگری کردن لە دەستکەوتەکانی خۆیان.

ئەم جەنگە بەشێوەیەکی کاتی سەرکردەکانی شۆڕشی باشووری بێبەشکرد لەمافی هەڵبژاردن و مەڵبەندە حکومیەکانی ویلایەتەکان، جگە لەسەرکردەکان سپی پێست و رەش پێستەکان مافی دەنگدانیان هەبوو بەو پێیەی نوێنەری خۆیان هەڵبژێرن لەئەنجومەندا و لەهەموو ویلایەتەکان هەستان بەدانانی دەستورێکی نوێ مافی رەش پێستەکان لەخۆ بگرێت، کاتێك حکومەتی بەگوێرەی دەستور دێتەدی ئەو کات ئەنجومەنە یاسادانانەکەی هەمواری دەستوری چواردەیەم پەسەند دەکات، ئەوجا شیاوی سەر لە نوێ رۆیشتنە ناو یەکێتی ئەمریکا دەبێت، شیاوە بۆ ئەوەی نوێنەریان رەوانەی هەردوو ئەنجومەنی نوێنەرانی و کۆنگریس بکات[٣٢]ئەمەش پرنسیپی گەشەو نەشونما کردنی ئەمریکایەکی تۆکمە و بەهێز بوو.

لە ساڵی ١٨٦٨ هەریەك لە ئەرکنساس و لویزیانە و ئەلاباما و جۆرجیا و فلۆریدا و کارۆلینیای باشور گەڕانەوە ناو یەکێتیەکە، بەهەمان شێوە لە ساڵی ١٨٧٠ تەکساس و میسیسپی و ڤێرجینیا گەڕانەوە ناو یەکێتی ئەمریکا، بەو شێوەیە رێکخستنی ویلایەتەکانی باشوور سەر لە نوێ رێکخستنە سیاسیەکەی دارێژرا، کۆنگریس متمانەی تەواوی نەبوو ببێتە کۆتای هێنەری کێشەکان بێت بۆیە هەمواری پازدەیەمی دەرکرد کە باس لەوە دەکات هەر کەسێکی ئەمریکی هەڵگری ناسنامەی ئەمریکی بێت، نابێت لەیەن ویلایەتە یەکگرتووەکان یان هەر ویلایەتێك مافی دەنگدانی لێبسنرێتەوە بە بیانووی رەگەز و رەنگ و بارە

کۆمەڵایەتیەکەی، داوای پەسەند کردنی ئەم هەموارەی لە ویلایەتەکان کرد وە ئەم هەموارە رەزامەندی ویلایەتەکانی لە ساڵی ١٨٧٠ وەرگرت[٣٣].

بەسەدەها هەزار کەس بریندار بوون و بەدرێژای ژیانیان لەکارکەوتن، تێچوونی ئەو جەنگەش نزیکەی (١٠ ترلیۆن دۆلار) بوو[٣٤]، ئەو جەنگە بەشێوەیەك خەزێنەی وڵاتی هەڵتەکاند تەنانەت لە جەنگی سەربەخۆی ئەمریکادا باری دارایی ئەو وڵاتە دووچاری ئیفلاس بوونێکی وانەبووەتەوە.

ناشاردرێتەوە حکومەت هەستاوە بەکاری بیناسازی و ئاوەدانکردنەوەی لە هەندێك لە لایەنەکاندا، وەکو دروستکردنی پرد و رێگاوبان و دارشتنی یاسای فێرکردن و دروستکردنی دەزگای خێرخوازی....هتد، بەڵام لە رووە گشتییەکەدا شیاوی دەسەڵات نەبوو، چونکە کەوتبووە گەندەڵییەوە لە رێکخستن و شپرزەیی بەرێوەبردنی داراییدا،هەروەها لە لایەنە ئەکتیف و چاکەکانی ئەوە بوو کۆتایی بە موڵکایەتی (کۆیلایەتی) هێنا و ژمارەی ئازادکراوەکان چوار ملیۆن کەس بوو، بووە مایەی یەکگرتنی نەتەوەی ئەمریکا بە باشوور و باکوورییەوە، هەروەها پۆل پۆل یەکتریان دەهاری و ئاشتی کە نێودەبراو وێرانکاری دەخستەوە و رووە جوانەکانی یەکبوونی لە نێو دەبرد و لاوازی جێگرەوەی هێز دەبوو[٣٥].

هەڵەیە گەر گومان بکرێت بەوەی مافی دەنگدان لە باشووردا لەسەر رێسایەکی یەکسانی نێوان دانیشتوان بەرێوەدەروات هەروەك ئەوە حاڵەتی باکووریشە، دەبێت بوترێت یەکسانی رەها لە وولاتەکان و لە نێوان سپی و رەش پێستدا لە واقیعدا بوونی نییە، لە رووی پایەی ئابوورییەوە رەش پێستەکان لە دوای هەموو چینەکانەوەن، تێکەڵاوی لە نێوان هەردوو رەگەزدا زۆر وون و بێ بوونە[٣٦] کە بەزەقی ئەو جیاوازی و جیاکاریانە بەدی دەکرا.

**د –پێشکەوتن لەرووی کۆمەڵایەتیەوە :**

ئـەم جەنگـە ڕق و کینـەی لـە دڵـی هـەر یـەك لـە بـاکووری و باشـوورییەکان درووست کرد و بۆ ماوەی چەند نەوەیەك هەر کاریگـەری مایـەوە[٣٧] بـەلاَم گـەلی ئەمریکا لە پاشـە ڕۆژدا کـەڵکی زۆریـان لیَ وەرگـرت چـونکە لـەم جەنگـە پەنـد و وانەی باشیان دەسگیربوو، گرێدان و پەیوەندی نێوانیـان بـەهێزو وپتـەو تـر بـوو بەجۆرێك زۆر لە پسپۆڕانی مێژوو ئەم جەنگە و زالَ بوونی ئەمریکییـەکان بەسـەر ئەم ئاژاوە ناوخۆی و لۆکاڵییە بەسەرەتای لە دایـك بـوونی نەتـەوەیی ئـەمریکا و کۆماری نوێی فیدراڵی دادەنـێن لـە جیهـانی نوێـدا[٣٨]، کـەوای کـرد ئەمریکایـەکی بەهێز و شکۆدار لە دوای جەنگی ئەهلییەوە لەدایك بیت و بتوانن برینەکان سارێژ بکەن.

باشـوری ئـەمریکا، ژمارەیـەکی زۆر لـە پیاوانیـان کردبـوو بـە سـەرباز لـە شـەڕەکاندا، ژنـان هەسـتان بەئەنجامـدانی چـەند ئـیش و کارێـك کەپێـشتر نەیانکردبوو، ژمارەی مامۆستا ژنـەکان زیـادبوو بـە جۆرێـك لـە سـاڵی (١٨٦٠) دا ژنان نزیکەی چواریەکی مامۆستایانیان پێك دەهێنـا، بـەڵام لـە سـاڵی(١٨٧٠) دا سـیَ یـەکیان پێکـدەهێنا، هـەروەها لـە سـاڵەکانی دوای جەنگـدا ژنـان بـەرەو مینبەرەکان بەڕێکەوتن بۆ گفتوگۆکردنی ئەو بابەتانەی تایبەتن بە ژنانەوە، وەك مافی هەڵبژاردن و کـارکردنی ژن. هەندێك لـە ژنـان، بەتایبـەتی ئەوانـەی بروایـان بەیەکسانی نێوان هەردوو ڕەگەزی نێرو میَ هەبوو،ئەم جەنگەیان کردە هۆکارێك بۆ بەدیهێنانی ئامانجەکانی خۆیان،(کلارا بارتون ) دامەزرێنەری (خاچـی سـووری ئـەمریکی) بـوو لـەکاتی جەنگـدا لـە سـاڵی(١٨٨٨ن) سـەبارەت بـەژن دەڵێـت: (لەکۆتایی جەنگدا، ژن بۆماوەی پـەنجا سـالَ لـەو بـارە سروشـتیەیی بـارودۆخی ئاشتی بۆی دابین دەکرد وپێشکەوت )،بەڵام ئەم جەنگە ڕێگای لە بـەردەم ژن دا

کورت کردەوە بۆ گەیشتن بە مافەکانیان.ئەم جەنگە، گرنگترین ڕووداو بوو، بۆ چەند شوێن پەنجەی خۆی لەسەر گەلی ئەمریکی بە جێ هێشت، کاریگەریشی لەسەر هەست و سۆزی ئەو گەلە هەبوو، بۆنمونە بەدرێژایی سالانی (١٨٦٢-١٩٠٠ن) زیاتر لە (٤٨٠) رۆمان و چیرۆکی کورت لەسەر جەنگ و کاریگەرییەکانی نوسران، لە سالانی (١٨٦٢-١٩٤٨ن)دا (٥١٢) چیرۆك لەسەر جەنگی ناوخۆ بلاو کرایەوە، ئەمە جگە لەوەی بەدرێژایی لە مێژووی هونەری چیرۆك نووسی ئەمریکیدا ئەو چیرۆکانەی لای خەلك زیاتر دەخوێندرانەوە بریتی بوو لە (کوخ العم توم uncle toms cabin) و (ذهب مع الريح gone with the wind)،یەکەمیان باسی لەو مەسەلە گەورەو سەرەکیانە دەکرد کەبوونە هۆی ڕوودانی ئەو جەنگە، دووەمیاشیان باسی لە دەرئەنجامی جەنگەکە دەکرد[٣٩] ئەدەبیات و نووسینی نوسەرانی ئەمەریکا بۆ قەتماغە گرتنی برینەکان بوو نەك بۆ کولاندنەوە گەڕانەوە بۆ دووبارە کردنەوەی ئەو مێژووە مەرگەسات بارە.

## دەرئەنجام

لە ئەنجامی ئەم لێکۆڵینەوەیەدا گەیشتمە ئەم ڕاوبۆچوونانەی لای خوارەوە:

١) ویلایەتەکانی باکور خۆڕاگربوون بەرامبەر شەڕەکان و هەوڵیاندا ئیرادەی خۆیان بسەپێنن بەسەر ویلایەتەکانی باشوردا، کەهەر لەسەرەتای دامەزراندنی ویلایەتەکانی ئەمریکادا ویلایەتەکانی باکور هەولیان دەدا دەسەلاتی ناوەندی یەکێتی فیدرالی بەهێز بێت ئەوەش پاش شەڕی ناوخۆی ئەمریکا بەکردەنی بەرجەستە بوو خواستەکانیان بەدی هات.

٢) سەپاندنی هەیمەنە و بڕیاری یاسای و دەستووری ویلایەتەکانی باکوور بەسەر ویلایەتەکانی باشوردا کە گرنگترینیان ئازادکردنی کۆیلە و جاڕدانی مافەکانیان و مەرجی هاتنەوەی ویلایەتەکانی باشور بۆناو یەکێتەکانی دانان بوو بەو هەمواره دەستوریانەی کەسەرەتای جەنگ وپاش جەنگ بڕیاری لەسەر درابوو.

٣) جەنگی ناوخۆ کاریگەری نەرێنی و ئەرێنی هەبوو کەنەرێنیەکانی ئانی و کاتی بوون، بەڵام ئەرێنیەکان ستراتیژی بوون وای کرد ئەمریکا هەنگاو قەڵەمبازی گەوره بۆ زلهێزبوونی خۆی لە محافلی نێودەوڵەتیدا بنێت.

٤) شکاندنی ئەو تەلیسمە بوو کە باشووریەکان بەردەوام هەڕەشەی جیابونەوەیان دەکرد کەبەو پێوەدانگەی سیستەمی ویلایەتەکانی باشوور لە ڕووی بەرهەم و پیشە و چنینەوه جیاوازبوون، بەڵام دوای جەنگ ئاوێتە بوونێکی تەواو لە کایەکانی ژیانیاندا هاتە کایەوە.

٥) دەرئەنجامی جەنگ هاندانی ئەمریکایەکان بوو بۆبنیاتنانەوەی سەر لەنوێی ئەمریکایەکی نوێ وبەگوڕ و یەکگرتوو، هەرچەندە سزا بەسەر ویلایەتەکانی باشوردا سەپا تاکو ماوەیەکی دوورو درێژ نەیانتوانی پۆستی گرنگ لە یەکێتییە فیدراڵەکە بەدەست بهێنن، بەڵام بەتێپەڕبوونی کات ئەو کینەو دوورودونگییە ڕەویەوە ئەمریکایەکی یەك ڕیزو پتەوی لێ هاتەکایەوە.

پەراوێزەکان:

[1] ڤیان مەجید، سیستەمی حیزبی لە ئەمریکا و کاریگەری لەسەر سیستەمی حکومڕانی دەوڵەتەکە، چاپخانەی بینای، سلێمانی، ٢٠٠٨، ل١٦٤.

[2] عەدالەت عەبدوڵڵا، دەروازەیەك بۆ ناسینی ئەمریکا، گیرفان (گۆڤار ) ژ (٨)ساڵی دووەم ، کۆتایی ساڵی ٢٠٠٧، ل ٢٦.

[3] کارلتۆن هیز،التاریخ الاوروبي الحدیث ١٧٨٩-١٩١٤، ت: د. فاضل حسین،الموصل،١٩٨٠، ص ٢٣٣.

(٤)د. نبيل خليل خليل، أمريكا بين الهنود و العرب، دار الفارابي للنشر، بيروت – لبنان، ط٢، ٢٠٠٦، ص ١٢٣.

[5] فریشتە نورائی، میژووی گۆڕانکاری کۆمەلایەتی وسیاسی ئەمریکا، و: هەورامان فەریق کەریم،چاپخانەی خانی، دهۆك، ل١٢٨.

[6] کارلتۆن هیز،التاریخ الاوروبي الحدیث ١٧٨٩-١٩١٤، ت: د. فاضل حسین،الموصل،١٩٨٠، ص٢٣٤.

[7] د. ئاراس فەریق زەینەڵ، جەنگی ناوخۆی ئەمریکا ١٨٦١-١٨٦٥، کوردستان سەدەی ٢١ (گۆڤار) ژمارە (٩)،٢٠١٠، ل٣٦١.

[8] هـ. س، ل٣٦١.

[9] کارلتۆن هیز، م. س، ص ٢٣٦.

[10] عەبدوڵڵا گەرمیانی، هەڵبژاردنی ئەبراهام لەنکۆڵن و جیابوونەوە، ئەمریکاناسی (گۆڤار)، ژ (١)، هاوینی ٢٠٠٥،ل٧٢-٧٣.

(١١) د. ئاراس فەریق زەینەڵ،س. پ. ل٢٥٤ .

[12] د. عەونی عەبدولڕەحمان سەبعاوی، مێژووی ئەمریکا، و : د.محەمەد عەبدوڵڵا کاکە سور، چاپخانەی رۆژهەلات هەولێر، ٢٠١٠، ل١٧٠.

[13] د. ئاراس فەریق زەینەڵ، س. پ، ل٠ ٣٦-٣٦١.

[14] هـ. س، ل٣٦١.

[15] لوقمان خەیاڵی، پوختەیەك لە مێژووی گەورە زلهێزی جیهان، چاپخانەی وەزارەتی رۆشنبیری، سلێمانی، ٢٠٠٥، ل٤٣ – ٤٤.

[16] ا.د. عبدالعزيز سليمان نوار – د. محمود محمد جمال الدين، م. س، ص ١٠٦.

[17] د. ئاراس فەریق زەینەڵ،س. پ. ل٢٥٤ -٢٥٥.

(١٨) هـ. س.پ، ل٢٥٤.

(١٩) ا. د. عبدالعزيز سليمان نوار – د. محمود محمد جمال الدين، تاريخ الولايات المتحدة الأمريكية، دار الفكر العربي – حورس للنشر والطباعة، قاهرة – مصر، ١٩٩٩، ص١١٩. د. عەونی عەبدولڕەحمان سەبعاوی، مێژووی ئەمریکا، س. پ، ل١٧٠.

(٢٠) فرزەند شێرزاد عەبدوڵلا، ئەمریکا لە مێژەوە بۆ داهاتوو، چاپخانەی خاك، سلێمانی، ٢٠٠٥،ل٤٤.

(٢١) ا. د. عبدالعزيز سليمان نوار – د. محمود محمد جمال الدين، م. س، ص ١٢٥.

(٢٢) م. ن، ص١٢٠.

(٢٣) د.صلاح أحمد هريدي، دراسات في التاريخ الامريكي، دار الوفاء لدنيا الطباعة و لنشر، الاسكندرية، ٢٠٠٠، ص ١٨٠.

(٢٤) د. ئاراس فەریق زەینەڵ، س،پ، ل٢٥٥.

(٢٥) د. ئاراس فەریق زینەڵ، مێژووی ئەمریکا لە کۆنەوە تاکو ئەمڕۆ، چاپخانەی پەیوەند، سلێمانی، ٢٠١٠، ل ٢٥٥.

(٢٦) د. ئاراس فەریق زەینەڵ، جەنگی ناوخۆی ئەمریکا ١٨٦١–١٨٦٥، س. پ، ل. ٣٦٠–٣٦١.

(٢٧) سەلیم حوسنی و سەردار عەزیز، ڕێبازی سەرۆکەکانی ئەمریکا، و : سەردار محەمەد، چاپخانەی سەردەم سلێمانی،٢٠٠٩،ل٢٠٩.

(٢٨) فرزەند شێرکۆ عەبدوڵلا س،پ،ل ٤٥.

(٢٩) د. عەونی عەبدولڕەحمان سەبعاوی، س. پ، ل١٧٠.

(٣٠) کارلتۆن هیز، م. س، ص ٢٣٣.

(٣١) م. ن، ص ٢٣٢.

(٣٢) عەبدوڵلا گەرمیانی، س. پ، ل٥٨.

(٣٣) د. ئاراس فەریق زەینەڵ، مێژووی ئەمریکا لە کۆنەوە تاکو ئەمڕۆ، س. پ، ل ٢٦١.

(٣٤) عەبدوڵلا گەرمیانی، س. پ، ل ٥١–٥٢.

(٣٥) هـ. س، ل٥٩.

(٣٦) عەبدوڵلا گەرمیانی، س. پ، ل ٦٠.

(٣٧) د. ئاراس فەریق زینەڵ، جەنگی ناوخۆی ئەمریکا ١٨٦١–١٨٦٥، س. پ، ل٣٦١.

(٣٨) لوقمان خەیاڵی، س. پ، ل٤٣ – ٤٤.

(٣٩) د. ئاراس فەریق زەینەڵ، جەنگی ناوخۆی ئەمریکا ١٨٦١–١٨٦٥، س. پ، ل٣٦٢.

یستی سەرچاوەکان

سەرچاوەکان بەزمانی کوردی :

سەلیم حوسنی و سەردار عەزیز، ڕێبازی سەرۆکەکانی ئەمریکا، و : سەردار محەمەد، چاپخانەی سەردەم سلێمانی، ٢٠٠٩.

عەدالەت عەبدوڵلا، دەروازەیەك بۆ ناسینی ئەمریکا، گیرفان (گۆڤار ) ژ (٨)ساڵی دووەم ، کۆتایی ساڵی ٢٠٠٧.

د. عەونی عەبدولڕەحمان سەبعاوی، مێژووی ئەمریکا، و : د. محەمەد عەبدوڵلا کاکە سور، چاپخانەی ڕۆژهەلات، هەولێر، ٢٠١٠.

فریشتە نورائی، میژووی گۆڕانکاری کۆمەلایەتی وسیاسی ئەمریکا، و: هەورامان فەریق کەریم،چاپخانەی خانی، دهۆك .

ڤیان مەجید، سیستمی حزبی لە ئەمریکا و کاریگەری لەسەر سیستمی حکومڕانی دەولەتەکە، چاپخانەی بینای، سلێمانی، ٢٠٠٨.

فرزەند شێرزاد عەبدوڵلا، ئەمریکا لە مێژەوە بۆ داهاتوو، چاپخانەی خاك، سلێمانی، ٢٠٠٥.

لوقمان خەیاڵی، پوختەیەك لە مێژووی گەورە زلهێزی جیهان، چاپخانەی وزارەتی ڕۆشنبیری، سلێمانی، ٢٠٠٥.

سەرضاوةكان بةزمانى عةرةبى :

د.صلاح أحمد هريدي، دراسات في التاريخ الامريكي، دار الوفاء لدنيا الطباعة و لنشر، الاسكندرية، ٢٠٠٠.

عبدالعزيز سليمان نوار – د. محمود محمد جمال الدين، تاريخ الولايات المتحدة الآمريكية، دار الفكر العربي – حورس للنشر والطباعة، قاهرة – مصر، ١٩٩٩.

د. نبيل خليل خليل، أمريكا بين الهنود و العرب، دار الفارابي للنشر، بيروت – لبنان، ط٢، ٢٠٠٦.

كارلتۆن هيز،التاريخ الاوروبي الحديث ١٧٨٩–١٩١٤، ت: د. فاضل حسين،الموصل،١٩٨٠.

گۆڤارەکان :

دکتور ئاراس فەریق زەینەڵ، جەنگی ناوخۆی ئەمریکا ١٨٦١-١٨٦٥، کوردستان سەدەی ٢١ (گۆڤار) ژمارە (٩)،٢٠١٠.

عەبدوڵلا گەرمیانی، هەڵبژاردنی ئەبراهام لەنکۆڵن و جیابوونەوە، ئەمریکاناسی (گۆڤار)، ژ (١)، هاوینی ٢٠٠٥.